# بیرەوەری

# مێژوویەکی پڕ لە شانازی

قادر میرزا کریم

بەرگی یەکەم

**ناوی کتێب : مێژوویەکی پڕ لە شانازی**

**نووسەر: قادر میرزا کریم**

**تیراژ: ٣٠٠ دانە**

**بەرگ: ئاری میرزا**

**ئامادەو پیاچوونەوە: ماجد کریم چاوڕەش**

**ژمارەی سپاردن: (١٧٨ )**

**کۆمپیوتەرو ئۆفسێت: دیـلان**

پێشکەشە بە :

- گیانی پاك‌و بەرزەفڕی شاعیرو رۆشنبیری زێدە ئازیزم ( جەلال میرزا کەریم ) ی برام.
- ( فایزە عارف هەڵۆ )ی هاوسەرم کە هەمیشە هاوبەشی خۆشی‌و ناخۆشییەکانی ژیانم بووەو ئێستاش بێ‌کۆڵدان هاوکارمە.
- جگەرگۆشەکانم ( تریفە ، ئاری ، دیاری ، رزگار )
- هەموو ئەو دۆست‌و هاوڕێ‌و برادەرانەی کە ناویان هاتووە یان ناویانم لەیاد چووە لەگەڵ رێزمدا.

قادر میرزا کریم

## پێشەکی

چۆن کەوتمە سەر سەودای نووسینی ئەم بیرەوەرییە...
نەتەوەکەمان و بنەماڵەکەمان و خودی خۆم بەدەیان ساڵە تووشی گیروگرفت و ئەشکەنجەی ژیان هاتووین بۆ دەستەبەرکردنی ئازادی و سەربەخۆیی بۆ نەتەوەکەمان. بۆ ئەوەی ئەم یادگارییانەلە یاد نەچێت و ئەم کۆڵنەدانە نەچێتە خانەی بیرچوونەوە و فەوتان. لە ساڵی ۱۹۸٤ دا بیرم لەوە کردەوە، بە هاندانی چەند برادەرێکم وەکو بەڕێزان (حەمە سەعیدی مەلا عباس و رەحمەتی نوری ئەحمەدی تەها و شەهید جەباری حاجی رشیدی مەلا ابراهیم) و چەندین برادەری تر کە هەموو رۆژێ یەکمان دەبینی، بۆ ئەوەی لانی کەم هەریەکەمان شتێ بنوسێ و لای خۆی دای بنێت بۆ کاتی لەبار و رەخساو تابتوانین لە هەل و دەرفەتی گونجاودا بەچاپی بگەیەنین، هەرچەندە لە سەرەتای راپەڕین دا دوکانەکەم سووتا زۆربەی شتەکانم سووتا، یەکێک لەوانە بەشێکی گرنگی بیرەوەرییەکانم بوو. بەڵام دوای ئەو شنەبا ئازادییەی کە باشووری کوردستانی گرتەوە، کەوتمە کۆکردنەوە و پیاچوونەوە و دارشتنەوەی نووسینەکە و بینینی زۆر برادەر کە ئاگاداری ئەم رووداوانەن، توانیم ئەم نووسراوە بخەمە گەنجینەی کتێبخانەی کوردییەوە تا چاوی خوێنەری کوردی پێ رۆشن بێ ئاگایان لە رۆژانی زوو بێ و مێژووی نەتەوەکەمان فەراموش نەکەن. پاشان زۆر داوای لێبوردن لەو کەسانە دەکەم کە ناویانم لێرەدا لە یادچووە، هەروەها سەری رێز و نەوازشیش بۆ هەموو ئەو دۆست و هاوڕێیانە نەوی دەکەم کە گیانیان بەخشیوە بەم وڵاتە. دووبارە داوای لێبوردن لەو هەڵانە دەکەم ئەگەر هاتبێ چونکە لەسەر بیرەوەری خۆم نووسیومە. دواجاریش سوپاس بۆ بەڕێز کاک (ماجد کریم چاوڕەش) کە هەستا بە پیاچوونەوە و نووسینەوەی ئەو بیرەوەرییانە.

قادر میرزا کەریم

۱ / ۱۰ / ۲۰۰۰

سلێمانی

## سەرەتای تێکۆشان

پێش هەموو شتێك ئەمەوێ بڵێم من لە بنەماڵەیەکی نیشتمان پەروەرو تێکۆشەر هاتوومەتە دنیاوە، و بنەماڵەکەمان ئەگەڕێتەوە بۆ بابانییەکان کە دیارە چ رۆڵێکی تایبەتیان هەبووە لە تێکۆشانی نەتەوەیی و پێش خستنی کوردستان و دامەزراندنی چەندەها میرنشینی کوردیدا. باوکم هەر لە منداڵییەوە بیروباوەڕێکی پێشکەوتوخوازانەی هەبووە، کە لە کۆڕو کۆمەڵەکانی سەردەمی خۆیدا جێ دەستی دیاربووە. لە چلەکانیش دا کە بیروباوەڕی نیشتمانی و چینایەتی و بیری مارکسی بەجۆرێکی بەربڵاو پەرەی سەندو کاکم (غەفوری میرزا کەریم) و بنەماڵەکەمان بوو بوونە پێشەنگی ئەو تێکۆشانە، کە رۆڵێکی سەرەکی هەبووە لە دروستکردن و پەرەسەندنی بنکەی رێك و حزبی شیوعی دا کە ئەوکاتە بووە جەمسەری یەکخستنی تێکۆشانی میللەتەکەمان کە ئەمە هەموو خزم و ناسیاو دۆستانی ئێمەی بەخۆیەوە گرێ دابوو، منیش ئەوسا لە تەمەنێکی بچووکدا بووم کەوتمە بەر ئەو گرێدانە. کاکم هەرچییەکی بهێنایەتەوە ماڵەوە لە کتێب و نووسراوو بەیان هەر هەموویم ئەخوێندەوە، بێجگە لەوەی لە پلەی خوێندنی سەرەتاییمدا لە قوتابخانەی ئەیوبییە مامۆستا هادی محمدو شێخ محمدو بهجت کابان مامۆستامان بوون، هەمیشە باسی بیروباوەڕی کوردایەتییان بۆ ئەکردین و ئێمەش بە رێك و پێکی گوێمان لێ ئەگرتن. هەر لەو کاتەدا فەراشێکمان هەبوو کاك (حەمە سعید)ی ناوبوو، پیاوێکی باش و نیشتمان پەروەر بووئێمەی خۆش ئەویست، هەموو ژمارەکانی رۆژنامەی (نیشتمان)ی هەبوو کە لە ئێران دەرئەچوو، لەژێر پلیکانەکانی قوتابخانەدا کۆی کردبوونەوەو ئەی پاراستن. زۆربەی رۆژ دوای بەربوونی قوتابیان ئێمە چەند قوتابییەك ئەماینەوە، ئەچوو بۆی دەرئەهێناین بە کۆمەڵ ئەمان خوێندەوە کە من و طە بابان و حمە امینی ئامۆزای و مەحمود هەژارو جەلالی حاجی شەفیق و حەمە کاکە و جمال حکیم و هەندێ برادەری کەش بوو کە هەموو کات بە یەکیشەوە دائەنیشتین. من لەوانی کە زیاتر شتم

ئەزانی، چونکە لە ماڵیشەوە ئەو شتانەم ئەخوێندەوەو سەرم لەشتێ دەرئەچوو. هەرچەندە لەو سەردەمەدا هەرهەموو لە قوتابخانە یەك بۆچوونمان هەبوو، بەڵام پاش ساڵێك بووینە دوو گروپ کە ئێمە (تحرر) بووین و جمال و طە و جەلال و محمود هەژاریش بیری نەتەوەییان هەڵبژارد، کە هەموو جارێك ململانێیەکی زۆر لە بەینماندا رووی ئەدا، بە تایبەتی رۆژی داواکردنی لێبوردن، لەئەفسەرە کوردەکان و هێنانەوەی تەرمەکانیان، کە کاك طە بابان بووە خەطیبی خۆپیشاندانەکان و خەڵکەکەی ئەوروژاند و هەڵبەستی نیشتمانی بۆ ئەخوێندنەوە، مەحمود هەژاریش دەورێکی گرنگی ئەبینی. ئەوە (جەمال حەکیم)یش هەموو بەیانییەك لە قوتابخانە هەڵبەستی نیشتمانی ئەخوێندەوەوئەبووە چەپلە لێدان بۆی. ئەمانە و زۆر شتی تر کە لەناخماندا بۆی تێئەکۆشاین. کەوا بزانم هیچ کامێکمان پەیوەندییەکی راستەوخۆمان لەگەڵ لایەنێکدا نەبوو تەنها سۆزو خۆشەویستی نەبێت بەرامبەر ئەولایەنەی کە خۆشمان ئەویست.

یەکێ لەو شتە گرنگانەی کە کاری تێکردم هەڵبژاردنی نوێنەرانی پەرلەمان بوو کە ئەوسا بە دوو پلە هەڵبژاردن دەستی پێ ئەکرد، پێشەکی ئەبوایە نوێنەری (ثانوي) هەڵبژێردرێت. جا ئەوان نوێنەری پەرلەمانیان هەڵئەبژارد. حزبی شیوعی و پارتی باش خۆیان ئامادەکردبوو بۆ ئەم مەبەستە، لەوانەش مامۆستا نوری بابا علی و شێخ قادری شێخ طە و کەریم رشید. ناسك و عەزیزی حەمە رەش و باوکم و نامق ئاغای سەرشەقامی و حەمەی بەکرو سەید کەریم خان و زۆری کە هەڵبژێردراوی (ثانوی) بوون رژێمیش هەندێ کەسی دەست نیشان کردبوو. بەڵام هەموو ئەوانەی حزب و پارتی دەرچوون و بێ کێشە نوێنەرەکانی خۆیان هەڵبژارد کە نوێنەری سلێمانی شەریف الشێخ بوو لە بەغداوە هاتبووە سلێمانی ، لەگەڵ محمودی فقێ محمدی هەمەوەند کە خۆیان پاڵاوتبوو بۆپەرلەمان ماڵی ئێمەش جێگەی یەکتر بینین و گفتوگۆکردن و بنکەی سەرکی بوو بۆ هەموو جموجۆڵێکی

هەڵبژاردن. (شەریف الشیخ)یش لەماڵی ئێمە دائەنیشت و لەگەڵ کاکمدا دۆستێکی نزیك بوو بێجگە لە ئیشی حزبایەتی هەروەها کاك محمودیش هەر خزم و دۆستی نزیکی باوکم بوو کاتێ ڕژێم زانی ئیشەکەی بەم جۆرە ئەڕوات و نوێنەرەکانی دەرناچێت کەوتە گرتن و راونانی هەڵبژاردە ثانویەکان و زۆربەیان گیران و تووشی ئازارو کێشە بوون یەکێك لەوانە حەمەی بەکر بوو چاخانەکەشی داگیرکرا کە ناوی گازینۆی ئاشتی بوو لەژێر بیناکەی تۆفیق قەزاز داو بوبوە جێگەی کۆبوونەوەو دانیشتنی برادەران. معاونی پۆلیسیش لەبەردەمی هەموو پۆلیسەکاندا بەدەنگی بەرز هاواری کردبوو ووتبووی من هەموو کاتێ ئێرە ئەبینم پڕە لە خەڵك و خەریکی تاوڵە دۆمینەن، بەڵام کاتی خۆپیشاندان شاگردەکەشی لێنامێنێ و هەموو دەرچن بۆ خۆپیشاندان و خاوەنەکەشی پێش هەموویان ئەکەوێت. هەرلەبەر ئەمەبوو هەموو ڕق و کینەی خۆیان بەسەر ئەم گازینۆیەدا ڕشت و دایان خست لەگەڵ ئەوەشدا تەنگ و چەڵەمەیەکی ئەوتۆیان دروست کرد حزب نەیئەتاونی خۆی لەبەری دا رابگرێت لەبەر ئەوە بڕیاریان دا دژی هەڵبژاردن بوەستن، بۆ ئەم مەبەستەش چەند خۆپیشاندانێك کرا بەڵام هیچ کەڵکی نەبوو نوێنەرەکانی ڕژێم بە تەزکیە دەرچوون. لە سلێمانی شریف الشیخ گیراو بە بەندێتی رەوانەی بەغداد کرایەوەو کاك محمودیش رایکردە دێکەی خۆی (دەرگەزێن و مۆرتکە) لە ناوچەی هەمەوەندییەکان و دەستی ڕژێمی نەدەگەیشتێ.

ئەو کارانەی لە ماڵی ئێمە جێبەجێ دەکرا من لە هەمووی ئاگاداربووم و بە ووردی گوێم لە هەموو وتوێژێکیان ئەگرت و هەندێ جاریش ئیشیان ئەدا بەسەرمداو بەگورجی رام ئەپەڕاند، ئەو کاتە ئۆتۆمبێل نەبوو ئەبوایە هەر هەموویم بە ڕاکردن و پەلە بهێنایەتە ئەنجام.

هەر لەم سەردەمەدا بوو باخی فرجی حەمە مراد بوبووە جێگەی دانیشتن و یەکتربینینی هەموو برادەران برادەرانی هەموو لایەکانی لێدائەنیشت بێجگە لە خەڵکێکی بێلایەنی سلێمانی بەتایبەتی گەڕەکی دەرگەزێن و سەرشەقام کە لەوێوە نزیك بوون.

خەڵك زیاتر رووی تێئەکرد لەبەرئەوەی گازینۆکەی حەمەی بەکر داخرابوو، باخی حەمە فرج خاوەنەکەی فرجی حەمە مراد بووگەورەترین باخ بوو کەوتبووە خوار گەڕەکی دەرگەزێنەوە نزیك گردی سەیوان بە دامێنی مزگەوتی تەکیەوە، کە لای خوارووی ئەیدا لە باخی شێخ لەتیف و مزگەوتەکەی کە ئەمە هەمووی رێكوپێك کرابوو بە چەند شوێنێکی گەورەی دانیشتن و کە پڕ بوو لە داری هەمە جۆرە میوە بێجگە لە گوڵ و باخەکەی و جۆگەلەی و ئاوی پاك و سارد (ئاوەکەی لە ماڵی ئەزمی بەگەوە هاتبوو کە پێییان ئەووت کارێزی دایکی پاشا) هەر لە ئێوارەوە خەڵکی تێئەڕژا لای سەرەوەی نزیك بەرد رێژەکەی مزگەوتەکە پیاوانی گەڕەك و خەڵکی بێلایەن جێگەی خۆیان ئەگرت و دائەنیشتن لای خوارەوە زۆربەی پیاوانی سیاسی و قوتابیان و لاوان لێی گردئەبوونەوە. چاخانەکە شەربەت و چا و ماستاوی ئەفرۆشت، سەدان کورسی تەختە بە کۆمەڵ کۆمەڵ دانرابوو بێجگە لە راخەری سەر زەوی کە خەڵکی خۆی هەبوو لەسەری دائەنیشتن. محمودی مچە حاجیش (خولەی پاقلە) بە سەدان قاپی فافۆنی هەبوو پاقلەی تیا ئەفرۆشت، خۆی و شاگردەکانی بۆ دانیشتوانیان ئەبرد. لەدوای خواردنی بۆ توورە بوونی محمود قاپەکانیان بەملاولادا فڕی ئەدایە باخەکەوە بۆ شەو کۆیان ئەکردەوە. کاك محمود پیاوێکی زۆر باش و تحرر بوو، ئەگەر خۆی پاقلەکەی بهێنایە ئەبوایە لای هەموو کۆمەڵێ دابنیشێ و بکەوێتە وتووێژی سیاسی لەگەڵ هەر هەموویانداو زۆریشی ئەزانی و توندوتیژیش بوو، لەسەر یەك خەتی راست دژی برادەرانی پارتی بوو. لەگەڵ ئەوەشدا بە قسەکانی دڵخۆش ئەبوون و هەمووکات ئەیان دواندو سەریان ئەکردە سەری و کێشەیان بۆ دروست کرد بەمەرجێ بەرامبەر هەموویان ئەوەستا. لەساڵانی دووایدا کە رووی سیاسەت شوێنراو بوبووە خۆخۆیی و جێگەی هەلپەرستان چەند جارێك لێدانی خواردو سووکایەتی پێکرا لەسەر وتووێژی رووبەڕوو لەگەڵ برادەرانی پارتیدا ...هەموو ئێوایەرەك ئەبووە دەنگەدەنگ و هەڵچوون و داچوون و بەیەکا هاتن

لەسەر ئەم وتووێژانە. سەرانی پارتی و تحرر بەرامبەر یەك دائەنیشتن و هەموو لەسەر ئەوە ئەدوان کورد نەتەوەیە یان نا؟ پارتییەکان سوور بون لەسەر ئەوەی نەتەوەیە، تحررەکانیش ئەیانووت هێشتا بنەمای نەتەوەی تەواو نەکردوە بە پێی بۆچوونی ستالین. ئێوارەیەکیان لەوپەڕی توندوتیژی و هەڵچوون دا لەنێوان مامۆستای پارتییەکان کاك حلمی علی شریف و یەك دوانێکی تحرر لە ناویاندا کاك نوری عزیز قوتابی کۆلێجی حقوق لە بەغداوە هاتبووەوە وتووێژ پەر دەسێنێ و ئەکەونە هێرش بردنە سەریەك بۆ چەسپاندنی بیروباوەڕەکانیان، لەوکاتەدا (کاك احمدی) کروێ لەوناوە داسێکی بەدەستەوە ئەبێت بۆ گیا رنین بۆ مەڕەکانی و ئەمە پیشەی رۆژانەی بوو کەرێکیشی پێبوو لەوێ باری دەکردو دوو شەڵتەی بەسەروەبوو، بەپێی ئیشەکەی بەناو هەموو کۆمەڵەکاندا ئەگەڕاو وچانێکی ئەگرت و هەندێ قسەشی ئەکرد. بەڵام ئەم جارەیان لەبەردەم کۆمەڵەکەی کاك حلمی‌دا ئەوەستێت و گوێیان لێئەگرێت و پەست ئەبێت و ناچێت بەلای ئیشەکەیدا کە ئەبینێ‌ئەمە چەند ئێوارەیەکە حلمی کاك نوری پێ قانع ناکرێت و بەرامبەرەکەی هیچ بایەخێك بۆ کورد دانانێت و تەنانەت ئەڵێن لەم کاتەدا نابێ باسی کێشەی کورد بکرێت. کاك احمد زۆر تووڕە ئەبێت و لەکاك نوری ئەچێتە پێشەوەو داسەکە ئەخاتە سەر ملی و ئەڵێ بڵێ کورد نەتەوە نییە تا سەرت لە لەشت جیابکەمەوە. نوری کوڕێکی زۆر موحتەرەم و لەسەر خۆ بوو لە بنەماڵەیەکی باشی رۆشنبیر بوو شتی وای نەدیبوو، ئەبینێ احمد داسەکەی بە توندی لەسەر ملی داناوەلە دڵی خۆیدا ئەڵێت تووشی گون رەشی خۆم بووم و ئەبێ خۆم رزگار بکەم لەبەر ئەوە بە شێنەیی و بەدەنگی بەرز ئەڵێت بابە وەڵا کورد ئوممەیەو ئوممەش بووە داسەکەشت لابەو بڕۆ بڵاوی بکەرەوە. جا احمد بە شانازییەوە رووئەکاتە حلمی ئەڵێت : مامۆستا مناقشە وائەبێت، ئاگام لێیە هەموو ئێوارەیەك خۆت خەریك ئەکەیت بەم کێشەیەوە کە بۆی بسەلمێنیت کورد ئوممەیە یان نا؟وا من بە چەند دەقیقەیەك بەهۆی داسەکەمەوە چەسپاندم کورد ئوممەیە، ئیتر ئەبێ

بە پێکەنین و احمدیش بەڕێ ئەکەن. لەم دانیشتنەدا عمر سعیدو جمال حکیم و حسە رەش لەوێ ئەبن ئەو دووانەی کەیان پارتی ئەبن و عمریش تحرر. لەو رۆژەوە واز ئەهێنێت و بە رێکخەرەکەی کە عمر علی امین ئەبێت لەگەڵ رفیق چالاکدا ئەڵێت من دوای ئەو حزبە ئەکەوم کە ئەڵێت کورد ئوممەیە.

ئەو باخەو چاخانەکەی و پاقلەکەی کاك محمود تا یەك دوو ساڵ خایاندی ، دوایی شەقامی سەیوان کردی بە دوو بەشەوەو بەشی خوارووی کرایە قوتابخانەو خەستەخانە. ئەو جێگەیەش دەوری تەواو بوو، بەڵام هەمیشە لە یادی خەڵکیدا ئەمێنێتەوە کە باشترین رۆڵی هەبوو بۆ نیشتمان پەروەران و لایەنگرانیان و یەکتر بینینیان و لەیەکتر گەیشتنیان.

رژێم بۆ دەرچوونی لە دۆڕاندنی هەڵبژاردن و دانانی بەربەستێك بۆ نیشتمان پەروەران هیچی لەبەر دەست دا نەبوو تەنها دانانی ئەحکامی عورفی نەبێت بەناوی پاراستنی پشتی سوپاکەیەوە لە فەلەستین، ئەمەش بووە گەورەترین کۆسپ لەبەردەم جووڵانەوەی نیشتمانیداو بووە هۆی گرتن و راونان و پەلاماردانی هاووڵاتیان و چاوشکاندنیان، کە حزبیش بەرامبەری کەوتە هەڵمەت و خۆپیشاندان و بەیان دەرکردن بە چڕی، کە دیسان ئەمیش هەر بووە کێشەیەکی گەورە لەبەردەم حزب دا، و هێزەکان و رێك وپێکییەکانی پەرش و بڵاوە پێکراو هەڵمەتێکی کوشندەی وای کرایە سەر کە هەر فریای خۆپاراستن کەوت. جا بۆ پاراستنی کتێب و بڵاوکراوەکان بڕیاریان دا چیمان هەیە بیبەینەماڵی (محمودی خاڵە عبدالله)م کە ئەوانیش هەر لە سەرشەقام بوون. لەوێ کتێبخانەیەکی خنجیلانەمان دامەزراندو منیان کردە بەڕێوەبەری و بڕیاردرا نابێت کەس بزانێت تەنها خۆم نەبم، هەرچی شتێ داوا ئەکرا ئەگەیشتە دەست من و لەپاش رۆژێك ئەچووم لەوێ بۆم ئەهێنان. بەهۆی ئەو ئیشەوە زۆری کاتم لەوێ ئەبردە سەرو بەدری خانی خێزانی کاك محمود وەکو کوڕی خۆی خزمەتی ئەکردم و ئاگای لێم ئەبوو کە ئەویش سەرەڕای خزمایەتی دۆستێکی تەواوی حزب بوو، بەتایبەتیش عمری برای یەکێك بوو

لە تێکۆشەرەکانی حزب. مالّی کاك محمود هەرچەندە هەموو براکانی هاتوچۆیان ئەکردو لەویٚ ئەمانەوەو هەندێکیان سەر بە برادەرانی پارتی بوون، وەکو کاك رحیمو کاك عبدالرحمان، بەڵام ئیشوکاری ئێمەیان نەئەزانی، چونکە ژوورێکی پشتەوەمان (گەنجینە) کردبوو بە کتێبخانە. هەر لەو سەردەمەدا هەرچی پەیوەندی بەینی برادەرانی لیژنەی ناوچەو سەرکردایەتی بوو هەمووی بەمن سپێردرابوو، نامەم لە کاکمەوە ئەگواستەوە بۆ هاوڕێیان لە مالّی شێخ علی بەرزنجی چونکە کۆبوونەوەکانیان زۆربەی لەویٚ بوو، بۆ مزگەوتی بابەعلیو قەزازەکان کە کاك بەهادین نوری لەویٚ بوو، بۆ مالّی عمر علی امین (عمرە سور) کە ئیشوکاری قوتابیانی ئەبرد بەڕێوە، بۆ مالّێکی کە حمید عثمان لەویٚ ئەبینرا، زۆر جاریش بۆ مالّی فتاح رشید (فتاح بێسارانی) کە لەوێش هاوڕێیانی لێبوون. ئەمە بێجگە لە پەیوەندی بە مامۆستایان عبدالله خالد (شێخ عبدالله)و عمر علی امین کە ئەبوایە رۆژە نا رۆژێك بچوومایە بۆلایان بەپێی کاتی دانراو. لەگەڵ مندا برادەرێکی تر هەبوو هەر لە تەمەنی خۆم یا بچوکتر بوو ناوی قادر فتاحو شاگردی فتاح بێسارانی بوو، بە هەردووکمان ئەم کارانەمان هەڵئەسوڕاند. زۆر کەڕەتیش بۆ ئەوەی بچینە مالّەکان بەیانیان زوو لە حەوشەی خەستەخانەی سەرەوە یەکتریمان ئەبینی لەبەرئەوەی لە مالّی ئەوانەوە نزیك بوو. لەگەڵ ئەوەشدا بووبوینە هاوڕێیەکی گیانیبەگیانی یەکتر، بەڕاستی تا بلّێیت قادر کوڕێکی باشو ئازاو لێهاتووبو، زۆر وردو لەسەرخۆ بوو، کەس بە ئیشەکانی نەئەزانی، کەڕەتی وا هەبوو لەبازاڕ تووشم ئەبوو لەسەرخۆ بە وردی بانگی ئەکردمو راسپاردەکەی پێئەگەیاندم. بۆ ئەوەی بزانن برادەرەکانم ئەیان ووت کوڕە چاوشینەکەی خزمت بانگت ئەکات، ئیتر بۆ ئەوەی هەڵەیەك بکات یا لای ئەوان دەرکەوێت هەموو شتێکمان جێبەجێئەکرد. سەردەمێکی زۆرمان بەم چەشنە بەسەربرد پاشان لە یەکتر دابڕاینو کارمان لەگەڵ یەکتر نەما، ئەوەش پێویستی حزبی ئەوەی ئەخواستو رێكو پێکییەکان بە چەشنێکی کە گۆڕابوون. من تەنها

پەیوەندیم بە کاك عمری علی امین (عمرە سور)ەوە ما، کە هەموو ڕۆژێك سەری ماڵەکەیانم ئەدا لە گەڕەکی مەڵکەندی لە کۆڵانەکانی پیرمەسور نزیك ماڵی حەمەی ئەورەحمان ئاغا، لەوکاتەشدا ئەویش پەیوەندی بە کاکمەوە هەبوو، ئەوەندە ئەچووم بۆ ماڵەکەیان گەڕەکەکە هەموویان ئاگاداری ئەم هاتوچۆیە بوبوونو منیان زۆر باش ئەناسی، و یەك دوویەکیان سەرشەقامی بوون، دایکی عمریش کچی دراوسێییەکمان بوو هەندێکیش بە خزمایەتی ئەمان گەیشتیو باشترین بنەماڵەی سەرشەقام بوون، ماڵی (حەمە علی خەیران)یان پێ ئەووتن.

لەم کارەمدا چەند مانگێکی کە مامەوە، هەموو ڕۆژێکیش سەرم لە ماڵی کاك محمود ئەداو ئەوکتێبانەی کە داواکرابوو لەگەڵ خۆمدا ئەم هێنایەوە ماڵەوەو دابەشمان ئەکرد. بێجگە لەمە زۆربەی کاتیش لەوێ خۆم ئەکەوتمە خوێندنەوەو هەرچەندە عەرەبیش باش تێنەگەیشتم، بەڵام چێژم لێوەرئەگرتو شتێکی کەم حاڵی ئەبووم، تا ئەم کاتەش تەنها پەیوەندیم لەگەڵ ئەو ئیشەدا هەبوو لەوە زیاتر هیچ ئیشێکی ترم نەئەکردو داوای هیچیان لێ نەئەکردم، گوایە بڕیار بوو هەر ئەوە بەکەم.

هەر لەو سەردەمەدا بێجگە لە بینینی کاك عمر، کاکم نامەیەکی پێچراوەی دامێ بیبەم بۆ مزگەوتی نزیك باخی شێخ لطیف، لەوێ پیاوێك چاوەڕێم ئەکات جلی ئەفەندی لەبەردایەو لەبەردەرگای ئاودەستی دووەمدا ئەوەستێ، کە بینیم ئەیناسم، ئەو بانگت ئەکاتو شتەکانی بدەرێو کاتی لەگەڵدا دابنێ، یا ماڵەکەیان بزانە، هەموو ڕۆژێك بچم بۆ بینینیو چی هەبوو بیهێنمەوە بۆ کاکم. لە کاتی دیاریکراودا چووم بۆ مزگەوتەکە، لەوجێگەیەدا سەید طە (طەی شیخ جەلال) وەستابوو. لەیەکەم چاوپێکەوتندا ناسیم، وەختی خۆی گەورەترین خەطیبی حزب بوو لە خۆپیشاندانەکاندا جەماهیری میللەتی بە ووتە شۆڕشگێڕییەکانی ئەهەژاندو بوبووە سەرمەشقی هاندانی خەڵکی بۆ تێکۆشان. سڵاوم لێکردو شتەکانم بەدەستی گەیاندو کاتم لەگەڵ

دانا کە هەموو رۆژێك سەردانی ماڵیان بکەم و ئاڵوگۆڕی نامە بکەین. جا بەبۆچوونی ئەوسام ئەم ئیشەو ئەم بینینەم زۆر لا خۆش بوو. کە بتوانم یەکێکی وەکو سەید طه ببینم لەگەڵیدا بکەومە ئیشەوە، هەرئەوتێکۆشەرە بوو هەلومەرجی خراپی وڵات و کەمتەرخەمی برادەرەکانی خستیانە خانەی بیرچوونەوەو وەلانانەوە. ئەو تێکۆشەرە بە کوشندەترین نەخۆشی مێشك گیانی پاکی سپارد بێ ئەوەی یەکێ هەبێ ناوی بێنێ و هەڵیسەنگێنێ.

برادەرەکانم لە قوتابخانەو هەندێکی کەش لە دەرەوە بەتایبەتی عبداللەی نوری ئەفەندی لەگەڵ ئەوەی برادەری خۆشەویستم بوون و کوڕی باش و نیشتمان پەروەربوون، بەڵام هیچ لەم ئیشەی منیان نەئەزانی و پێم رانەگەیاندبوون، هەرچەندە زۆر لێم کەوتبوونە گومانەوە، لەبەر ئەوەی لەپڕ لێیان جیائەبوومەوە، یا بۆ زۆر جێگا لەگەڵیان نەئەچووم، یا کەڕەتی وا هەبوو یەك دوو رۆژ نەیان ئەبینیم. جارێك پێم وتن من ئەرۆم ئیشم هەیەو دێمەوە بۆلاتان، هەرهەموو دوام کەوتن وتیان بۆ کوێ ئەچیت ئێمەش دێین و بەجێت ناهێڵین، زۆریان لێکردم، کاتم نەمابوو برادەران چاوەڕێیان ئەکردم، گیرفانم پڕ بوو لە نامەی پێچراوە بەهیچ جۆرێك رێگەی رۆیشتنیان نەئەدام تا زۆر تووڕە بووم و کەوتمە هێرش بردنە سەریان، هەر وازیان لێ نەهێنام، بەتایبەتی عبداللە نوری ئەفەندی کە تێم ئاڵابوو نەیئەهێشت بڕۆم، لەبەرئەوە منیش بەباشم زانی کە هیچ ترسیشی نەبوو، نامەکانم پیشاندان و دانم بە هەموو شتێك دا نا بەرامبەریان وتم من ئەمە ئیشمەو وازم لێبێنن، جا زۆر پەشیمان بوونەوەو پێیان ڕاگەیاندم کە ئەوانیش ئامادەن یارمەتیم بدەن و نەختێ گلەییان کرد کە بۆ لێم شاردوونەتەوە. منیش وتم ئیشی حزب و نهێنی وائەخوازێ کە نابێ نزیکترین برادەریش بە ئیشت بزانێ دوایی رێگەیان دام و کارەکانم راپەڕاند، هەر لەو رۆژەوە ئەو برادەرانە بوونە دۆستێکی تەواوم و پشتگیری باشیان لێئەکردم.

گرتن و راونان و ئازاردانی هاوڕێیان لە پەرەسەندن دابوو، زۆربەری

برادەرانمان گیران یا رایان کرد، ئیشوکار تێك چوو، بینینی یەکتری کەم بۆوە، دادگای عورفی زۆر بە شێتانە حوکمی برادەرانی ئەدا. حزب بەرەورووی تەنگو چەڵەمەیەکی کوشندە ئەبووەوە، لەوکاتەدا گەورەترین کارەسات رووی تێکردین کە ئەویش لە سێدارەدانی هاورێیان ( فهدو صارم)و حازم بوو، ئەمە برادەرانی خستە گیژاوێکی پڕ مەترسییەوەو رێكوپێکی جێگەی خۆی نەگرتەوە، هەر لەم کاتەدا برادەرێك گیرا یا بڵێین خۆیدا بەدەستەوەو بەشێکی زۆری هاورێیانی دا بە دەستەوە منیش یەکێك بووم لە گیراوەکان.

## گیران و رەوانەکرنم بۆ بەغداد

بەهۆی خۆبەدەستەوەدانی ئەو برادەرەمانەوەو گرتنی هەندێ کەسیترو ناوبردنیانەوە رێكو پێکییەکانی حزب لە سلێمانی (٢٠-٣٠) برادەرێ گیرا لە شیوعیو پارتیو دۆستانیان، شەو ئێمە لەماڵەوە بووین ئاگامان لە هیچ نەبوو، نیوەشەو لە دەرگادراو کوڵانو سەربان گیرا. هاتنەژوورەوەو داوای کاکمیان کرد، باوکم لە ماڵ نەبوو، مامە مستەفام لەوێ بوو، وتی غەفور لێرە نییە بۆچیتانە؟ یەکێ هاتە بەردەمی وتی با لێرەیە هەر ئەمانەوێو قادری برایشمان ئەوێو حەمەی کوڕیشت داواکراوە، ئەمانە شیوعینو قسەیان لەسەر کراوە. بۆیە مامم وتی ئێوە هەموو ئەناسم بەڵام بزانم ئەم دەمو چاو هەڵبەستراوە کێیە؟ وتیان ئەمە ئیشی تۆ نییە بڕۆ بەولاوە. نەختێ رقیان هەڵسان ئەویش پڕیدایە جامانەکەی لەسەری راکێشاو شەقازلەیەکی لێداو وتی کەم لەم ماڵە نانت خواردووە؟ کەم خزمەتمان کردی؟ داوەشین نییە بۆ تۆ ئەمانەت داوە بە دەمەوە. پۆلیسەکان پەلاماری مامیان دا بەڵام ئەفسەرەکەیان کە دۆستی بوو نەیهێشت لێی بدەن. بەوە وازیان هێنا کە کاکم لەماڵەوە نییە تەنها منیان برد، لەمەش مامم نەیهێشتو رێگەی لێگرتنو وتی قادر منداڵەو نابێت بیگرن. بووە هەرا دیسان هەڵمەتی بردەوە بۆ جامانە لە ملەکەو کەوتەوە سووکایەتی پێکردنی. نەیانهێشت کێشەکە گەورەتر بێت،

وتیان بەیانی قادر ئەنێرینەوە بەڵام ئەبێت غفورو حەمەی کوڕت بێن بۆ سەرا مامم هیچی بۆ نەمایەوە وتی قادر کوڕم بڕۆ لەگەڵیاندا قەیناکە بەڵام ئاگات لەخۆت بێت و کوڕێکی ئازابە. ئەو کاتە کە هاتن کاکم لە ماڵ بوو، لەودیو ماڵی خۆمانەوە خانوویەکی بچوکمان هەبوو دابوومان بەکرێ بە ناسیاوێکی خۆمان کە ماڵێکی زۆر باش بوون و ئێمەش بەپێی پێویست خزمەتمان ئەکردن. پیاوەکەیان کاك حسن (حسن حەماڵ) وکبرای ژنی وەکو یەکێ لە خۆمان سەیرمان ئەکرد، کونێکمان کردبووە دیوارەکەی بەینمان و ئەچووە سەر ژوورێکی ئەوان لەم دیو لەودیویشەوە دۆلابێکی گەورەمان لە دیوارەکە چەسپ کردبوو. دەرگای دۆلابەکە لە هەردوولاوە لە ناوەوە دائەخراو پڕ لە جل و بەرگ بوو. هەر شتێ رووی بدایە کاکم لە دۆلابەکەوە ئەچووە ئەودیو و دەرگاکەی دائەخست ئیتر کەس نەی ئەزانی دۆلابەکە بۆ ئەم مەبەستە بەکارئەهێنرێ، تەنها ئێمە ئەمەمان ئەزانی و هەرچییەك بوایە دەرمان نەئەبڕی. ئەوشەوە کە لە دەرگاکە درا کاکم لای ئێمە لە جێگەکەی خۆیدا بوو هەستا چووە ئەودیو. بەڵام کە پۆلیسەکان هاتن نەیان وت ئەوجێگەیە چییەو هەر نەشیان زانی. منیش لەسەرخۆ دوای پۆلیسەکان کەوتم بۆ دەرەوە بردمیانە توقیف خانەی سەرا کە جمەی ئەهات لە برادەرانی گیراو لەشیوعی و پارتی وەکو (محمودی فەقێ محمدی هەمەوەندی و حلمی علی شریف و غفوری رشید داراو عمر علی ئەفەندی (عمرە سور) و رؤوف معروف و حەمەی مامم و شێخ سەعید بەرزنجی و جمال فایەق و قادری رشید ناسك و حەمە سعید دەروێش و عەزەی ماڵەو قادری حاجی حسێن و کمال محمودو سعید کریم خان و کریم زەند) و زۆر برادەرانی کە ئەو شەوە هەر بیرم لەوە ئەکردەوە کە کاکم نەگیراو ماڵەوەش نەگەڕان، بیریشم لە قوتابخانە ئەکردەوە کە دە رۆژ بوو چووبومە قوتابخانەی ناوەندی سلێمانی و دەستمان نەکردبوو بە خوێندنی تەواوەتی و قوتابیان یەکترمان باش نەئەناسی، کە تەنها من لەسەر کورسییەك لەگەڵ مجیدی برای کریمی سۆفی دا دائەنیشتم کە ئەمناسی لەگەڵ یەك دوو قوتابی کەدا

بۆ بەیانی سواری چەند ئۆتۆمبێلێکیان کردین بە دەست بەستراوی بەرەو کەرکوك و شەوێك لەوێ ماینەوەو بەرەو بەغدایان بردین، ئەو شەوە لە شەمەندەفەردا رۆژمان کردەوەو پۆلیسەکان نەیانهێشت کەس نزیکمان کەوێتەوەو هەموو فارغۆنەکە بۆ ئێمە تەرخان کرابوو. لە دابەزین دا لە باب المعظم دوودوو بە دەست بەستراوی ریزیان کردین و چاوەڕێی ئۆتۆمبێل بوون بۆمان بێت لە تحقیقاتەوە، جا ئەو دەوروبەرە چەند کۆلێجێکی لێبوو زۆر لە قوتابییەکانی ئەهاتن بۆ سەیرمان و هەندێکیان ئەیانویست لێمان نزیك ببنەوە پۆلیسەکان رێگەیان پێ نەئەدان. لەناو هەمواندا تەنها غفوری رشید دارا قوتابی کۆلێجی ئەو ناوە بوو (دار المعلمین العالي)، لەبەرئەوە چاویلکەیەکی لەچاو کردبوو لەگەڵ لەچکێکی گەورە کە هەموو سەرو دەم وچاوی داپۆشیبوو، بۆ ئەوەی قوتابیان نەیناسنەوە، کە بەراستی شەرمی ئەکرد بەو جۆرە بیبینن، ئیتر نەمانزانی ئەمە لە چییەوە هاتووە هەرچەندە نەختێ بەسەریدا هاتین بەڵام بێ کەڵك بوو. ئۆتۆمبێلی تحقیقات هات و هەموومانیان سەرخست بەرەو تحقیقاتی بردین کەلە نزیك رووباری دیجلەوە بوو بەشێکی زۆری بەسەر ئاوەکەدا ئەیڕوانی، بەڵام دەرگا سەرەکییەکەی لە کۆڵانی بازاڕی (سوق البنات) یا شارع النهر دا بوو. ئێمەیان هەموو لەوێ کردە ژوورێ بێ ئەوەی کەس بوێرێ لەوناوە بێتە سەیرمان و بپرسێ ئەمە چییە! چونکە هەموو رۆژێ ئەوە ئیشیان بوو. پێشەکی هەرهەموومانیان کردە ژوورێکەوەو دەرگایان لەسەر داخستین. پاش چەند سەعاتێك هاتنە سەرمان و دوودوو ئەیان بردین بۆ لێکۆڵینەوەی لای ئەفسەرەکانی خۆیان کە نائل حاجی عیسی سەرپەرشتی ئەکردن و ئەبوایە خۆی ئاگای لە هەموو لێکۆڵینەوەکان هەبێت. هەموو برادەران بڕیاریان دا کە من و جمال فائق بچینە بەردەگاکەو یەکەم وجبە بێن بمانبەن بۆ لێکۆڵینەوە چونکە هەردووکمان لەچاو ئەواندا مناڵ بووین، گوایە برادەران ئەم رێگەیە بە ئێمە تاقی ئەکەنەوە تا بزانن چیمان پێ ئەڵێن و چیمان لێ ئەکەن، ئەوانیش بەوپێیە هەڵوێستێك وەرئەگرن، ئەم

بۆچوونە زیاتر كاك محمود هەمەوەندی ئەیویست جێبەجێبكرێ، بۆیە زیاتر رووی لەمن ئەنا بەوكارە هەستم. منو جمال چوینە بەردەرگاكەو پێش هەموویانمان گرت. ئەوانیش یەكەم جار هەر ئێمەیان بردە دەرێ بەپاڵ پێوەنان و هەڕەشەو گوڕەشە تا كردیانین بە ژوورێكاو لەبەردەم یەك دوو معاون دا راوەستاین دەستیان كرد بە لێكۆڵینەوە لەگەڵمان بە پێچەوانەی توندو تیژی پۆلیسەكانەوە. بێئەوەی دەستێكمان بۆ بەرنو روویەكی گرژیان بەرامبەرمان هەبێت كەوتنە لێكۆڵینەوە لەگەڵمان، زیاتر بە كورپم كورپم بانگیان ئەكردینو بەشێنەیی لێیان ئەپرسین ئێوە شیوعین !وتمان نەخێر هیچ پەیوەندییەكمان بەم شتانەوە نییە. وتیان ناوتان هاتووە كە جموجوڵی حزبایەتیتان هەیەو تحقیقاتی سلێمانیبۆ ئەمە گرتوونی ئێمە نكوڵیمان لەهەموو شتێ كرد، وتیان بڕۆن دوایی بانگتان ئەكەینەوە. پۆلیسەكان پەلیان گرتینو گەڕاینەوە ژوورەكەمانو ئەمانەمان هەموو بۆ برادەران گێڕایەوە كە لێكۆڵینەوەیەكی ئاساییە. بۆیە هەر یەكە ئەیویست زوو بیبەنو رزگاری بێت. دوای ئێمە كاك محمود خۆی خستە پێشەوەو لەگەڵ برادەرێكی كە بردیانن بەڵام كە هاتەوە وتی قادر كوا وابوو بەخوا باش ئازاری ئێمەیان دا ، وا دیاربوو ئەوانیان ئەناسیو زیاتر لێكۆڵینەوەیان لەگەڵ كردبوون. ئەو رۆژە هەر هەموومانیان بانگ كردو لەوێ هیچ ئیشێكیان لەگەڵماندا نەما. بۆ شەویش لەوێ ماینەوە، بەیانی زەە هاتنە سەرمان بە دەنگەدەنگو هاوارهاواربردیانینە دەرەوە، سەرلەنوێ دوودوو كەلەپچەیان كردینو خراینە ئۆتۆمبێلەوە، هەر هەموی ژوور ژوور بوو نەمانزانی بۆ كوێمان ئەبەن . كاتێكی زۆر رۆیشتین، لە دەشتێكی بەریندا كە تەنها دوو ژووری لێبوو دایان بەزاندین، هەر بە زوویی دەوروبەرمان بە سەرباز گیراو یەك یەك ئەیان بردینە ژوورەكەو بە رووتوقووتی ئەیان هێنایەنە دەرەوە بە توێی دەرپێیەك. لە دوورەوە بە درێژی كیلۆمەترێك دە دوانزە قاوش دیار بوو كە ئەمە بەندیخانەی ئەبو غرێب بوو ئەبوایە بە راكردن لەگەڵ سەربازەكانداو لەپێشیانەوە بەرەو ئەوێ

بچووینایە بە کۆڵە جلەکانەوەو بە پێی پەتی. هەر تۆزێك تەمەڵیت بکردایە ئەکەوتیتە بەر تێهەڵدانیان و بە قایش سەروگوێلاکیان دائەگرتی. شەش حەوت برادەریان دایە پێش خۆیان، بەم جۆرە نۆرە هاتە سەر قادری حاجی حسین، بەڕاستی من کە بە رووتی دیم ورگ و سنگ و لەش و لاری لەبەر قەڵەوی ئەلەرییەوەو نەشی ئەتوانی رابکات و هەر ئەی بۆڵان و کەڵکی نەبوو دایانە پێش خۆیان، بە دەنگی بەرز دەستم کرد بە پێکەنین، ئەفسەرەکە وتی ئەوە کێبوو پێکەنی؟ کەس ورتەی لەدەم نەهاتە دەرێ. لەولاوە سەربازێکی بێ شەرم لێم نزیك بووەوەو دەستێکی کێشا بەسەرمدا وتی ئەمەبوو، یەکەم جار بوو بە بەرچاوی سەربازەکانەوە کەوتنە لێدانم بە شەق و شەقازللە، هیچم بۆ نەمایەوە لە بێدەنگی زیاتر. نۆرەش هاتە سەر من بە چەشنی ئەوانی تر دامیانە پێش خۆیان بە راکردن هەتا گەیشتمە قاوشەکان و کردمیانە قاوشی نمرە (٣) چاو چاوی نەئەبینی و هیچم لێدیار نەبوو. دەرگایەکیان کردەوەو فڕێیان دامە ژوورێکەوە کەوتم بەسەر لاشەی دوو کەسدا، یەکێکیان بە دەنگیدا قادری حاجی حسین بوو بە پێکەنینەوە وتی ئەوە تۆ کێیت، دێوی درنجی چیت؟ وەرە دانیشە لامانەوەو بێدەنگ بە . وادیار بوو ئەوان چاویان کرابووەوەو هەندێ روناکیان ئەبینی، چونکە زۆر لە پێش منەوە خرابوونە ئەوێ. ژوورەکەمان جێگەی دووکەس زیاتری لێنەئەبووەوە، بەڵام دوای کەمێك بووینە چوار برادەر، من و قادری حاجی حسین و عزیزی مالەو حەمە سعید دەروێش، و هەموو ژوورەکان بەم چەشنە پڕکرانەوە . ئەبو غرێب پێنج شەش قاوشی وەکو ئەوەی ئێمەی تیابوو. قاوشی یەکەم لە هەموویان خراپترو ناخۆشتر بوو، جێگەی هاوڕێ فهدو سەرانی حزبی شیوعی و بەشێکی ژووری جولەکەکان بوو، دووهەم جێگەی کامل چادرچی حسین جمیل و محمد حدیدو زۆر کەسایەتی سیاسی تیادا بوو، لە هەموویان خۆشتر جێگەی حەوانەوە بوو. ئەوەی ئێمە قاوشی سێهەم بوو کە تازە ژوورەکانیان چیمەنتۆ رێژ کردبوو، ئێمە یەکەم وەجبە بووین دوای تەواوبوونی براینە ئەوێ، کە زۆربەی خەڵکی

سلێمانی‌و هەولێر بووین لەگەڵ چەند شیوعییەکی جولەکە کە لەگەڵ برادەرانی ئێمە تێکەڵ کرابوون. یەك دوانێکی کە لە قاوشەکان برادەرانی بغدادو عەمارەو دیوانیەی بەزۆری تیادابوو، ژوورەکانمان هەموو فەردی بوون، تاریك‌و بێ پەنجەرە، ئێمە بە هەرچوارمان یەك پەتۆیان دابوینێ بۆ داخستن. هاتنە دەرەوەنەبوو، رۆژی جارێك ئەیانبردین بۆ ئاودەستخانە، کە بە (۳۰) ژوور (٦) ئاودەستخانەی تیابوو، سێ لەمبەرو سێ لەوبەرژووری سێ کەرەت خواردنیان بۆ فڕێ ئەداینە ژوورەکەوە تەنها سەمون‌و تەرە پیاز بوو، یەك دۆلکە ئاوی خواردنمان لابوو لەگەڵ تەنەکەیەك بۆ میزکردن. بە چەشنێ لەگەڵمان ئەجوولانەوە نەتەئزانی ناوی بنێیت چی! شەووڕۆژی چەند جارێك دە دوانزە سەرباز بە راکردن ئەمسەرو ئەوسەری قاوشەکەیان ئەکردو شەقیان لە دەرگاکانمان هەڵئەدا بۆ ئەوەی رامان چڵەکێنن. بەڵام ورەی ئێمەو بێدەنگیمان‌و خۆڕێکخستنمان بەرامبەر ئەمانە هەمووی ئەوەستاین، لە دیوارەکانی بەینمانەوە بە شیشی چراکەی لامان کونی وردوردمان کردبوو بۆ قسەکردن‌و سەری کونەکانمان بەناوی هەویری سەمەن ئەگرت لەکاتی دەرگا کردنەوەدا. بێجگە لەوەی هەندێکمان بە لێدانی‌دیوارەکە قسەمان ئەکرد بە رێگەی (مۆرس) کە هەر پیتێك ژمارەیەکمان بۆ دانابوو، سەرەڕای ئەوەی کە ئەچووین بۆ ئاودەستخانە خۆمان دوا ئەخست‌و یەکترمان ئەبینی‌و دەنگ‌وباسمان ئەگۆڕییەوە. لەناو سەربازەکاندا یەك دوو سەربازی لاومان بەسەرەوە بوو ئێمەیان خۆش ئەویست‌و شتیان پێ ئەووتین‌و لەم ژوور بۆ ئەو ژوور قسەیان بۆ ئەگوێزاینەوە، یەکێکیان کوڕێکی دیان بوو بە ناوی (منطیر) تا بڵێیت لاوێکی هێمن‌و لەسەرخۆو دەم بە پێکەنین‌و بیروباوەڕێکی پێشکەوتنخوازانەی هەبوو ، بە دڵ‌و بە گیان ئەیویست خزمەتمان بکات. ئەوی دیکەیان کوڕێکی گێلۆکە بوو بە قسەی خۆش ئیشمان پێ ئەکرد، هەرچەندە ساتە ناساتێ مانی لێ‌ئەگرتین، ئێمەش بانگمان ئەکرد ( لاکاکە خەنجەر انت خۆش ولد)و بەوە نەختێ ساردمان ئەکردەوە.

مانگێکمان بەو چەشنە بردەسەر کە ناخۆشترین کاتمان وو، هیچ هیوایەکمان بە رزگاربوون نەمابوویا بلێین رزگاربوونمان لەبیر خۆمان بردبووەوە. لەم کاتەدا لە ژوورەکەم دراو وتیان قادر کێیە با بێتە دەرێ یەکەم جار بوو یەکێ لە ئێمە بێتە دەرێ، برادەرەکانم وتیان خۆت ئامادەکە بۆ لێدان، ورەت بەرز بێت.هەرچەندە لەو باوەڕەشدابن بەرگەی هەموو گیروگرفتێك ئەگریت، زۆر قسەیان بۆ کردم من بەو چەشنە چوومە دەرێ، بەڵام کە چوومە لای ئەفسەرەکان پیاوێکی کورتە بنەی سەرسپی دانیشتبوو هەر کە چوومە بەردەمی دەستی کردە ملمو ماچی کردمو وتی من عەلی مەردانم مامتم (واتە علی مەردانی هونەرمەند) هاتوم بۆلات لەلای باوکتەوە، ئیتر بەراستی دڵم خۆش بوو گەشامەوەو کەوتینە گفتوگۆو پرسیارکردن کە هەردەم هیوای بەربونی بۆ ئەخواستم، کاتێکی باش لای مامەوەو شتێ پارەی بۆ هێنابوم لەگەڵ دوو پەتوو نەختێ کاکڵە گوێزو کەبابو گۆشتو خواردنی وەجبەیەك، شتەکانم لێ وەرگرتو گەڕامەوە ژوورەکەم . عەلی مەردان باشترینو چاکترین دەنگ خۆشی کورد بوو، لە مقاماتو گۆرانییە کوردییەکانا شارەزاییەکی تەواوی هەبوو. خۆشەویستی خەڵکی بوو هەموو کەس ئەیویست ببێتە دۆستی، وەکو باوکم بۆی ئەگێڕاینەوە لە دەمێکەوە دۆستی بووە، زۆر جار هاتووەتە ماڵمانو هەموومانی ئەناسی. بەڵام من لەو جارە زیاتر بە خزمەتی نەگەیشتبووم هەرچەندە ئێمە هەرکامێکمان لەدایك بووبین ئەو سەر قافڵەی ئاهەنگەکانمان بووە لەگەڵ مەلا کریمو دەنگ خۆشەکانی ئەو سەردەمەدا، بە تایبەتی، لە ئاهەنگی خەتەنە سوران دا. خۆی لەو کاتەدا لە ئێزگەی بەغدا بەشی کوردی ئیشی ئەکرد، شەویش لای باوکم لە ئوتێل (علمین) ئەنوست لە یەك ژووردا کە باوکم گرتبویو هەموو شتێکیان بەیەکەوە بوو، باوکم زۆر دەستی گرتووەو ئاگای لێی بوو.کاتێ باوکم ئەڵێت کوڕەکەم لە ئەبو غرێبە ئەم یەکسەر ئیشەکە ئەخاتە سەرشانی خۆیو دێت بۆ بینینم، چونکە پیاوانی رژێم دڵیان نەئەیەشان. وابزانم من یەکەم کەس بووم کە بێن بۆلام، ئەویش

مامۆستا علی مەردان بوو.کە گەڕامەوە ژوورەکەم کردمانە ئاهەنگ و بە چرپە گۆرانی گوڵی سورمان بە قادری حاجی حسین وت. ئەویش خێراخێرا ئەیوت بۆ تیکەیە گۆشت بە لێدانم ئەدەن هەرەچەندە هەموو کاتێك گۆرانی بۆ ئەوتین، بەڵام ئەمجارەیان بە گورچك بڕی بۆی وتین.

پاش چەند رۆژێك کەوتنە بردنمان بۆ تحقیقات هەر وەجبەی شەش برادەرو ئێمە یەکەم وەجبە بووین، من و حلمی علی شریف و شێخ سعید بەرزنجی و غفوری رشید داراو قادری رشید ناسك و جمال فایەق. بە پێچەوانەی جارانی کەوە سواری تۆڕنیان کردین و هەردوو کەس بەیەکەوە کەلەپچەیان کردین تا گەیشتینە بەردەم تحقیقاتی جنائی. دیسان لە ژوورێکی بچوکدا دایان ناین و دوای سەعاتێك بردیانینە ژوورێکی سەرەوە مێزێك و چەند کورسییەکی تیا دانرابوو، لەپشت مێزەکەوە رفیق چالاك دانیشتبوو یەك دوویەکی لە دەور بوو یەکێکیانم باش ئەناسی هاتبووە ماڵمان لە سلێمانی بۆلای حمید عثمان و ناوی زەکی وطبان بوو. پێشەکی رفیق چالاك پێشوازییەکی باشی لێکردین و یەك بەیەك بەناوی خۆمانەوە بەخێرهاتنی کردین، تائەوکاتە باش بوو، کاتێ غفور رشید دارا بە دەنگێکی بەرز وتی با دانیشین رفیق لێی هاتە جواب ئەو رفیقەی پێشوو نەبوو، کردیە هاوارو نەڕانی بەسەریداو وتی دانیشتنی چی!خۆ ماڵی همزە عبدالله نییە! ئێرە تحقیقاتە تحقیقات باش بزانە جێگەی ئیسراحەت نییە. کاك غفور بێدەنگ لە جێگەی خۆی وەستاو چرکەی نەکرد. ئەوانیان لە سوچێکەوە داناو کابرایەکی پۆلیس چووە لایانەوە بە توورەییەوە وتی کەس قسەنەکات و نەجوڵێ. من و قادری رشید ناسکی بانگ کردە بەر مێزەکەی و هەریەکە لەسەر کورسییەکی بچوك دانیشتین و دەستی کردە قسەکردن و هەڕەشە لێمان و هەریەکەی وەرەقەیەکی خستە بەردەممان و وتی چی ئەزانن بینوسن. روی دەمی کردە من و وتی هەر ئێستا پێم ئەڵێیت کتێبخانەکەی حزب لە کوێیە! نامەت بۆ چەند کەس ئەبردو لەکوێن؟ ناوی حزبیت چییە؟ زووکە مەوەستە.

من بێدەنگ بووم‌و چرکەم لەخۆم بڕی، کە ماڵی کاک محمودو بەدری خان‌و هاوڕێکانی کاکم هاتەوە بیرو وەك شریتی سینەما لەبەرچاوم دەرکەوتن‌و قسەکانی مام لە گوێچکەمدا دەزرنگایەوە کە وتی بڕۆ لەگەڵیانداو ئازابە، لەو کاتەدا زۆر شت بە مێشکمدا تێئەپەڕی‌و ئەڕۆیشت، ئەکەویتە تاقیکردنەوەیەکی گەورەوە یا شانازی بەخۆتەوە ئەکەیت، یا سەرکزو دۆڕاو دەرئەچیت. بەزۆر قەڵەمەکەی دایە دەستم‌و وتی بیگرە، لێم وەرنەگرت، یەك شەقازلەی لێدام و کەوتە هەڕەشە لێم جا بە قادری وت ئەی جەناب تۆ بۆمان بنووسە چیت‌و خەریکی چیت؟ کەریمی سۆفیت لەکوێ شاردۆتەوە؟ پەیوەندیت چییە بەئەورەحمانی صالحی خلەوە؟ دەڵێی دراوسێمانە، من پەیوەندی حزبی ئەڵێم، ئەویش چرکەی نەکردو بێدەنگ بوو بەڵام لێی نەدا. هەردووکمانی هێنایە نزیك خۆیەوە بە چرپە پێی وتین ئێوە سەرشەقامین‌و دۆست‌و خزمی خۆمن ناهێڵم هیچتان بۆ ببێت،پێم بڵێن چین؟ هەردووکمان بە یەك دەنگ وتمان ئێمە هیچ نین! وتی باشە ئەگەر هیچ نین بڵێن حزبی شیوعی حزبێکی خراپە، هەردووکمان بە ساردییەکەوە وتمان ئنجا چییە حزبێکی خراپە ئێمە پەیوەندیمان بەمەوە چییە چاك بێت یا خراپ.ئیشارەتی کرد هەردووکمانیان بردە دەرەوە.لە ڕاڕەوەکەدا کە بەسەر ئاوەکەدا ئەیڕوانی، دانیشتین پەنجەرەی لەسەر ژوورەکەش هەبوو، ، گوێمان لە هەمو شتێ بوو، باشیش ژوورەوەمان ئەبینی. شێخ سەعیدی بەرزنجی بانگ کردە لای خۆیەوە نەڕانی بەسەریداو پێی وت قسەت لەسەر کراوە کە ڕێکخەری سەربازەکانی ئەبێت هەر ئێستا ناوەکانیان بڵێیت وازت لێناهێنین، تۆ سەربازی، یاسای سەربازی هەر کەسێك شیوعی بێت حوکمی ئیعدامە. شێخ سعید هیچ وەرامی نەبوو.. وتی باشە جێگەی شێخ علی برات لە کوێیە پێمان بڵێ خۆ ئەمە ئەزانیت؟وەرامی دایەوە وتی چەند مانگێکە نەم دیوە، لای ئێمە نییە. بەم جۆرە یەك یەك لێکۆڵینەوەی لەگەڵ هەر یەکێکدا ئەکرد. بەڵام هێرشی باشی کردە سەر کاك حلمی‌و غفور رشید، لەگەڵ ئەوانیشدا بە همزەو ابرایم احمدو

پـارتی. وادیـاربوو زۆر دژی ئـەوان بـوو وتـی ئێـوە دوای کـڵاوی بـابردوو کەوتوون، ئەوا همزەمان بەرداوە، پێمان بڵێن ابراهیم احمد لە کوێیە؟ لێرە رزگارتان نابێت ئەوانیش زۆر لەسەرخۆو بە هێنمی وەڵامیان ئەدایەوە کەئەمان هیچ نازانن، تا دواجار دەستی کرد بە هێرش بردنە سەریان و زۆر وەڕس بوو دوور کەوتـەوەو وازی لێـهێنان. بـەم چەشـنە ئـەو رۆژە ئیشـی هـەمومانیان تـەواوکردو گێڕایانینـەوە جێگـەی خۆمـان لـە ئـەبو غرێـب ئێمـەش زۆر بـە تێروپڕی ئەم شتانەمان بۆ برادەران باس کرد، بەتایبەت من کە بۆم لوا چەند دەقیقەیـەك لەگـەڵ عمر علـی دا لەڕێگـەی ئاودەستخانە وەستابوو سـەربازە باشەکەمان لاوە بووبە دووروودرێژی هەموو شتێکم بۆ گێڕایەوەو ئەویش لەلای خۆیەوە بەژوورەکانی ئەوبەری راگەیاند.ئێمە لە ژووری ژمارە دوودا بووین و لـە دەرگاکـەوە نزیـك بوویـن سـەربازەکان هەرچییـەکان بکردایـە و هـەرجموجۆڵێکیان هەبوایـە ئـەمانزانی و کـەڵکمان لێوەرئـەگرتن، دەربـارەی دەرەوەو بەربوون و گیرانی بەندییەکان، لەگەڵ ئەوەشدا پشتی ژوورەکەی ئێمە چایخانە بوو.سەربازەکان هـەمو کاتێك لەوێ گرد ئەبوونەوەو یاری دۆمینەو تاوڵەیان ئەکردو ئەیان کردە رۆژی خۆیان و زۆرجار ئێمەیان پەرێشان ئەکرد. بەڵام ئێمە گوێمان نەئەدایە چونکە لەگەڵ ئەوەشدا زۆر قسـەیان ئـەکردو بەو دەنگە زلەی خۆیان هەمووشتێکیان باس ئەکرد، وادیـاربوو ئەیانویست ئێمە گوێمان لێبێت. لەم کاتەداوەجبەیـەکی کەیان برد بۆ تحقیقات کە عمر سعید (عمر عەنتەر)یان لەگەڵ ئەبێت، لەوێ سەر ئەکەنە سەری کە شتێك بڵێت، رفیق چالاك خزمێتی، خۆشی عەرەبی نەئەزانی و جارجارێکیش خۆی گێل ئەکات و هەرچی لێئەپرسن ئەڵێت بەخواو پێغەمبەر و بە کاك احمدی شێخ هیچ نازانم و هیـچ نیم، بە چەشـنێ وەرامیـان ئەداتـەوە هەرهـەموویان وەڕس ئـەبن و وای دائەنێن هەژارێکی هیچ نەزانی ساویلکەیان بۆ هێنـاون، معاونێکی گـەورەیان روویان تێئەکات و بە تووڕەییەوە پێیـان ئـەڵێت ئێوە چیتـان هێنـاوە، نەئەبوو ئاگاداری ئەم شتانە بن! وەرامی ئەدەنەوەو ئەڵێن ئەو کاتە ئەم کوڕە شیوعی و

زۆرزانیش بوو، پێش گرتنی وازی هێناوەو ئەم کورەی لێدەرچووە، بەم چەشنە وازی لێئەهێنن، کاك عمر وتی بەو هەموو سوێندانە نەبوایە ئێشم خراپ بوو.

سەربازەکان زۆرجار یەکێکیان بەدەنگی بەرز رۆژنامەی بۆ ئەوانی تر خوێندەوەو گفتوگۆیان لەسەر ئەکرد، بەجۆری گوێمان لێئەبو وەکو بۆ ئێمەی بخوێننەوە. نیوەرۆیەك رۆژنامەیەکیان لابوو بە دەنگی بەرز یەکێکیان ئەیخوێندەوە کە بڕیاری پاشایی دەرچووە بۆ لابردنی ئەحکامی عورفی و بەرەڵاکردنی زۆربەی بەندییەکان کە سەرۆکی هەندێ لە حزبەکانی تیابوو. لە حزبی وطنیو دیموکراتو استقلالو شعبو هەندێ پارێزەرو کەسایەتی کە، هەروەها بڕیارێکی تیابوو بۆ لێکۆڵینەوەی خێرا لە ئیشوکاری هەموو بەندییەکان، کە ئەمە ئێمەی ئەگرتەوە. بەپەلە بەهەموو ژوورەکانمان راگەیاندو بووە مژدەیەکی خۆش لای هەمووان. پاشان هەر لەبەرئەوە کە زانیمان هیچ هەنگاوێك نەنراوە دوای ئەو بڕیارە و بڵاوبوونەوەیو جێبەجێنەکردنی، ئێمە لای خۆمانەوە بۆ بیرخستنەوەی ئەوان بڕیارماندا مان بگرینو چەند داواکارییەك پێشکەش بە بەڕێوەبەرایەتی بەندیخانە بکەین، ئەویش بەوەی کەس نان وەرنەگرێتو فرێداتە دەرەوە. هەریەکە لە دەرگاکەی ژوورەکەی خۆی بدات بە هەموو هێزێکییەوەو تا بەڕێوەبەر نەیەت دەست هەڵنەگرین، ئەمە هەمو بڵاوکرایەوەو بڕیاری گشتی لەسەر درا. هاوڕێیەکی پێشکەوتووی حزبمان دانا کە لەیەکەم ژووردا بوو لەباتی هەموان قسەبکاتو داواکارییەکان پێشکەش بکات. بۆ بەیانی رۆژی دیاریکراو لەکاتی دابەشکردنی خواردنی بەیانیدا هەر دەرگایان لێکردینەوە، خواردنەکەمان وەرنەگرتو فڕێمان دایە دەرەوەوهەموو ژوورەکان بە رێکوپێکی بڕیارەکەیان بردەسەر. بەڕێوەبەر هات پێشەکی چی جولەکە لە ژوورەکاندا بوو بردیانن دارکارییان کردنو بە شەلو سەقەتی کردیاننەوە ژوورێ، ئەمە زۆر لە برادەرانی تووڕەکردو دەست کرا بە جێبەجێکردنی بڕیاری دووەم کە لە دەرگادان بوو لەگەڵ داواکردنی

بەڕێوەبەر. ئەم کارەش بەباشی جێبەجێکراو پاش نەختێ بەڕێوەبەر هات‌و سەربازەکان بڵاوبوونەوەو دەرگالێدان کۆتایی هات، بەڕێوەبەر هاواری کرد وتی چیتان ئەوێت، یەکێك بێت قسە بکات، بەڵام هیچ دەنگ نەبوو... دیسان هاواری کرد کێیە نوێنەرتان با قسە بکات، هەر دەنگ نەبوو. برادەرەکەمان وا دیار بوو ورەی بەردابوو، چونکە یەك دوو برادەری جولەکە لە ژوورەکەی ئەوەوە برابوونە دەرێ‌و بە جلی خوێناوییەوە گێڕابویاننەوە ژوورێ، ئەوە بێدەنگی کردبوو، ئێمە هەموو چاوەڕێمان ئەکرد دەنگ نەبوو.لەناکاو هاوڕێیەکی ئازاو بەجەرگی خۆمان کە خەڵکی سلێمانی بوو پەیوەندیشی بە بڕیارەکەوە نەبوو، لە سووچێکی قاوشەکەوە دەستی کرد بە دەرگالێدان‌و هاواری کردو وتی من نوێنەری هەموو بەندیەکانم وەرن قسە لەگەڵ من بکەن، هەموو شتێ لا منە... راستیمان پێبڵێن بۆ لێمان ناپرسنەوە! عورفی هەڵگیراوە ، خەڵکی بەرئەبێت، ئێوە هیچ دەنگێکتان نییە؟ لێپرسراوو سەربازەکان هەرهەموویان رایان کرد بەرەو دەنگەکەو لەبەر ژوورەکەیدا وەستان‌و دەرگایان لێکردەوەو بەدەنگی بەرز وتیان ناوت چییە؟ وتی ناوم (کمال محمود)ەو خەڵکی سلێمانیم و نوێنەری ئەم هەموو ژوورانەم دێم قسەتان لەگەڵ ئەکەم. ئێمە وامان دانابوو هاوڕێ کمال بخەنە بەینی خۆیانەوەو دارکاری بکەن‌و بیبەنە دەرێ‌و بە مردوویی بیگێڕنەوە لامان. بۆیە هەرهەموو سەرلەنوێ دەستمان کردەوە بە لێدانی دەرگاکان‌و هاوارکردن کە هەموو لەگەڵ کمال داین، بەجارێ قاوشەکە شڵەژا. بەڕێوەبەرو سەربازەکان دیسان کەوتنەوە هاوارو راکێشانی میلی چەکەکانیان‌و بڵاوبوونەوە بە قاوشەکەدا، تا دەنگی ئەفسەری بەڕێوەبەر بەرز بووەوەو هاتە گوێمان‌و داوای لێکردین بێدەنگ بین نوێنەرەکەتان ئەڵێت چی، هەموو بێدەنگ بووین‌و کش‌و ماتییەکی ترسناك باڵی کێشا بەسەر قاوشەکەداو لە هیچ لایەکەوە گوێت لە چرپەیەك نەئەبوو. سەربازەکانیش بێ دەنگ بوون، گوێمان لێبوو بەڕێوەبەر بە شێنەیی لەگەڵ هاوڕێ کمال دا ئەدواو وتوێژی لەگەڵ ئەکرد بێئەوەی هیچ

توندوتیژییـەك بنوێنـن. ئـەویش هـەموو شـتێکی تێگـەیاندو لەسـەرخۆ قاوشـەکەیان بەجێهێشت. ئێمەش هەریەکە لەلای خۆیەوە دەستمان کرد بە خوێندنـەوەی نەشـیدو چەپڵـەلێدان، تـا ئێـوارە خواردنیـان بـۆ هێنـاین بـە دڵخۆشییەوە لێمـان وەرگرتن و لەگەڵ سەربازەکاندا کەوتینە قسـەی خـۆش و ئاشتیمان لەگەڵیان راگەیاند. پاش یەك دوو رۆژ پەیوەندییان زۆر باش کـرد لەگەڵماندا. بەڕێوەبەر ئەفسەرێکی لەخۆی گەورەتری هێنا بۆلامان و دەرگاکانی لێکردینەوە و هەرکەسەی لەبەر ژووری خۆیدا وەستا و سلاوی لێکردین و بە دووردرێژی لەگەڵمان دواو وتی بڕیار وایە هەمووتان بەربن و بگەڕێنەوە ناو کەسوکارتان، رژێم ئێـوەی بـە کـوڕی خـۆی دانـاوەو ئـازاری کـەس نـادات و لێبوردنی زۆرە، ئێستاش تاکاتی بەربوونتان دەرگاتان لەسەر داناخرێت و یەك دوو سـەعات ئـەتان هێنینـەوە دەرەوە بـۆ بـەر هـەتاو رونـاکی. بـۆ بـەیانی هێنایانینە دەرێ زۆربەمان نەی ئەتوانی بڕواو قاچی وەستابوو، چونکە چەند مـانگێك بوو لـەو ژوورە بچووکـەدا دانیشتبووین و جێگـەی راکێشانی قاچمـان نەبوو خۆمان گلۆڵە ئـەکرد، تـا دوایـی هـەندێ زەیتیـان بۆ هێنـاین قاچمان پـێ چەور کردو شێلامان نەختێ چاك بووین. لە تەحقیقاتـەوە بڕیـار وابوو ئـەوەی یەك شایەتی لەسەرە بەری بدەن، ئەوەش لـەوە زیـاتری لەسـەرە نـاوی هـاتووە بیدەن بە دادگا لەوێ چارەنووسی دەرکـەوێت. ئێمە کۆمـەڵێکی زۆر بووین کە هەریەکەی یەك کـەس نـاوی هێنـابووین و زۆریـش پێیـان دانـەگرتبوو لەسـەر هێشـتنەوەمان بۆیـە بڕیـاری بـەربوونمان دەرچـوو، هـاتن یـەك یـەك ناویـان خوێنینەوەو لە ژوورەکەماندا هێنایانینە دەرەوەو بە کۆمەڵ ریزیان کردین لە گۆڕەپانی بەندیخانەکەداو خۆمـان گـۆڕی و ئامادە بووین، تـا دوای سـەعاتێك دوو لۆریی گەورەیان هێنا و سواریان کردین و بەرەو (موقف سرای) کەوتینە رێ و لـەوێ بـێ کـەفیل هـەموومانیان بـەردا، هـەندێکمان بـەرەو ئوتێلـی (علمین) بووینەوە کە خاوەنەکەی دۆستی باوکم بوو هەمیشە لەوێ دائەبەزی، منیشـی ئەناسـی جێگـەی داینـێ نـەختێ حەسـاینەوەو شتێ پارەشمـان لێ وەرگـرت

چونکە هەندێکمان هیچی پێ نەبوو، لەو کاتەدا کاک کەریم خانی باوکی سەعیدی کەریم ئاغا گەیشتە لامان لەگەڵ یەك دوو کەسی کە کە هاتبوون بۆ لای کوڕەکانیان، هەر هەموو بەیەکەوە چووینە دەرەوە بۆ گەڕانی ناو بەغداد، پاشان بۆ شەوەکەی سواری شەمەندەفەری کەرکوك بووین کە بگەڕێینەوە بۆ سلێمانی ڕێگەمان بە قسەی خۆش و گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆمان بردە سەر تا گەیشتینە جەلەولا، کە ئەبوایە دابەزین، ئەوسا شەمەندەفەر لە سەعات زیاتر لەوێ ئەمایەوە، خەڵکەکە خۆیان ئەکرد بە چێشتخانەو چایخانەو دوکانەکاندا هەریەکەی بۆ شتێك، یا بۆ پێویستی گەڕانەوەی لە دیاری و شتی عەنتیکە کە لەوێ زۆر بوو، ئێمە کە دابەزین لە ئیستگەدا یەك شەمەندەفەر وەستابوو، کە سەرکەوتینەوە چوار وەستا بوو، وا دیار بوو ئاڵوگۆڕی خەتەکانیان ئەکرد، من و جەمال فائق ڕێگەمان لێ تێك چوو کە بە ڕاستی سەرلێشێواوو وڕ بووین، چووینە ناو ئەو شەمەندەفەرەی ئەگەڕێتەوە بۆ بەغداد تەماشامان کرد کەسی خۆمانی تیا نییە، فارغۆن بە فارغۆن گەڕاین هەر هیچمان نەدی، لە پۆلیسێکمان پرسی ئەمە بۆ کوێ ئەڕوات، وتیان بۆ بەغداد، ئێمەش بە پەلەو هەڵەداوان دابەزین بۆ ناو ئەو خەڵکەی لەوێ وەستا بوون، وتیان چارەکێك زیاترە شەمەندەفەری کەرکوك ڕۆیشتوە، مانای وایە ئێمە بەجێ ماوین ئەبێ شتێ بکەین، چووینە لای فەرمانبەرەکان ووتیان هیچ شتێکمان بۆ ناکرێ ئەبێت ئیمشەو لێرە بمێننەوە تا شەمەندەفەری بەیانی ئەگات ئەوسا ڕەوانەتان ئەکەین، ئەو شەوە بە جووتە لەسەر قەنەفەکانی ئەو دائیرە ماینەوە خەو نەچووە چاومان لەبەر بێ جێگایی و تەقەو ڕەقەی کورسییەکان و نەبوونی ڕاخەرێك، تا بەیانی گوێمان لە هۆڕنی شەمەندەفەری کەرکوك بوو وەستاو ئێمەیان سوار کردو لە کەرکوکیش نەماینەوەو بە گورجی گەڕاینەوە بۆ سلێمانی. کە گەیشتمە لایماڵەوە بینیم قەرەباڵغیەکی زۆر هەیەو بەیەکدا دێن و دەچن و نیازی ئەوەیان هەیە بچن بۆ بغداد بۆ سۆراغی من، چونکە برادەران پێیان ڕاگەیانبوون کە ئێمە دەرچووین بەڵام لە

ڕێگە لە جەلەولا لێیان وون بووین، ئەمە خستبونیە هەڵوێستێکی سەیرەوەو بڕوایان بەو قسانە نەبوو، چۆن شتی وا ئەبێت؟.. چۆن خەڵك لەو ڕێگایە جێ ئەمێنێ.. بە بینینی من هەموو کارەساتەکەیان لێ بیستم و لەگەڵ دایکم و باوکم و زۆربەی کەسوکارم بە تایبەتی مامەکانم ئەو شەوەمان بە قسەی خۆش و دانیشتنێکی تێروتەسەل بردە سەر، جا وەکو برادەران گێڕایانەوە لە سواربوونی شەمەندەفەرەکەدا ئەوان زۆر چاوەڕوانی ئێمەیان کردووەو پەیوەندیشیان بە بەڕێوەبەری شەمەندەفەرەکەشەوە کردووە ووتیان هیچ چارەیەك نی یە تازە ئێمە کەوتوینەتە ڕێ و لەگەڵ ئەوەشدا هەموو فارغونەکانیش گەڕابوون، دوایی زانیبویان بەجێ مابووین، منیش میوەیەکی زۆرم کڕیبوو بۆماڵەوە، کاك کەریم خان کە پیاوێکی باش و بە حورمەت بوو زۆریش قسەخۆش بوو، ئەیکاتە پێکەنین و بە دەنگێکی بەرز ئەڵێت کوڕینە شتەکانیان بێنن ئەوەی ئەخورێ ئەیخۆین خوا داوێتی بە ئێمە حەڵاڵەو، ئەگەر وا نی یە بۆ جێ ئەمێنن، کاریان ڕاست بێت هەر خۆی پڕ ئەبات چەند پرتەقاڵێك ئەخوات و سڵاوات لە دیاری ئێمە ئەدات، جا لە دواییدا هاتە ماڵەوە لای باوکم و منیشی بینی سەری ماچ کردم و وتی لە سایەی سەری تۆوە ئەو شەوە تێر میوەمان خوارد، وا دیار بوو بۆ ئێمەت کڕیبوو دەرخواردمان بدەی، بوو بە پێکەنین لەگەڵ باوکمدا وتی قادر چی ئەڵێت بۆی ئەهێنمەوە ئێمەش لە ماڵەوە میوەیەکی زۆرمان هەبوو سەر لە نوێ دەرخواردی کەریم خان و میوانەکانمان دا، تا چەند ڕۆژێکیش میوانێکی زۆرمان ئەهات بە بۆنەی بەربوونی منەوە، زیاتر لە خزم و کەسوکارو هەندێکیش لە برادەرانی خۆم و کاکم.

ئەو چەند ڕۆژە پشویەکی تەواوم داو بیرم لەوە کردەوە سەرێك لە قوتابخانە بدەم، بەیانیەك خۆم ئامادە کردو رووم کردە قوتابخانەو چوومە لای بەڕێوەبەرو مامۆستاکان بەخێرهاتنەوەیەکی باشیان کردم و کەوتینە گفتوگۆ لەسەر دەوام کردنی قوتابخانەم، ئەوان بۆچوونیان ئەوە بوو کە نەچمەوە قوتابخانە چونکە چەند مانگێك تێپەڕ بووبوو ڕای خۆشم لەگەڵیان دابوو کە

خوێندن‌و دەوام کردنم زیانم لێ نادات، بەڵکو بە لایەنی کەمەوە ئەگەر دەریش نەچم بۆ ساڵی داهاتوو بەهێز ئەبم، لە دواییدا یارمەتیان دام کە بەردەوام بم لە خوێندن، بۆ رۆژی دوایی چوومەوە قوتابخانەو هەندێ کتێبیان دامێ‌و خۆشم دەفتەرو قەڵەمم کڕی‌و چوومە پۆلی یەکی (ب)، قوتابیان بەخێرهاتنیان کردم‌و جێگەیەکیان بۆ دانام لە تەنیشت (مجید صوفی)یەوە کە ئەوساش هەر جێگەی خۆم بوو، ئەوان زۆریان خوێندبوو من نەیان ئەگەیشتمێ، کاک مجید بڕیاری دا رۆژانە لەگەڵمدا کۆشش بکات تا بگەمەوە بەوان، مامۆستایەکی عەرەبیشمان هەبوو ناوی عبداللطیف بغدادی بوو زۆر پیاوی چاك بوو لە بەغداوە هاتبوو، وا بزانم شیوعی بوو خۆی حەشاردابوو کەس نەیئەناسی‌و ناویشی لەو پەلاماردانەی حزبدا نەهاتبوو، زۆری مجید خۆش ئەویست‌و ئەشیزانی برای هاوڕێ کەریمە، کە منیش هاتمەوە یەکەم رۆژ لە جێگەکەمدا دانیشتم دەرسی ئەومان هەبوو عەرەبی پێ ئەووتین، هاتە سەرمان پاش چرکەیەك هاتە لامەوەو وتی ها قادر بەخێربێیتەوەو سەری ماچ کردم‌و وتی (عفیه أبنی)و زۆری پێ خۆش بوو هاتوومەتەوە، هەموو برادەرانیش خۆشیان ئەویست‌و ئەیان ناسی‌و رێزیان لێ ئەگرت، لە پشوودا کمال غفور مکرجی کە قوتابی بوو لەگەڵمان، هاتە لامەوەو بە چرپە ووتی قادر مامۆستاش لە خۆتانە، لەگەڵ کەمالدا زۆر رێك بووم هەرچەندە دژی بیروباوەڕی ئێمە بوو بەڵام هەر بە قسە هەندێ توانجی تێ ئەگرتین بێ ئەوەی خراپەی هەبێت بەرامبەرمان، چونکە سیاسەتی نە ئەکردو هەر لە خۆیەوە ئێمەی بە دڵ نەبوو هەرچەندە دۆست‌و ناسیاوی هەمووومان بوو، بۆ کاتێکی زۆر خۆم بێ دەنگ کردبوو، کەسم نەئەبینی‌و لەگەڵ کەسدا نەئەسوڕامەوە، کە بەر ئەبووین لە قوتابخانە یەکسەر بۆ ماڵەوە ئەڕۆیشتم‌و نە ئەهاتمە دەرەوە، توانیم بە هۆی مجیدەوە نەختێ وانەکانم ئامادەکەم خۆشم هەندێ خۆم هیلاك ئەکرد، مامۆستایەکمان هەبوو ناوی عەلی عباس بوو، قوتابییەکان ناویان لێ نابوو (کوپان معدنی) لەبەر بێ هێزی‌و لاوازی گیانی، هەمیشە نوزە نوزی ئەهات، خەڵکی کەرکوك بوو

هاتبووە سلێمانی و زۆر قینی لە سیاسەت و حزبایەتی بوو، هەموو جارێك چەند دەقیقەیەکی بەو باسەوە پێش هاتنە سەر وانەکەی ئەبردە سەر کە هەموو کات بەوە کۆتایی پێ ئەهێنا و ئەیوت (شنو سیاسة، حکومة خرة، شعب خرة، احزاب خرة)، هەرچەندە ئەم مامۆستایەمان کوڕێکی باشیش بوو حەزی لە سەرکەوتن و پێشکەوتنی میللەت ئەکرد، بەڵام بەو چەشنەش بیروباوەڕی خۆی بۆ ئێمە دەرئەبڕی، ئیتر نازانم لە چیەوە ئەمەی لە دڵدا چەسپی بوو، ئەیان ووت ئەمە لە سەردەمی منداڵیدا خۆیان و بنەماڵەکەیان تووشی کێشەیەکی سیاسی هاتوون لەسەر سیاسەت و، لەوساوە گرفتاری ئەم کێشەیە بووە، ئێمەش پرکێشی ئەوەمان نەئەکرد پرسیاری لێ بکەین.

## هەل و مەرجی نوێ

کاتێکی باش مامەوە بێ ئەوەی هیچ پەیوەندیەکم هەبێت بە برادەران و ڕێك و پێکیەوە، کاتی ئەوەش بەسەرچوو بوو کە تەتەر هەبێت، هاوڕێیان خۆیان یەکتریان ئەبینی و من تەنها کتێبخانەکەم لا مابوو داواکاریەکانم ڕائەپەڕاند، هەرچەندە حزب لەو سەردەمەدا ببوە چەند پارچەیەك لە نجمەوە بۆ اتحادو من لەگەڵ اتحاددا خۆم ڕێکخست، بەڵام من و قادری رشید ناسك کێشەیەکی گەورەمان بۆ دروست بوو بە تایبەتی ئەو کە ئەندامی حزب بوو تەمەنیشی لە من زۆر گەورەتر بوو، ئەو ڕووداوەی بغدادیان بۆ زیندوو کردەوە و لە حزب دووریان خستەوە کە گوایە هەڵوێستی خراپ بووە، زۆر ئەملاوئەولای کرد کە کەڵکی نەبوو، منیان کردە شایەت تا بزانن ڕووداوەکە چی بووە و چۆن بووە، هەروەکو من پەیوەندیم بە ڕووداوەکەوە نەبێت، بە ڕاستی من هیچ نەبووم لە حزبداو لە ڕێکوپێکیدا نەبووم، تەنها ئەو کاتە لابەلا ئیشم بۆ ئەکردن، ئەو ئیشە گەورەیەش بینینی برادەران و پاراستنی کتێبخانەکە بوو، هاوڕی کەریمی سۆفی پەیوەندی پێوە کردم و شتەکانم هەمو وەکو خۆی بۆ باس کردو هەڵوێستی ئازایانەی کاك قادرم بۆ گێڕایەوە کە

ئەبێت پاداشتی بدرێتەوە نەك سەرزەنشت بكرێتو ئەشتوانن لە برادەرانی كەش بپرسن چۆن بووە. وا بزانم شێخ سعید بەرزنجی لەسەری ئەدواو كێشەكەی ئەجولان. لەدواییدا كێشەكەیان خستە بەردەم سەركردایەتیو كێشەكەیان بە كێشەیەكی ئاسایی داناو كاك قادر كەوتە وە جموجوڵی خۆی.

هەرم لەم كاتەدا داوایان لەمن كرد بچمە شانەیەكەوە ئیش بكەمو دەروی خۆم ببینم. ئەوەبوو یەكەم جار دامیانە شانەكەی سەید أحمد جلال برای سەید طە كە ئێمەی رێك ئەخست، لەگەڵ لطیف خەزنەدارو یەك دوو برادەری كە، دوای یەك دوو مانگ هەر مووومان خرابنە رێكخستنێكی نوێوە لای كاك فتاح رشید بێسارانیو كاك حمە صالح سعیدو بە جووتە ئەیانبردین بەرێوەو كۆبوونەوەیان لەگەڵ ئەكردین. هەر لەو كاتەدا بڕیاریسان دا قوتابیان رێكخستنێكی تایبەتیان هەبێتو من سەرپەرشتی بكەم، توانرا چەند برادەرێك بۆ ئەم ئیشە تەرخان بكرێتو لیژنەیەكی تایبەتیان لێدروست بكرێت كە ئەمانە بوون فاروق عبدالخالق قطب، وهاب صالح كۆیی، حەمەی سید علی حافظ (كە لەم دواییەدا ئەفسەر بوو، لە شۆڕشی ئەیلول دا شەهید كرا، كوڕێكی ئازاو چالاك و قارەمان و دڵسۆزی بێهاوتای حزب بوو) خالد كریم پورزای وەهابوحسن علی ئایشە خان، كە ئەوانیش هەریەكە چەند برادەرێكیان پێوە لكابوو. ئەوكاتە ئیشەكانمان زۆر بە وردی جێبەجێ ئەكرا، بێجگە لە رێكوپێكی خۆم گروپێكی باشمان هەبوو كە هەردەم بەیەكەوە بووینو یەكترمان ئەبینی بەتایبەتی ئێواران لای باخی گشتیو هەریەكە لە شانەی خۆیدا بوو بەپێی توانا ئیشی ئەكرد. بەڵام وەكو برادەر هەر هەموو بەیەكەوە بووین هەرچەندە تەمەنیشمان وەكو یەك نەبوو. لەو برادەرانە وەكو لەبیرم بێت بدیعی عبدالخالق قطب فؤادی برایو عبداللەی حاجی فەرەجی سوسیو عمری محمود میرزاو كاوس تۆفیقو فؤاد حمە امین ئاغاو حمە كاكەو علی رضای چایچیو احمد صالح و زۆری تر.

ئەوكاتە هەموو تواناییەكم بۆ حزب تەرخان كردبوو، هەروەك زۆربەی

برادەرانمان بێجگە لە لیژنەی قوتابیان، سەرپەرشتی ڕێکوپێکی هەندێ برادەریشم ئەکرد کە (حەمەی عەزە دۆم) لێپرسراویان بوو هەموویان سەرباز بوون و ڕێکخراوی سەربازیمان بوون و فەوجەکەیان لە قلیاسان بوو، ئێمە جێگای دانیشتمان نەبوو لەگەڵیان کۆبینەوە، یان بڵێین ئەوان بۆیان نەئەکرا هەموو بێنە کۆبوونەوە، لەبەرئەوە من و کاك محمد هەر بە پیاسە کۆبوونەوەمان لەگەڵ ئەکردن، لەناو شارەوە لەگەڵ دووانیان ئەچووین بۆ قلیاسان و بەپێ ئەو ڕێگە دوورودرێژەمان ئەبڕی و لەوسەریشەوە لەگەڵ دوانی کەیاندا ئەهاتینەوە بۆ سلێمانی هەر بەپێ و ئەمەش بوبووە جێگەی باس و خواسی برادەران و قسەکردن لەسەری و هاندانی برادەرانی کە چاو لە ئێمە بکەن.

تێکۆشانی ئەوسامان زۆر سەخت بوو. من بۆ بینینی برادەران و پارێزگاری خۆمان کەڵکم لە (مالك)ی مامم وەرگرت کە زمان و گوێی نەبوو. هەموو جارێك بە ئیشارەت تێم ئەگەیاند بچێت بۆ فلان جێگە کوڕێکی بەم ڕەنگە لێیەو ئەو شتانەی بۆ بەرێت، ئەمە بێجگە لەوانەی ئەیناسین رووی لەگەڵیاندا کرابووەوە، بەگورجی هەموو شتێکی بۆ جێبەجێ ئەکردین و ئەهاتەوە کەس پێی نەئەزانی.ئەمە ئازایەتی جلالی برامی تیادا بوو چونکە بەو بێزمانیە فێری خوێندەواری کردبوو، هەموو شتێکی بە نووسین ئەزانی و ناوی برادەرانمان بە نووسین و خوێندنەوە پێلەبەرکردبوو لەگەڵ ناوی مزگەوتەکان کە جێگەی بینینی برادەران بوو.زۆر لە برادەران ئەیانووت ئەوەی باشە چەندیلێبدەن ناوو جێگەی کەس نازانێت، تحقیقاتیش نازانێت خوێندەوارە. ڕۆژێکیان کاتم هەبوو لەگەڵ فاروقی عبدالخاق دا لە مزگەوتی شێخ محمود نزیك ماڵی خۆمان، پۆلیس ئەو دەورەی گرتبوو نەمئەتوانی بچم کاتیش بەرەو کۆتایی ئەهات، مالك ئەو برادەرەی نەئەناسی و هێشتا نەی دیبوو، بیرم لەوە کردەوە وەصفێکی تەواوی دەم و چاو لەشولاری بۆ بکەم و بڵێم لە فلان مزگەوت چاوەڕێم ئەکات، ئەویش مالك ناناسێت، مالك کەوتە ڕێ لەگەڵ تۆپەڵێ نامەو بەیانداو ئەچێت بەپێی وەصفەکە فاروق

ئەبینێ کە ئەچێت بەلایدا فاروق دوورئەکەوێتەوەو ئەترسێت، دیسان لێی نزیك ئەبێتەوەو بە ئیشارەت لەگەڵیدا ئەدوێت تێی ناگات، خۆی ئەکات بە ئاودەستخانەیەکدا تا هیچ نەبێ ئەو شتانەی کە پێیەتی فڕێ بداتە خوارەوە، مالك رووبەڕووی ئەوەستێت‌و هەر ئیشارەتی بۆ ئەکات ئەویش بە شتێکی کەی ئەزانێت‌و واتێئەگا کە ئەیەوێ سووکایەتی پێبکات. تا ئەبینێ مالك هەرچی نامەو شتەکان هەیە لە گیرفانی دەری ئەهێنێ‌و نیشانی فاروقی ئەدات، ئەوسا بە پێکەنینەوە لە ئاودەستەکە دێتە دەرێ‌و شتەکان ئەگۆڕنەوە.بۆ بەیانی کە لە قوتابخانە ئەمانەی بۆ گێڕامەوە لەبەرچاوی هەندێ برادەر بەڕاستی ئەوەندە پێکەنین ئەملاوئەولای خۆمانمان هەموو تێگەیاندو وەڕسمان کردن.جا کەوتینە پیاهەڵدانی مالك کە چ کوڕێکی بلیمەت‌و ئازاو لێهاتووەو ئێمەی چەند خۆش ئەوێت،رەخنەش لەمن گیرا لەبەرئەوەی ئەبوایە مالکم پێبناسیایە، لەوساکەوە مالك بووە هاوڕێیەکی گیانی بەگیانی فاروق‌و هاتوچۆی ماڵەوەشیانی ئەکردو بوبووە دۆستیان. یەکێکی کە لەوانەی ئیشەکانیان بۆ هەڵئەسوڕانین (عبداللەی علی صالح ئەفەندی) بوو کە کوڕی پوورم بوو، بە هەرکوێیەکدا بڕۆیشتایە لەبەر کەمی تەمەنی کەس لێی نەئەپرسییەوە، منداڵێکی ئازاو لێهاتوو بوو لەهیچ شتێك سڵی نەئەکردەوە و هەرچییەکمان پێبووتایە نەکردنی لانەبوو، ماڵی هەمو برادەرانی ئەزانی‌و یەك بەیەك رۆژی جارێك سەری لێئەدان. جا سەیر لەوەدا بوو هەربانگمان بکردایە قسەمان لەدەم بهاتایەتەدەر یەکسەر ئەیووت زانراو ئێمەش دووبارەمان نەئەکردەوە بۆی، خۆی ئەچوو بەپەلە ئیشەکەی رائەپەڕاندو ئەهاتەوە، بەتایبەتی رۆژانی خۆپیشاندان وەکو تیسکەی تفەنگ بۆی دەرئەچوو کەس بە تۆزی بەرپێیدا نەئەگەیشت. زۆرجار لەکاتی گرتنی ئێمەدا لامان ئەبوو تووشی کێشە ئەبوو، جنێوی بە پۆلیسەکان ئەداو لێدانی ئەخوارد، لە ساڵانی ١٩٥٤یشدا دەورێکی باڵای هەبوو لە خۆپیشاندانەکاندا. ئەمانەمان هەموو بەکارئەهێناو کەڵکمان لێیان وەرئەگرت هەریەکە بەپێی توانای خۆی، بۆ

ئەمەش ئەبێت هەردەم سوپاسیان بکەین‌و ئازایەتی‌و پیاوەتییان لەبیرنەکەین، هەرلەگەڵ ئەمانەشدا (سەرداری مامە مصطفی)شم دەورێکی باڵای ئەبینی لە گەیاندنی شتەکانماندا بە برادەران‌و ماڵی زوربەشیانی ئەزانی‌و ئازایانە ئیشەکانی بۆ رائەپەڕاندن.

حزبایەتی‌و تێکۆشانی ئەو سەردەمەمان پڕبوو لە پاڵەوانێتی‌و خۆبەخت کردن‌و خۆشەویستی‌و هاوڕێیەتی، کۆبوونەوەکانیشمان هەردەم ئەبووە جێگەی بڕواو پشت بەیەکتر بەستن‌و رێزێکی تایبەتیمان بۆ رێکخەرو سەرکردەکانمان هەبوو. هەرچی نامەیەکمان ئەنووسی لە ناوەڕاستەکەیدا ئەمان نوسی (وطن حر وشعب سعيد)و پاشان یەکێ لەم دروشمانەمان ئەنووسی (قوا تنظيم حزبكم قوا تنظيم حركة الوطنية) یا (عمال العالم اتحدوا) یا (الشيوعية اقوى من الموت واعلى من المشانق) یا (لا هوادة من ابادة فصائل المنشفك) یا (ان طريق النضال ليس مفروشة بالورود والرياحين)و زۆر شتی‌کە. کە نووسین بوبووە شتێکی ئاسایی بۆ ئێمە، دوای کۆتایی هاتنی نامەکەش ئەمان نووسی (الى الامام تحت راية حزبنا المقدام)و پاشان ئەهاتینە سەرنووسینی ناوی نهێنی خۆمان. نامەش بە بچوکترین قەبارە ئەپێچرایەوەو رەوانەی شوێنی خۆی ئەکرا، هەرچی بەیاناتیش هەبوو هەرهەمووی بەدەست نووس ئەنووسرایەوەو زۆر برادەری خەت خۆشمان هەبوو ئەم کارەیان هەڵئەسوڕاند وەکو کاک کمال رمزی‌و براکانی‌و عبدالرحمن مەلا تۆفیق‌و نەوزاد محمودو جەزای میرزا حسین‌و کاك علی مصطفى الخال‌و وەهابی صالح کۆیی‌و سەردەمێکی زۆریش مجيد عبدالرزاق‌و زۆر برادەری تر.هەر کە لە سەرەوە چەند نوسخەیەك ئەهات، ئەم هاوڕێیانە هەریەکەی دەیەها نوسخەی لەبەر ئەنووسییەوە لەسەر کاغەزی تەنك‌و کاربۆنیان ئەخستە ژێری، هەرچەندە کێشەی کاغەزو کاربۆنیشمان هەبوو نەمان ئەوێرا لەبازاڕ بیکڕین، یا نەمان ئەویست بچینە بازاڕ. هەرهەمووی لەلایەن ئەو برادەرانەوە بۆمان ئەهات کە باوکیان فەرمانبەر بوون لە دائرەکانی میریدا، سەمخیش (لەزگە) زۆر کەڕەت

خۆمان ئەچووین لە قەراغ شار لە دارگوێز یا هەندێ داری تر شیلەکەیمان ئەگرت و وەکو کەتیرەیەکی سپی و جوان بەکارمان ئەهێنا، کە ئەمە زیاتر لە دەباشان چەند دارێک هەبوو کەڵکمان لێوەرئەگرت و زۆربەی کۆبوونەوەکانیشمان لەوێ بوو. کانییەکی خۆشی تیابوو، زۆریش لە شار دوور بوو دەنگی کەسی پیا نەئەگەیشت، و یەك یەك و دوودوو هەر لە بەیانییەوە ئەچووین تا ئێوارە لەوێ ئەماینەوە بۆ گردبوونەوە و یەکتربینینمان چەند جێگایەکی دیاریکراومان هەبوو، باخی گشتی یەکێکیان بوو. زۆربەی کاتمان لەوناوە ئەبردەسەر بەتایبەتی ئێواران کە یەکترمان ئەبینی و ئیشوکارمان رائەپەڕاند. لە چاخانەی ئەوقافیش زۆر کەڕەت گرد ئەبووینەوە و یەکترمان ئەبینی، ئەوە چاخانەی حەمە ڕەق هیچ چونکە جێگەو بنکەی سەرەکییمان بوو، بەهۆی کاکە حەمەوە کە پیاوێکی باش و خۆشەویستی ئێمە بوو، هەردەم بە خۆشییەوە پێشوازی لێئەکردین و لە هەموو نهێنییەکانمان شارەزا بوو زۆر کەڕەت شتمان لای ئەو دائەنا بێجگە لە خەلفەکەی کاك رؤوف و شاگردەکەی کاك احمد کە جێگەی متمانەمان بوو، هەرلەو ریزە باخچەیەکی گەورە هەبوو بەرامبەر مزگەوتی گەورە، ئەوێش جێگەی یەکتر بینینمان بوو. بەڵام گرنگترین جێگەمان دوای نیوەڕوان دوکانەکەی قادر ئاغای عەتار بوو کاتێکی باشمان لەوێ ئەبردەسەر بە خوێندنەوەی رۆژنامەو کتێب، قادرئاغای عەتار یەکێك بوو لە رۆشنبیرەکانی شاری سلێمانی و لە بنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەرو خۆشەویستی شار بوو، ئەم دوکانەی کردبووە کتێبخانە. هەموو جۆرە کتێبێکی کۆن و نوێی تیابوو، هەرچیت بویستایە دەستت ئەکەوت و کتێبی کۆنی ئەکڕی و ئەفرۆشت و بووبووە جێگەی دانیشتنی هەموو رۆشنبیرانی شارەکەمان و ئێواران هەموو رۆژنامەکانی ئەوکاتەی بۆ ئەهات، برادەرانی ئێمەش بەپێی نەخشەیەکی تایبەتی لەوێ ئەبوون رۆژنامەمان ئەخوێندەوە، زۆرجار پارەی لە ئێمەومانان وەرنەئەگرت. ئەوساکە دراوی فلس و دوو فلس و عانەو (٤ فلس) و (دە فلسی) و (پەنجایی) و

(سەدی)و (ریال) بوو، گەورەتریش هەبوو. ئێمە عانەمان ئەدا بەو کتێبەی کە ئەبرایە ماڵەوەو دەفلسیشمان ئەدایە. زۆرجاریش کتێبی باش‌و بە نرخمان لێ‌ئەکڕی. هەموو دەنگ‌و باسێکت لەوێ ئەبیست. هەندێ کەڕەتیش ئەبووە جێگەی گفتوگۆو لێکۆڵینەوەو قادرئاغاش بەشێنەیی‌و لەسەرخۆ گوێی لێ‌ئەگرتین. هەرچەندە ئەو بیروباوەڕی نەتەوایەتی بوو کوردی زۆر خۆش ئەویست‌و مێژووی کوردو ئەدەبی کوردی جێگەی بایەخدانی بوو، چ جۆرە کتێب‌و باسێکت بویستایە بۆی پەیدا ئەکردی، وادیاربوو لە ماڵیشەوە کتێبخانەیەکی نایابی هەبێت، ئەو پیاوە باشە ئەیویست لەو ڕێگەیەوە خزمەتی میللەتەکەی بکات.

هەر بەرامبەر ئەو لە شەقامی سابونکەران کتێبخانەی کەشتی نوح هەبوو کە خاوەنەکەی (نجم الدین مەلا) بوو، پیاوێکی خوێندەواو ئەدیب‌و قسەخۆش‌و نووسەر بوو، شارەزاییەکی تەواوی لە مێژووی کوردو ڕۆشنبیریدا هەبوو، بەڵام کەمتر هاتوچۆی لای ئەومان ئەکرد. چونکە جێگەکەی وەکو ئەم نەبوو. تەنها دوکانێك بوو کە بۆ نوستنیش بەکاری ئەهێنا. لەسەرو ئەویشەوە چایخانەی صدیق هەبوو بە کۆمەڵ لێی دائەنیشتین کە ئەو سەردەمە بەناوبانگترین چایخانەی سابونکەران بوو، هاوڕێیان زۆربەی کاتیان لەوێ بوون‌و یەکترییان ئەبینی‌و بوو بووە جێگای تایبەتی نیشتمان پەروەران‌و مەڵبەندی تێکۆشان‌و هەڵمەت‌و ڕێکوپێکییەکانی حزب، و ناویان لێنابوو مۆسکۆ پێ‌بەپێی گەڕەکی سەرشەقام. لەگەڵ ئەمانەشدا کاکە حەمەی بەکر چایخانەیەکی لەبەرخانەقا لە گەڕەکی سەرشەقام هەبوو بەناوی (گازینۆی ئاشتی)و ئەوێش بووبوو بە مەڵبەندی برادەران‌و هەموو نیشتمان پەروەران.

## خۆپیشاندانی شەوان

دوای ئەو هێرش و گوشار خستنەی سەر حزب و گرتنی زۆربەی برادەران و دوورکەوتنەوەی بەشێکی گرنگ لە دۆست و لایەنگران لە تێکۆشان و نەمان و تێکشکاندنی رێك و پێکییەکان. توانرا هەندێ شانەی رێك و پێك دروست بکرێت و برادەرانی باش و لێهاتوو گرد بکرێتەوە و شتێکی بچووك بهێنرێتە کایەوە، هەرچەندە هێشتا ئەو گورزە کوشندەیەی بەر حزب کەوتبوو، ئەو برینە قووڵەی لە گیانی کرابوو بەتەواوەتی چارەنەکرابوو، میللەت هێشتا ئەو ترس و لەرزەی لە دڵدا بوو کە رژێم بەسەریدا سەپاندبوو. هەر لەم کاتەدا بیر لەوە کرایەوە ئەبێت ئەم تەوقە بشکێنرێت و خۆمان بە چەشنێ دەرخەین کە هێشتا ماوین. بەلایەنی کەمەوە چاوی میللەت لەو ترس و هەڵهاتنە دوور دەخرێتەوە سەرلەنوێ وەکو پیشەی جارانی بکەوێتەوە هەڵمەت و خۆرێکخستن و باوەڕی بە حزب و رێکخراوەکانی پتەوبێتەوە. بۆ ئەمە نەئەتوانرا ئیشی گەورە بکرێت، بەڵام ئەتوانرا ئەو رێك و پێکییە کەمەی کە هەمانە بیخەینە گەڕ و هەندێ جموجۆڵ بهێنینە دی و باشترین ئیشیش ئەوەبوو بڕیاردرا کە خۆپیشاندانی لەپڕ بکرێت بەشەو لەو جێگایانەی کە برادەرانی حزبی تیادا زۆرن و ماڵی دۆست و لایەنگرانمانی تیادا هەیە، بۆ پاراستنی هاوڕێیان لە گرتن و راونان. یەکەم جێگا کە دەست نیشانمان کرد گەڕەکی مەڵکەندی بوو کە چەند کۆڵانێکی چڕی پێچاوپێچی تیادا بوو، کە پۆلیس بەهیچ جۆرێك نەیئەگەیشتێ. بێجگە لەوەی ماڵی برادەران و دۆستانی خۆمانی بەزۆری لێبوو. چاودێری تحقیقاتی ئەوەندە لەسەر نەبوو. پێشەکی هاتین دە دوانزە برادەرێکی گەڕەکێکی دوور لەو ناوچەیە خۆیان ئامادەکرد وەکو حەمە امینی ئاسنگەر و سعیدی گەوهەر و عثمانی ئاسنگەر و حەمە سعید مولود و سلامی مەلا سابیر و ئەوڕەحمانی صالحی خلە و احمدی مارف و خۆم و جلالی برام و حەمە رشید احمد شانە و چەند برادەرێکی کە. یەك یەك و دوودوو بەرەو مزگەوتی حاجی‌حان کشاین و لەبەردەرگای ئەودیوی کۆڵانەکە گردبووینەوە و

دەست كرا بە چەپڵە لێدان‌و هتاف كێشان‌و وتار خوێندنەوە. تا كەوتینە ڕێ بۆ كۆڵانەكانی ئەو گەڕەكە كە كەس دەركی پێ‌نەئەكرد ئێمە نەبێت لەبەرپێچاوپێچی‌و تەسكی. خەڵكێكی زۆر لە سەربانەكانەوە سەیریان ئەكردین‌و هەندێكیان چەپڵەیان بۆ لێئەداین، كارەكەمان چارەكە سەعاتێك بەردەوام بوو، بڵاوەمان لێكرد بێ‌ئەوەی پۆلیس پێمان بزانێ‌و هەركەس گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی. بۆ بەیانی دەنگێكی باشی لەناو خەڵكدا دایەوەو بووە سەرباس لەناو بازاڕو هەموو ماڵێكدا. پاش چەند شەوێكی تر لە گەڕەكی گۆیژە هەمان خۆپیشاندان دەستی پێكرد لای مزگەوتی شێخ بابا علی كە برادەران ڕؤوف حاجی ئەوڕەحمان‌و حەمە سعید دەروێش‌و علی حاجی عبدالله (علی بۆسكانی)و أحمد عباس‌و جلالی وەستا ئەوڕەحمان‌و عارف رشیدی نانەواو ئەكرەمی صالحی رەشەو حەمەی سید علی حافظ و فاروقی عبدالخالق‌و چەندین برادەری كە بەشداربیان كرد، بەهەمان شێوە بە كۆڵانەكاندا گەڕان. بەم شێوەیە بە دوو شەو جارێك لە گەڕەكێك ئەم جۆرە خۆپیشاندانە ئەكرا، كە زۆر جار لەم دواییەدا خوشكان دەورێكی باشیان تیا ئەدی وەكو (قەدەم خێرو گەلاوێژی عبدالخالق‌و ملیحە زهدی‌و منیرە صالح)و خوشكانی نائب عبدالله‌و ئەوڕەحمانی صالحی خلەو زۆری تریش لە خوشكانی حزب‌و دۆستەكانیان، كە ئەمانە وەكو برادەران مەرج نەبوو دانیشتووی ئەو گەڕەكەنەبن، چونكە هەموو بە عەباوە ئەهاتن، و ناسینەوەیان زۆر گرنگ بوو. ئەم خۆپیشاندانانە بەجارێ پۆلیسی شڵەژاندبوو، بۆیە ئەیانویست هەڵمەتێكی گەورە لە خۆوە بكەنە سەر برادەران بەلام هیچ بەڵگەیەكیان بەدەستەوە نەبوو، نەیان ئەزانی چی بكەن، ئەوەبوو بە هەموو گەڕەكەكاندا پۆلیسیان بەشەو بڵاوئەكردەوەو زۆر كەڕەت لە سەربانەكان پیاوەكانی خۆیان حەشار ئەدا بۆ هێرش بردنە سەر خۆپیشاندەران. یان بەلایەنی كەمەوە ناسینی برادەران. بەلام بۆیان نەئەكرا چونكە ئەمانزانی لە كوێن‌و چی ئەكەن. هەروەها هەموو برادەرانیش دەموچاوی خۆیان

هەڵئەبەست و خۆیان ئەگۆڕی. میللەت هەموو شەوێ چاوەڕێی ئەکرد و خۆی ئامادە ئەکرد یارمەتی خۆپیشاندەران بدات، وای لێهاتبوو هەندێ شەو ئەبووە هەلهەلەکێشان و چەپڵەلێدان و هوتاف کێشان، جاری واهەبوو دوای کۆتایی خۆپیشاندانەکە ئەم چەپڵەلێدان و هوتاف کێشانە بەردەوام ئەبوو، بەتایبەتی خۆپیشاندان لە سەرشەقام و هۆمەرمەندان و چوارباخ و کانێسکان و هەموو گەڕەکەکانی سلێمانی بەرپائەکرا، برادەرانمان بەچەشنێ راهاتبوون لەسەر ئەم شێوەی تێکۆشانە هەرهەموو ئامادە ئەبوون و بەشدارییان ئەکرد. ماوەیەکی کەم وەستاین و کەرەتێکی کە گەڕاینەوە بۆ گەڕەکی مەڵکەندی و هێزێکی گەورەمان کۆکردەوە لەوێ، بەڵام ئەمجارە لەگەڵ دەموچاوهەڵبەستن و خۆگۆڕیندا هەرهەموو داروتێڵامان گرتبوو بە دەستەوە، خوشکانیش کۆمەڵێکی باش هاتبوون، چاوەڕێی ئەوەمان ئەکرد پۆلیس بێت بۆمان و لەگەڵیاندا تێهەڵچین، خۆمان باش بۆ ئامادەکردبوو. ئەم کەرەتە عمری حاجی محمد (عمر دیلان) لەگەڵ ئەورەحمانی صالحی خلە سەرپەرشتییان ئەکرد. کاتێکی زۆر بەردەوام بوو بەڵام تووشی هیچ نەبووین و بەشێنەیی لای مزگەوتی مەڵکەندی نزیک ماڵی فتاح رشید بیسارانی بڵاوەمان لێکرد. من و هەندێ لە برادەران پاش داماڵینی شتەکانی دەموچاومان هاتینە چایخانەی ئەوقاف دانیشتین، چونکە ئەوسا باوبوو دوای نانخواردنی ئێوارە زۆربەی خەڵك لەماڵ ئەهاتنە دەرێ بۆ گەڕان یا دانیشتنی چایخانەکان، بە دەگمەن هەبوو لە ماڵدا بمێنێتەوە، ئەوەی ئەشمایەوە لەماڵی خۆیدا دائەنیشت یا سەردانی یەکتریان ئەکرد. پاش سەعاتێك پۆلیس ئەوناوەی گرت و هاتنە چایخانەکە من و قادر رشید ناسك و وەهاب صالح کۆییان گرت و بەرەوسەرایان بردین، کە سەیرمان کرد خوشکە (قەدەم خێرو مەلیحە زوهد)یشی لێ بوو ئەوانیش گیرابوون، هەرهەموو کراینە ژووری بەندیخانە، دوای سەعاتێك لێکۆڵینەوەمان لەگەڵدا کرا گوایە خۆپیشاندانمان کردووە لە مەڵکەندی، بەڵام هیچ شایەتێك لەوێ نەبوو قسەمان لەسەر بکات. بۆ گەڕانەوە لەگەڵ خوشکاندا

تا نزیک ماڵەکانیان چووین، و ئەمە ئێمەی گەیاندە مەلابانگدان، کاتێ گەڕامەوە بینیم دایکمو باوکمو خزمان هەموو لەبەر دەرگا دانیشتبوون چاوەڕێی منیان ئەکرد بزانن چیم بەسەر هاتووە باوکم بە تووڕەبوونەوە بەرەو ڕووم هاتو نەختێ پیاما هەڵشاخاو کەوتە قسە پێووتنم، کە ئەمەش یەکەم کەڕەتی بوو لە ژیانیدا، زۆر سەرم سوڕما لەو هەڵوێستەی کە نابێت وابێت بەرامبەرم، بەڵام هەر زوو وتی من لە گرتنت تووڕە نابم ئەوە ئیشی خۆتە، بەڵام لەگەڵ ژناندا گیراویو خۆپیشاندانت کردووە ئەوەم پێناخۆشە ئەو کەران باوگاوە (عمری خولەی ئەمینی بوك) کە پۆلیسی تحقیقاتە لێرەوە هاتو توانجی تێگرتین. هەر چۆنێك بوو دڵی باوکم هێنایەوە جێگەی خۆیو وتم لە چایخانە بووم هاتن گرتیانین، ڕاستە چەند ئافرەتێکیش گیراون، بەڵام بۆ ئەبێ پێت ناخۆش بێت، ئەوانیش خوشکانی ئازاو تێکۆشەرنو ئەبێت پێمان خۆش بێت ئەم خوش کانەمان هەیە، باوکم سەرێکی لەقانو قایل بوونی خۆی بۆ دەربڕیم، لەمەشدا مامو دایکم پشتگیریی منیان کرد. بۆ بەیانی زوو هێشتا هەتاو نەکەوتبوو دەرپەڕیمە دەرەوە بەرەو باخچەی گشتی کشام بۆ بینینی (حەمەی عزین) کەلەگەڵ یەك دوو سەربازدا چاوەڕێی ئەکردم بە پێ بەرەو قلیاسان بچین بۆ کۆبوونەوە کە گەیشتمە لای دەرگای باخچەکە چوار پۆلیس بەرەو ڕووم هاتنو وتیان وەرە کاك مارف بانگت ئەکات (معاونی تحقیقات بوو) چوومە بەردەمی وتی بەم بەیانییە چی ئەکەیت تۆ ئەمشەو بەربوویت، هەر ئێستا ئەتگرمەوە وادیارە وازناهێنێ. منیش زۆر بە شێنەییو لەسەرخۆ پێم وت ئەچم بۆ قوتابخانە، دەفتەرێکم پێبوو سەیریان کردو هەموو لەشم گەڕان هیچم پێنەبوو. جا ئیتر بەریان دام بەرەو قوتابخانە ڕۆیشتمو محمدو سەربازەکانم بەجێهێشتو ئەو ڕۆژە نەم بینینەوە، خۆیان ڕۆیشتبوونو ئیشی خۆیان جێبەجێکردبوو.

ئیشی حزبایەتیمان لەوکاتەدا بەباشی ئەڕۆیشت بەڕێوە، من بێجگە لە ئیشی قوتابخانە هەرچی دەوروبەری گەڕەکی خۆمان هەبوو لە خۆمو حزبم

کۆکردبووەوەو بە پشتگیریو یارمەتی هاورێیان عبدالرحمن صالحی خلەو قادری رشید ناسك توانرا زۆربەیان رێك بخرێن لە شانەکاندا وەکو کاك نائب عبداللەو ماجدیبرایو محمد فتاحو کاك یوسفو کوڕەکانی حاجی عبدالله بانەییو بابەکرئاغاو مستەفای برای کە لە رانیەوە هاتبوونە سلێمانی بۆ خوێندن لەگەڵ محمد ئاغای خزمیاندا کە پێمان ئەووت (میرم)و لە مالی حەمەی بەکردا کرێچی بوون، لەگەڵ زۆر کوڕی گەنجی ئەو ناوە کە هەندێکیان هەر بە دۆست مانەوە لەگەڵمان.

لیژنەیەکم پێوە بەسترابوو لە قوتابخانەی ناوەندی کە پێکهاتبوون لە عزتو رشیدو فاروق عبدالخالقو وەهاب صالح کۆییو جمال فائقو یەك دوویەکی ترو هەموو کۆبوونەوەیەك مجید عبدالرزاق ئەهات کۆبوونەوەی لەگەڵ ئەکردین لە گردەکەی نزیك قوتابخانە کە گۆڕستانی جولەکەکانیان پێئەووت، چەند کۆبوونەوەیەك بەیانێکی حزبی بۆ باس ئەکردین بەناوی (موقفنا في قضية الفلسطينين) دوای ئەوە نەمان دییەوە وابزانم خۆی شاردەوەو لە سلێمانی دەرچوو.

ئێمە جموجۆڵمان هەمیشە بەردەوام بوو خۆمان باش رێکخستبوو، زۆر لە برادەران کە باوەڕیان بە حزب نەمابوو گەڕانەوە ریزو کەوتنەوە ئیشکردن، ئەوەبوو دوای پشوویەکی باش یەك دوو کۆبوونەوەو خۆپیشاندان لەناو بازاڕو شەقامو مەیدانی دەبۆکە کرا، زۆربەی برادەرانمان بەشدارییان تیاداکرد، کە زۆربەی بۆ بژێوو بەرژەوەندی ئابووری میللەت بوو دژی گرانیو قات وقڕی. کە مەسەلەی هێنانو بردنی کەلوپەل بوو بۆ ناو شارو دەوروبەری. بووبووە کێشەو بایەخدانی حزب بەو شتانە. لەگەڵ فێرکردنی برادەرانلە تێکۆشانی دیموکراتیو ئاشکرا، کە پێویست بوو رێکخراوەکانمان بە هەندێ جموجۆڵ هەستێتو خۆپیشاندان بکرێت، کە ئێمە لە یەکێ لەو خۆپیشاندانانەدا گیراینو هەر بە زوویی رەوانەی بەغدا کراین بۆ ئەوەی لە سلێمانی نەمێنینەوەو دورمانخەنەوە لە بەندیخانەی ئەبوغرێب توندیان

کردین، کە وەکو جارانی پێشوو نەبوو. ژوورەکانیان هەموو گەچکاری کردبوو، پەنجەرەی گەورەگەورەیان بۆ دروست کردبوو، کارەباشیان بۆ دانابوو. لەبەردەم قاوشەکاندا گۆڕەپانێکی زۆر گەورەیان دروست کردبوو بە تەلی دڕکاوی دەوریان گرتبوو.لە هەمووی زەقتر ئیدارەیەکی باشیان بۆ دانابوو، بەشەوو بەرۆژ ئەبوایە دەرگاکان لەسەر پشت بوونایە، هەموو یەکمان ئەبینیو خواردنمان دروست ئەکرد. پەنیرو ماستو کەرە لەگەڵ پەرداخێك چاو هەریەکە بە جیا مووچەی بەیانیانمان بوو، بۆ سەعات (١٠)ی سەرلەبەیانیش بسکیتو پەرداخێك کاکاو دابەش دەکرا، نیوەرۆش برنجو شلەی پڕ لەگۆشت، ئێوارانیش هەریەکەی لەفەیەك گۆشتی ماسی یا ئاژەڵ یا مریشك مووچەمان بوو. کە بە راستیهەموومانیان خستبووە حەوانەیەکی باشەوە. لە ئەبوغرێب دەنگوباسی پاڵتۆکەی من بوبووە پەندی سەر زمانی زۆربەی برادەران.

وەختی خۆی هەرچۆنێ بوو باوکم پارچەیەك قوماشی لە بەغدا بۆ هێنابووم ، پێش ساڵ و نیوێك دابومانە (عمر شەیدا) بۆم بکات بە قاپوت، دوای ئەو کاتە دوورودرێژە ئەو رۆژە تەواو بوو کە منی تیادا گیرام. پاڵتۆکەم لەبەردابوو کە رەوانەکراین. لە شەمەندەفەردا عمر نەمەڵی زۆری سەرما بوو پاڵتۆکەم دایە لەبەری بکات، ئاگامان لێ‌نەبوو شەو لەسەر زەوی شەمەندەفەرەکە پێوەی نووستبوو، ئەوەندەی ئەملاولا پێوەکردبوو بەیانی کە هەستاین بینیمان هەمووی بوبووە نەوتو رەشاییو بەهیچ جۆرێك نەتدەناسییەوە، بەم شێوەیە گەیشتینە ئەبوغرێبیش هەر لە بەریدا بوو ئەوەندەی تر رەنگەکەی گۆڕرا. هەوڵی شتنیشی دا هەرچی رەنگو پیسایی هەبوو بواردیو پێوەی لکابوو، رەنگاورەنگ دەرچوو، بۆیە هەموو برادەران بڕیاریان دا کە هەر ئەبێ خۆی لەبەری بکات، ئەو پاڵتۆیەی چەند ساڵێك بەتەمای بووم عمر نەمەڵی بوو بە خاوەنیو یەك رۆژ من لەبەرم نەکرد. جا کردیە دەستەبەری خۆی بۆ چێشتخانەو هەر رۆژێك ئەو خەفەربووایە بە پاڵتۆکەوە ئەچوو بۆ ئیشکردنو ئەوەندەی کە پیسی ئەکرد، لەکاتی

دەرچوونماندا پێشکەشی چێشتخانەکەمان کردو بووە موڵکی ئەوان.

ئەمجارەمان دە دوانزە برادەر بووین، منو عمر نەمەڵیو عمری حەمە تیکەو علی عبداللە (بۆسکانی)و غریبو حەمە شەلی هەڵەبجەییو چەند برادەرێکی ترو هەردووانمان لە ژوورێکدا بووین، لە برادەرانی عەرەب هەموو سەرۆك نەقابەکانی ئەو سەردەمەمان لەگەڵ بوو، وەکو اکرم حسینو عبدالقادر عیاشو گلێپانو زاملو زۆریتری وەکو پاڵەوانی عێراق خلوق امین زکیو عبداللطیف طیارو عبدالستار علیو عبدالصاحب علیو چەند کەسێکی تر، پاش چەند هەفتەیەکیش عمری مەلا رشیدو دوو برادەری کەیان بۆ هێناین لە سلێمانییەوە کە ناویان هێنابوونو کاك عمریش چەند بەیانێكو نامەیەکی حزبی پێگیرابوو، چەند رۆژێك لەژێر لێدانو فەلاکەت دا ئەبێت هیچ نادرکێنێ رەوانەی لای ئێمەیان کرد تا رۆژی دادگایی. جا بووە مشتومڕێکی زۆر لەگەڵ رێکخستنی ئەوێداو کاك عمر خۆی نەئەدا بە دەستەوەو ئەیووت من سیاسی نیمو هەروا گیرام ئەیوسیت نەیەتە رێکوپێکییەوەو نەیناسن. هەندێ برادەر کەوتنە سەروگوێلاکیو ئەیانناسی، بەڵام بێکەڵك بوو ئیشەکەیان سەری نەگرت. پاشان هەموو شتێکی لای من باس کردو لێم پاڕایەوە کە بە هاوڕێیان بڵێم وازی لێبێنن خۆی حەز دەکات وا بمێنێتەوە تا کاتی دادگا. رۆژێك بردیان بە دوو ساڵ حوکمەوە هێنایانەوە، لەکاتی بردنیدا بۆ بەندیخانە ئاهەنگێکی باشمان بۆ گێڕاو خۆشی وتی ئێستا گەر بزانن چیم پێگیراوەو چیم لێکراوە قەیدی نییە! مەلا عمر برادەرێکی ئازاو لێهاتووبوو، ئەمە یەکەم جاری بوو بگیرێ، چەند کەرەتێکی تر بەندی کرابوو هەر ئازایانە دەرچووبووو بەڵام نهێنییەکانی زۆر بەهێزبوو لای برادەرانیش هیچی نەئەدرکانو هەموو جاری ئەیووت بەندیخانە جێگەی حەوانەوەیەو دەرەوە جێگەی ئیشکردن.

هەموو بەیانیان زۆربەی برادەران وەرزشیان دەکرد کەراهێنەرەکەیان خلوق امین زکی بوو برادەرانی باشی پێگەیاندو دەورێکی باشی هەبوو لە پێشخستنی تەندروستی هەمووانداو هەموو رۆژێکیش کۆبوونەوەی

ڕۆشنبیریمان هەبوو کە زیاتر هاوڕێ اکرم حسین غصبان سعدو عبدالوهاب قیسی دەوریان تیادا ئەبینی. یەك دوو مانگ ئێمەش ماینەوەو دراین بە دادگاو هەر یەکەی سێ مانگ حوکم دراین و ڕەوانەی موقف سرا کراین و لەوێ بەریان داین چونکە حوکمەکەمان بە توقیفی تەواو کردبوو. بە کۆمەڵ گەڕاینەوە بۆ سلێمانی و هەریەکەی جێگەی خۆی گرتەوە لە ڕێکوپێکییەکانی حزبدا، منیش چوومە لیژنەیەکی سەرەکییەوە کە هاوڕێ کریم بەگ ڕێکخەرمان بوو.

## گەڕانەوەم لە بەندیخانە

بە گەڕانەوەم لە بەندیخانەوە کاك کمال کریم پەیوەندی پێوەکردم. هەموو ڕۆژێك یەکترمان ئەبینی و بۆ کاتێکی کەم زانیارییمان ئەگۆڕییەوە لەگەڵ هەندێ ڕووداوی بە پەلە، هەفتەی جارێکیش بە پیاسە بەرەوگردەکەی زەرگەتە ئەڕۆیشتین بۆ کۆبوونەوەو یەك دوو سەعاتمان ئەبردە سەر. ئەو سەردەمە زۆربەی باسەکان لە سەر بەرەی چەپ و ڕاست و ئیستعمارو کێشەی ئەوسای میللەت و ڕاکێشانی برادەری نوێ بوو بۆ حزب، کە هەر خۆمان بۆخۆمان لە حەلقەیەکی تەسکدا هەڵئەسوڕاین. ئەمە چەند حەفتەیەکی خایاند، دوای ئەوە لە لیژنەیەکی سەرەکیدا ڕێکخرام لەگەڵ (لطیف مصطفی - لەتیفی نانەوا)و احمدی مارف و عمر اسماعیل دا، کە هەر کاك کمال ڕێکخەرمان بوو. حەفتەی جارێك بە ڕێکوپێکی کۆبوونەوەمان ئەکرد، بەپێی پەیوەندیمان و نزیك بوونم لە کاك کمال و زووزوو یەکتر بینینمان من بوومە نوێنەری بەینی ئەوو هاوڕێیان، کە ئەویش لە لیژنەیەکی کەدا لەسەروو ئێمەوە هاوڕێیەك ڕێکی ئەخست دوایی زانیمان (نافع حەوێزی)یەوبەناوی نهێنی (ڕۆستم)ەوە ئەناسرێت. هەموو جارێ زۆرمان لێئەکرد کە ئەو هاوڕێیە بێت بۆلامان و هەندێ قسەمان بۆ بکات و شتێکمان تێبگەیەنێت بەتایبەتی نامیلکەیەکیان دەرکردبوو بەناوی (دۆستی دۆستم دۆستمە، دوژمنی دوژمنم دۆستمە) کە چەند کۆبوونەوەیەك ئەوەمان بۆ باس ئەکراو لەسەری ئەدواین، بەڵام کاك کمال

بەرەنگارمان ئەبووەوەو هەزارویەك شتی بۆ ئەهێنایەنەوەو ئەیووت برادەران ئیشیان زۆرەو ناتوانن بتان بینن.ئێمە ئەمانزانی و تێگەیشتبووین کە هاوڕێیەکی بێ مستەواو نەشارەزا بێت چونکە هەندێ جاریش کاك کمال گلەیی ئەکرد گەر شتێ رووی بدایە ئەیووت بڵێم چی ئەوە هەڵوێستو بۆچوونی برادەرانە، نەیئەویست لەسەری بڕۆین و لێی بکۆڵینەوە، ئەو برادەرەیان بەسەردا سەپاندبوو کە لێپرسراوی یەکەمی شاربوو، ئەویش باش ئەیناسی، بەڵام لەبەر رێکوپێکی حزبی هیچی بۆ نەئەکرا. تا لەدواییدا ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە ئەو برادەرە ئەوەشی هەڵنەئەگرت تەنها شانەیەکیش بەرێت بەڕێوە. هەر خۆیشی ئەوەی ئەزانی لە (بەدرە) ئیشێکی وای بۆ خۆی هەڵبژاردبوو کە نەیەتە ناو رێکوپێکییەوەو رووبەرووی برادەران و گفتوگۆیان نەبێتەوە، ئەویش میراوی بووئەبوایە هەمیشە خەریکی ئەوەبێت.

کاتێکی باشمان بەم رێکوپێکی و رێکخستنەوە بردەسەرو بیرمان لەوە ئەکردەوە کە بتوانین لەو ئەڵقەیە دەرچین و زیاتر بچینە ناو خەڵکییەوە. ئەوەبوو توانرا جووڵانەوەی ئاشتی خوازان دابمەزرێ کە مامۆستا گۆران و مەلا کمالی محامی و اسماعیل شاوەیس و صدیق شاوەیس و حەمەی حاجی تایەرو رؤوف معروف و عمر متابچی و صالح دیلان و شاهێن و علی جافی حسین جاف و هەندێ پیاوی ئایینی و کەسایەتی سلێمانی بەشدارییان تیاداکرد لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی دانانی هەندێ یانەی ئاشکرامان دا بۆ وەرزش و زانستی و کۆمەڵایەتی. لەمانە هاتین یانەیەکمان کردەوە لە قوتابخانەی غازی کەلەم دواییەدا بوو بە مەڵکندی و زۆر لە برادەران دەوریان تیا ئەبینی وەکو جلال احمد فهمی و رفیق فتح الله و جمیل نوری و طه خلیل و عمر نەمەڵی و کریم باراوی و چەند برادەرێکی تر. یاری جمناستیك بەشێکی گەورەی یانەکە بوو قادر خلیل سەرپەرشتی ئەکردو زۆربەشی براو کەسوکاری برادەران بوون کە لە تەمەنێکی بچووکدا بوون، هەوڵدرا چەند یارییەکی فتبۆڵ و باسکەو بالە دروست بکرێت بەسەرپەرشتی غفور تایەر (غەفورە) و جمیل نوری و نوری

بەدەوی. بەڵام وەكو یارییەكانی سەركەوتنی بەدەست ئەهێنا، ئێمە هەموو برادەران، كمال كریمو دارا تۆفیق فتح‌الله خەسرەوو فؤادی حەمە امین ئاغاو منو حەمە كاكەو هۆگر گۆرانو بدیع قطبو عبداللەی حاجی فەرەجی سوسیّو عمری محمود میرزاو زۆریكە هەموو ئێوارەیەك ئەچووین بۆیانە، هەندێكمان بۆ سەرپەرشتی كردنو هەندێكمان بۆ دانیشتن. هەموو هەفتەیەك یارییەكی گەورە ئەكراو ئەبووە چەپڵە لێدانو هوتاف كێشانو هاندانی یاریكەرانو دروستكردنی كەشێكی خۆش لە یانەكەدا، ئەم یانەیە زیاتر كاتی پشوودانی قوتابیان كەڵكمان لیّوەرئەگرت، لەبەرئەوە بیر لەوە كرایەوە كە بەپیّی یاسای یانەكان بتوانین یانەیەكی گەورەترو باشتر دروست بكەین بە پشتگیری خۆمان كە زۆربەی یارییەكانی تیادابێت. بۆ ئەمە یانەی (القوة و الصحة)مان كردەوەو بووینە لقی بەغداو لیژنەیەكمان دروست كردو داوای مۆڵەتمان كرد لە كاك نوری امین بەگو سەرۆكو ئەندامان حەمەی سعیدی مەلا عباسو كریم پاڵەوانو حەمە رشیدی ئەحە شانەو جەلالی تەنەكەچیو یەك دوو برادەری كە پێكهاتبوو. ئێمەش زۆربەی برادەران بە رێكوپێكی هاتوچۆمان ئەكرد، هەرلەوێدا ژوورێكی گەورەیان بۆ زۆرخانە دانابوو كە زیاتر اسماعیل پاڵەوانو حاجی عبداللەو تۆفیقی حاجی باقیو جلالی تەنەكەچیو حەمەی سعیدی مەلا عباس یارییان تیادا ئەكرد، كریمو حەمە رشیدیش زۆران بازیان تیادا ئەكرد، ژوورێكیش بۆ جوانی لەش كە زۆربەی لاوەكان بەشداربوون. ئاسنو قورسایی بە رادەیەكی باش پەیداكرابوو كە ضغطو نەترو دومبلاسی تیادا ئەكرا. بێجگە لە ژوورێكی كە كرابووە جێگەی دانیشتنو هەموو جۆرە خواردنو خواردنەوەیەكی تێدابوو لەگەڵ ژمارەیەكی زۆر كورسیو مێز بۆ دانیشتن. ئەم یانەیە ئیشە سەرەكییەكەی وەرزش بوو، بەڵام زۆر بە وردیو لەسەرخۆ سیاسەتی تیائەكرا بیّئەوەی كەس بزانیّو بكرێتە هەلاّ. یانەكە لە گەڕەكی سابونكەران بوو لە كۆڵانێك دا نزیك مزگەوتی هەمزە ئاغا لە ماڵی سەید نوری احمدی بابارسول دا كە حەوشەیەكی هێجگار

گەورەشی هەبوو هەمووی باخ‌وباخات بوو. هەر لەدوای نیوەڕۆ ئەبووە سێبەر بۆ دانیشتن ئێمە زۆر لەسەرخۆ پاڵمان بە برادەرانەوە ئەنا کە ئێواران بێن بۆ یانە بۆ ئەوەی سەیری یاری بکەن‌و هەندێ گۆڤارو ڕۆژنامەو کتێب دانرابوو بیخوێننەوە، بۆ یاریش کەڵك لە عبودی وەرئەگیرا کە پاڵەوانێکی ئەو سەردەمەبوو. لەگەڵ چەند پاڵەوانێکی کەدا ئەبووە زۆرانبازی. دوای یەك دوومانگ توانرا گەورەترین ئاهەنگ پێك بهێنرێت بۆ هەموو یارییەکان‌و سەرۆکی یانەی سەرەکی (ناصری غافقی) هات بۆ سلێمانی بۆ سەرپەرشتی یارییەکان، ئەمەش بووە فیستڤاڵێکی قەشەنگ‌و کەڵکێکی باشمان لێ‌وەرگرت هەرلەو کاتەدا خەڵکێکی زۆر بەشدارییان کردو بوونە ئەندام هەریەکەی بۆ یارییەك. ئێوارەیەك لە حەوشەکەدا خەڵکێکی زۆر ئامادەبوون. هەر کۆمەڵەی بە شتێکەوە خەریك بوون، مامۆستا گۆران لەگەڵ هۆگری کوڕیدا کە ئەندامی یانەبوو هاتن، خەڵکەکە کە دییان خرۆشان‌و دەستیان کرد بە چەپڵەلێدان‌و هوتاف کێشان کە ئەوە شکاندنی یاسای یانەبوو، بەڵام غروری برادەران‌و خۆشەویستی مامۆستا ئەوەی پێکردن باش بوو برادەران زۆر زوو فریاکەوتن‌و کەشەکەیان بە چەشنێکیکە گۆڕی. هەرچەندە ئەوکات‌و سەردەمە ڕێك‌وپێکییەکانمان پاك‌و بەهێز بوون دەنگ‌وباسمان نەئەگەیشتە دەرەوە، زۆرشت تحقیقات‌و پیاوەکانی پێیان نەئەزانی. بەڵام ڕۆژێك تۆفیقە رەشی معاونی تحقیقات لەگەڵ چەند پۆلیسێك دا خۆیان کرد بە ژووردا‌و هەڵمەتیان بردە سەر ژووری لێپرسراو‌و ژوورەکانی‌کەو هەموویان داخست‌و بە دەنگی بەرز هاواریان کرد ئەمە یانەی وەرزشە یا جێگەی کۆبوونەوەی شیوعییەکان، ئێمە ئەمانتوانی بەرگری بکەین، بەڵام هیچ شتێ نەکراو دانرا کە بەپێی یاسا لەگەڵیاندا بجوڵێینەوە. کەوتینە شکات‌و شکاتکاری‌و لە بەغداشەوە پشتگیرییان کردین، بەڵام هەر تحقیقات سەرکەوت‌و یانەکەیان داخست‌و هەموو پەرت‌و بڵاوبووینەوە. هەموو شتەکانیان داگیرکردین، بەزۆر هەندێکمان وەرگرتەوە تا بۆ جێگایەکی تر کەڵکی لێ‌وەربگرین. کە هەریەکە خاوەنی

تایبەتی خۆی هەبوو یا بۆی پەیداکرا. هەر لەم کاتەدا حزب هیچ ئامێرێکی چاپی نەبوو، پێویستییەکی زۆری بەو ئامێرانە هەبوو چونکە شت بە دەست ئەنوسرایەوە، بۆ ئەمە هەندێ برادەر بیریان لەوە کردەوە هەرچۆنێك بێت ئامێرێك پەیدابکەن، دەستیان خستە سەر ئامێرێکی چاپی دائیرەی معاریف کە بەرامبەر مزگەوتی گەورە بوو. ابراهیم شێخ رشیدو حەسەنی شێخ سعیدو سلامی مەلاسابیر هاتن (احمد عباس)یان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرت کە ئەوکاتە تەمەنی زۆر بچووك بوو لەش‌ولارێکی لاوازی هەبوو، ئێوارەیەکی درەنگ ئەیخەنە سەرشانیان‌و لە پەنجەرەیەکەوە ئەیکەن بە ژووردا‌و ئەچێتە خوارەوە مێزێك‌و کورسییەك دائەنێ‌و ئامێری چاپەکەیان لە پەنجەرەکەوە ئەداتێ‌و خۆشی رائەکێشنە سەرەوە بێ‌ئەوەی کەس بزانێ پەنجەرە دائەخەنەوە‌و بۆی دەرئەچن، ئامێر ئەبەنە ماڵی (احمد عباس)و دای‌ئەنێن بەمەرجێ لای حزبیش قسەناکەن، تادوای چەند رۆژێك ئەدەن بەسەر ماڵەکەداو ئامێرەکە ئەگرن.هەرسێکیان پێشەکی لەسەر ئەوە رێك کەوتبون کە بە ماڵی احمد بڵێن ئەمە دوو خزمی خۆمان هێناویانە بۆ فرۆشتن ئێمە نازانین چییە؟ هەر زوو ابراهیم‌و حسن خۆیان شاردەوە‌و احمد گیراو ئامێریان گەڕانەوە جێگەی خۆی، پاش چەند رۆژێکیش ئەوان گیراون‌و دران بە دادگاو بە ساڵێکیان حوکمدان، احمدیش کە منداڵ بوو بەریان دا. ئەمانە لە بەندیخانەدا هەڵوێستێکی خراپیان هەبوو، کە بەربوون بوونە پیاوی تحقیقات. بەم چەشنە حزب هەروەکو خۆی مایەوە نەبووە خاوەنی ئامێرێکی چاپ، هەر بۆ ئەم مەبەستە کاکم کەڵکی لە هاتنی عبدالرحمن زەبیحی (علما) وەرگرت کە هاتە سلێمانی‌و هەوڵی دروستکردنی ئامێرێکی رۆنیۆ بدەن. بۆ ئەمە ماڵی کاك محمودی خاڵە عبدالله‌مان بەکارئەهێنا بۆ دروستکردنی، منیش هەندێ جار پارچە ئاسن‌و تەختەو هێلمم بۆ ئەکڕین‌و بۆم ئەبردن. ئەوسا کچەکەیان تەمەنی چوارساڵان بوو (بێگەرد) توشی کێشەیەکی گەورەی کردین، دەستی بردبوو بۆ هێلمەکەو هەندێکی لێ‌خواردبوو بووە هۆی ئەوەی بە پەلە

بیگەیەنینە خەستەخانەو لای دکتۆرەکان بڵێین ئێمە دارتاشینو ئەم منداڵەمان هێلمی خواردووە، زوو فریایکەوتنو رزگاریان کرد، بە هەرجۆری بوو لە خەستەخانە توشی هیچ گرفتێ نەبووین. کاکمو زەبیحیش وازیان نەهێناو رۆنیۆیان تەواوکردو خستیانە کارو ناردیان بۆ حزب.

## چەند روداوێکی سەردەم

ئێمە ئەمانویست بەهەموو چەشنێ ئاگاداری برادەرانمان بکەنو فێری رەوشتی جوانو پەیوەندی هاوڕێیەتیان بکەینو دورکەوینەوە لە هەڵوێستی نەشازو دژ بە نەرێتی ئایینیو نەتەوایەتیو کۆمەڵایەتی میللەتەکەمان. لەو سەردەمەدا یەك دوو سینەما کرایەوەو چەند کەرەتێك لە بەغداوە کۆمەڵێ ئافرەتو گۆرانیبێژیان هێنایە سلێمانی، خەڵکەکە بەپەلەو هەڵپە بەرەو ئەو گۆڕانکارییە ئەرۆیشتنو ئەیانقۆزتەوە بەتایبەتی کە سینەماکانی فیلمی عەرەبیو بیانی هەمەڕەنگیان ئەهێنا. برادەرانمان دەورێکی باشیان ئەبینی بۆ ئاگادارکردنەوەو وریاکردنەوەی میللەت لەو جۆرە رەفتارانەو بەرەنگاری کردنیان. تا شەوێك لە سینەمای رشید کە تازە کرابۆوە ئەبوایە ناوی (سۆلاف)یان لێبنایە میری نەیهێشتو بەزۆر کرایە رشید فیلمێکی صباح ئیشی ئەکرد، لە فلیمەکەدا صباحی گۆرانیبێژو ئەکتەر نەخۆش ئەکەوێتو خەریك ئەبێ بمرێ، صلاحی برای (احمد) دەروێش دادی لە داخی ئەو خۆی ئەداتە بەرخەنجەرو لە نهۆمی سەرەوە خۆی ئەخاتە خوارێو ئەبێتە جەستەیەکی ساردەوە بوو. ئەمە بووە باسوخواسی هەموو ماڵێك. زۆر شتی لەم بابەتانە رووی ئەدا لە شەڕوگریانو هاواکردنو بوبووە دیاردەیەکی سەیر لەکاتی پیشاندانی فیلم دا، هەر ئەوکاتە مەسەلەی پێشکەوتنخوازیو دواکەوتوویی لەناو لاواندا بە زەقی لە گوێگرتنو وێنە هەڵگرتنی ئەکتەرو گۆرانی بێژەکاندا بەدەرئەکەوت. ئەوەی پێشکەوتنخواز بوایە (ام کلثوم و عبدالوهاب)یان خۆش ئەویست، بەرەکەی کەش (فرید الاطرش) و

هەندێکیکەیان لاپەسەند بوو. لەلایەکی کەوە برادەرانی ئێمەش بە هەموو تواناyanەوە بیروباوەڕی شۆڕشگێڕیو نەریتی نەتەوایەتی رەسەنیان بڵاوئەکردەوەو خەڵکیان فێری رەوشتی بەرزو خۆشەویستی نیشتمانیو رۆژنامەو گۆڤار خوێندنەوە ئەکرد تا کەڵك لەو کتێبو ئەدەبیاتانە وەربگرن کە ئەوسا دەرئەچوو. هەر لەم کاتەدا ئێمە توانیبومان تاڕادەیەك خۆمان بچەسپێنینو لە قوتابخانەکاندا قوتابیانی باش لە دەورمان گردبێتەوەو سەرکردایەتیان بکەین، زۆر بنکەو شانەمان لە قوتابخانەکاندا دروست کرد بە تایبەتی لەناوەندی سلێمانی کە زۆربەی قوتابیانی لەگەڵ ئێمە بوون یان پشتگیریان ئەکردین، باشترین شانەمان لەوێ بوبووە نموونەی جوڵانەوەو ئازایەتیو ئیشکردن. ئەوکاتە شانەکەی کاك فائق رشید مەلا احمد بوو کە پێکهاتبوو لە کاك عطا رشیدو صلاح حسنو اسماعیل ابراهیمو یەك دوو برادەری کە بێجگە لە هەندێ شانەو برادەرێکی کە وەکو فؤاد جلالو اکرم عمرو صادق صدیق کە دەورێکی باڵایان ئەبینی لە لیژانو شانەکانماندا.

هەموو کات بۆ رووداوێك ئەگەڕاین بیقۆزینەوەو بیکەینە هەرا، ئەوەبوو برادەرێکمان بەناوی اکرم اشرف پێی راگەیاندین کە لە بەشی ناوخۆیی لێپرسراوی بەشەکە بیگ مورتاحو مامۆستایەك ویستویانە سوکایەتی پێبکەن. ئەمیش لەدەستیان رایکردووەو ئازایانە بە برادەرانی خۆی لە بەشەکە راگەیاندو، هەر ئەوەندەی ئەم هەواڵە گەیشتە بەردەم ئێمە هەموو قوتابیانمان هوروژاندو کردمانە مانگرتنو هەڵمەت بردن بۆ دەرکردنی ئەو دوانە. ئەم کێشەیە چەند رۆژێکی خایاندو قوتابیان بەجۆرێکی رێکوپێك ئامادەکران، خۆشمان نەمانزانی بەو رەنگە هەڵمەت دەست پێئەکات، ئەو چەند رۆژە کەس نەچووە پۆلەوە هەرهەمووی لە حەوشەی قوتابخانەکەدا کۆئەبوونەوەو ئەبووە هوتاف کێشانو چەپڵە لێدانو ئیمزا کۆکردنەوە تاتوانرا ئەو دوانە لەبەشی ناوخۆیی دوور بخرێنەوەو ئێمە سەرکەوتنمان بەدەست هێنا. زۆر رۆژ برادەرانی نانەواو ئاسنگەرو قەسابەکان دەوروبەری

قوتابخانەیان ئەگرت بۆ پشتگیری کردنمان، ئەمە وایکرد یەکێتی قوتابیان زیاتر رەگ داکوتێ لەناو قوتابخانەکانداو ببێتە هێزێکی باش‌و رێکوپێك. لەم کێشەیەدا برادەران حسین عارف‌و فرج احمدو حسن حسین‌و وەهابی صالح کۆیی‌و فائق تۆفیق کەبابچی‌و زۆر برادەرانیکە دەوریان بینی چ بە نووسین‌و چ بە وتار خوێندنەوە لە کۆبوونەوەکاندا.

پاش ئەم سەرکەوتنە بەچەند رۆژێك هێشتا بەشی ناوخۆیی نەهاتبووە سەرخۆ قوتابییەکی خەڵکی قەراخمان هەبوو (ابراهیم )شەو نەخۆش ئەبێت لە بەشی ناوخۆیی ناگاتە لای پزیشك‌و خەستەخانە گیانی دەرئەچێت، بۆ بەیانی بە ئێمەیان راگەیاندو بووە هەراو دەست بەجێ چەند لافیتەیەك نوسراو دەستی تاوانمان خستە سەر رژێم‌و بەڕێوەبەرانی بەشی ناوخۆیی کە ئەم برادەرە لەسەرماندا رەق بۆتەوەو نەتوانراوە پێویستی بەشەکە بەباشی دابین بکرێت. تەرمەکەیمان وەرگرتەوەو بەهەموو قوتابخانەکانمان راگەیاند کە قوتابیان ئامادەبن بۆ بەڕێکردنی تەرمی برادەرەکەمان بەرەو قەراخ. برادەرانی دوکاندارو نانەواو شۆفێرو خەیات‌و هەموو چینەکانی شارمان ئامادەکرد کە لەگەڵمانداو لە دەوروبەرمان بن‌و ئاگاداریمان بکەن، بەمە بووینە. هێزێکی گەورەو زۆر، تەرمەکە رازێنرایەوەو بە گوڵ داپۆشراو بە لافیتەیەك بەناوی یەکێتی قوتابیانەوە خرایە سەرشان‌و بەهەموو گەڕەکی سەرشەقامدا بەرەوخوار بووینەوە بە هێمنی‌و لەسەرخۆو زۆربەی قوتابیان بەشداریان تێداکرد لەگەڵ خەڵکێکی زۆری سلێمانی. هەر کۆمەڵە یەکێکی بۆ دانرابوو لەپێشیانەوە هوتافی ئەکێشاو ناوناوەش برادەرێك لە وەستانی مەسیرەکەدا وتارێکی ئەخوێندەوە، هەر زوو برادەرانی حزب‌و دۆستانی لەپێش‌و پشت‌و دەوروبەری رۆیشتنەکەوە خۆیان ئامادەکردبوو بۆ هەموو هێرشێکی پۆلیس. بەڵام هیچ شتێك رووی نەدا تا گەیشتنە نزیك کانی ماسی کە لە خواری سلێمانییەوە یەك دوو کیلۆمەترێك دوور بوو، لەوێ بازنەیەکمان بەست‌و تەرمەکەمان داناو بە خوێندنەوەی وتارو هەڵبەست‌و هوتاف کێشان دژی

رژێم‌و پیاهەڵدان بە یەکێتی قوتابیان‌و تێکۆشانیدا، ئەمە کاتێکی زۆری بردەسەر تا چەند قوتابییەك‌و خزمانی برادەرەکە تەرمەکەیان بەرەو قەراخ برد. لەوێش پرسەیەکی تایبەتییان بۆ دانا. ئێمەش بە خۆپیشاندان گەڕاینەوە ناو شارو لەبەردەم قوتابخانەی ناوەندی سلێمانیدا وەستاین‌و سەرلەنوێ دەست کرایەوە بە وتار خوێندنەوەو هوتاف کێشان‌و بە شێنەیی بڵاوەمان لێکرد بێ ئەوەی هیچ هێرش‌و پەلامارێك رووبدات. بەڵام بۆ شەو تحقیقات هات، من‌و (لطیف توفیق خەزنەدارو وەهابی صالح کۆیی (خالد کریم)ی پورزای گرتین‌و لە گرتوخانەی پۆلیس دانراین بێ‌ئەوەی هیچ لێکۆڵینەوەیەکمان لەگەڵ بکرێت، تا نیوەشەو هەموومانیان بردە متصرفیەت کە خۆی ئەیویست بمانبینێ، نیوە شەو براینە ژوورەکەی کە ئەوسا جلال خالد بوو پیاوێکی باڵابەرزی چوارشانەی رووخۆشی دەم بە پێکەنین بوو. کەوتە وتوێژ لەگەڵماندا‌و وتی ئەو روداوە چۆن بووەو بۆچی بەو چەشنە ئەو تەرمە بەڕێ‌کراوە. ئێمەش کە زانیمان کەشەکە خۆشەو توندوتیژی تیادانییەو متصرف ئەیەوێت گوێمان لێ‌بگرێت، بە وردی بە بۆچونی خۆمان شتەکانمان هەموو بۆ باس کردو کەوتینە گفتوگۆیەکی راستەوخۆ لەگەڵیدا، بەڵام نەچووینە ژێر ئەوەی کە خۆمان چوبێتینە ناو خۆپیشاندانەوە، هەرهەمو وتمان ئەو شتەمان لە دەمی قوتابیانەوە بیستووە هەموو باسی ئەکەن، ئەو بەو قسانەی ئێمە باوەڕی نەبوو، بەڵام نەشی ویست ئازارمان بدات، بەو شەوە ناردی بەدوای ماڵی ئێمەدا باوکم لەوێ نەبوو (مامە مصطفی)م هات، کاك احمد خەزنەداری باوکی لطیف کە لە خەو هەڵیان ساندبوو بە پەشۆکاوی هات، کە هاتنە ژووری متصرف ئەیناسین، رێزی لێگرتن‌و بەخێرهاتنی کردن، دوای ئەوە کەوتە گفتوگۆ لەگەڵیانداو گلەیی ئەوەی لێکردن کە کوڕەکانیان ناخوێنن‌و خەریکی سیاسەتن‌و پێویستە ئاگاتان لێیان بێت‌و زۆر قسەی‌کە. لە گەرمەی قسەکردندا کاك احمدی باوکی لطیف هاواری کرد وتی جەنابی متصرف بەخوا من هیچ شتێ نابینم‌و لێت حاڵی نابم بۆ ئەم وتوێژە ناخەیتە بەیانی، ئێستاش نەختێ

لەو چاوە جوانەتم بدەرێ با بڕۆینەوە. ئیتر بووە پێکەنین و بەیەکداهاتن، متصرف پیاوێکی باش بوو تازە هاتبووە سلێمانی و حەزی لە پەیوەندی ئەم چەشنە پیاوانە ئەکرد و ئەیویست بیان دوێنێ و هاتوچۆیان بکات. کاك احمدیش باشی بۆ چوو بوو کە داوای نەختێ چاوی لێکرد، چونکە بەڕاستی جوتێ چاوی گەورەی گەشی پێوە بوو بە زەقی ئەبینرا و لە چاوە کزەکانی کاك احمد جیائەکرایەوە. مامیشم هەندێ قسەی خۆشی لەگەڵ کرد، پاشان بەو نیوەشەوە هەموومانیان بەرداو گەڕاینەوە ماڵێ بێ ئەوەی دادگاییمان بکەن. ئێمەش بۆ بەیانی هەر وەکو جاران چووینەوە قوتابخانەو لای کەس ئەم گرتنەمان باس نەکرد، تەنها لای چەند برادەرێکی نزیك خۆمان نەبێت.

لەم سەردەمەدا شەڕی کۆریا دەستی پێکردبوو، ئێمە هەموو هێزمان بەکارئەهێنا بۆ پشتگیری کۆریای شمالی کە شیوعییەکان پێشڕەوییان ئەکرد و هەندێ کۆبوونەمان سازکرد بۆ ئەم پشتگیریە. زۆر نوسراومان دەرکرد، هەموو رۆژێ لەکاتی رۆژنامە هاتندا ئەبووە مشتومڕێکی زۆر لەسەر دەنگوباسەکان. بەڵام لەمانە هەمووی بەهێزتر هەڵبەستەکەی مامۆستا گۆران بوو کە ناردبووی بۆ میللەتی کۆریا بەناوی (لاوکێ بۆ کۆریای ئازا). ئێمە بە دەیەها نسخەمان لێ نوسییەوەو بڵاومان کردەوەو زۆر بایەخمان پێدا. هەرخۆشی لە خۆیدا گەورەترین و جوانترین بۆچوون بوو لەو کاتەدا. کە بووە جێگەی شانازی و پێزانینی هەموو میللەت لە پشتگیری ئێمە بۆ میللەتێکی دوور دوور لێمانەوە کە تەنها برایەتی و دۆستایەتی ئێمەی بەیەکەوە بەستبوو، لەهەمان کاتدا بووە دەرخستنێکی گەورە بۆ مامۆستا گۆران کە نیشتمانپەروەری لێهاتووەو دڵی بە میللەتان ئەسوتێ و پشتگیری لە تێکۆشانیان دەکات، ئێمەش ئەمانویست بایەخ بەم لایەنە بدەین و بیکەینە روویەکی ئاشکرای حزب. بۆ پشتگرتنی ئەم بۆچوونەمان بووە بڕیارێکی حزبی کە ئەبێت مامۆستا گۆران هەموو ئێوارەیەك لەگەڵماندا بە پیاسە سەرانسەری شەقامی مەولەوی ببڕێت و لە هەندێ چایخانەدا دانیشین و گفتوگۆ لەگەڵ خەڵك و دوکاندارەکاندا بکەین، ئەمە

تاڕادەیەك سەرکەوتوو بوو، کەڵکێکی باشی هەبووە بۆمان. کە بە ئاشکرا دەستمان ئەخرایە سەر کە ئەوەتا لەناو میللەتداین و خۆشی و ناخۆشی بەیەکەوە ئەبەینە سەر. لەمەشدا برادەرانی پارتی رۆڵێکی باشیان هەبوو، لەم بۆچوونانەماندا بەشداریان ئەکردین بەتایبەتی محرم محمد امین و حەمەی احمدی طە و حلمی علی شریف و عبدولی سوران و قادری حاجی حسین و حسەڕەشی خەیات کە دوکانەکەی بوبووە جێ نیشنی تایبەتی هەمووان.

لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەم دەوروبەرەدا ئێمە زیاتر جەختمان لەسەر پاراستنی نهێنییەکان و بە رێك وپێکییەکان دائەنا کە ئەمانویست ئەو کۆمەڵە برادەرانەی هەمانە پارێزگاری بکەین و هەموو بەیانییەك کۆمەڵێ بەیان بەناوی حزبەوە بە کۆڵانەکان و شوێنە گشتییەکاندا بڵاوئەکرایەوە و داوای لە میللەت ئەکرد هەستن راپەڕین بکەن، خۆپیشاندان بکەن، کە ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بە ئێمەوە نەبوو، کەوتینە گومانەوە کە ئەمە ئەبێت دەستی تحقیقاتی تێدابێت بۆ گرتنی هاوڕێیانمان و شڵەژاندنی رێکوپێکییەکانمان. کاك کمال داوای لێکردم ئەبێت ئەم دیاردەیە بدۆزرێتەوە، هەرچەندە بە برادەرانمان راگەیاند لەو جێگایانە دوورکەونەوە بەڵام وای لێهات بەیانییەکیان راستەوخۆ بەیانەکانیان بۆ ئێمەش ئەنارد. بۆیە هاتینە سەر ئەو بڕوایەی هەندێ لە برادەران پەیوەندییان بەم کارەوە هەبێت و ئەم شتانە بکەن، کە لە حزب دوورخرابوونەوە هەریەکەی لەبەر هۆیەك. بەڵام دوای بینینیشیان بۆمان دەرکەوت کە ئەوانیش نین، تا من پەیوەندیم کرد بە کاك نوری حەمە علییەوە و کەوتینە دوان لەسەر ئەو کێشەیە و چارەکردنی بۆ بەرژەوەندی حزب، بەڵام هیچ نەچووە ژێری و ئێمەش لەومان نەگواستەوە و سەری دەزوویەکمان دۆزیبۆوە. تا کاك نوری پێی راگەیاندین کە ئەم بەیانانە کاك (احمد عباس)ە و ئەویش هەندێ یارمەتی ئەدات، کاك احمد عباس دۆستی هەموو لایەکمان بوو کوڕێکی باش و لێهاتوو بوو حزب و جووڵانەوەی خۆش ئەویست و خراپەی لێنەئەوەشایەوە بەتایبەتی هیچ شتێکی لە من و کاك کمال

نەئەشاردەوە، ئەمەمان بە شتێکی سەیر دانا. هەرچەندە لە حزب دوور خرابۆوەو بەکاری خۆیەوە خەریك بوو، ئێمە لێمان رانەئەبینی بێتەوەو ئیشمان بۆ بکات بۆیە زیاتر لێی دوور بووین، کاتێ کاك کمال منی نارد بینیم بە زەقی شتەکانم خستە بەردەمی دانی نا بە هەموو شتەکاندا وتی هەر لە خۆمەو بە تەنها ئەمە ئەکەم کە ئاگاداربن بمدۆزنەوە تا لە حزب وەرم نەگرنەوە بەردەوام ئەبم و زیاتری ئەکەم. ئەمە هەڵوێستێکی سەیر بوو، ئەم هەموو شتەی ئەکرد بۆ ئەوەی لە حزب نزیك کەوێتەوەو وەربگیرێتەوەو رۆڵی خۆی ببینێ.

ئەمانەم هەموو بۆ کاك کمال گێڕایەوە، بڕیارياندا لەمەودوا لە حزب وەربگیرێتەوەو من ببینمو ئەویش هەموو جموجۆڵێکی بۆ حزب بەکاربهێنێ، جا لەگەڵ ئەو هەموو ئیشوکارەی هەم بوو ئەوەشی هاتە سەر کە زۆر پێوەی هیلاك ئەبووم چونکە هەردەم ئیشی لێمان ئەویستو زۆر ئەجولاو دەوروپشتێکی باشی بۆ خۆی دروستکردبوو، لە برادەرانی ئیشکەرو بە جوڵەکە دوایی توانرا کەڵکێکی باشیان لێوەربگیرێتو ببێتە پشتێکی باشی حزبو جوڵانەوەو میوانی هەموو بەندیخانەکانی سەرتاپای عێراق شان بەشانی هاورێیانی تری حزب.

یەکێتی قوتابیان لەدەمێکەوە رێکوپێکی خۆیان هەبوو، لیژنەی شاریان هەبوو، رۆژنامەیان هەبوو، هەموو سەری مانگێك بە رێکوپێکی دەرئەچوو، کە کاك عزالدین مەلا مصطفی دەورێکی باشی تێدا ئەبینی لەگەڵ حسین عارفو جلالی میرزا کریمو هەندێ برادەری تر کە پەیوەندییان لەگەڵ بەغدادا پەیداکردو ئیشەکانیان ئەبردەسەر. ئەوەمابوو بیر لەوەکرایەوە بۆ لاوانیش یەکێتییەك دابمەزرێتو پەیوەندی لەگەڵ بەغدادا رێك بخات کە لەوێ لیژنەی باڵای هەبوو هەموو کارێکی هەڵئەسوڕان. لە سلێمانی توانرا پێشەکی لیژنەی شار دروست بکرێتو بەیانێك دەربکات بۆ ئەوەی لاوانی لە دەور کۆبێتەوە، چونکە رێکخراوێکی لا حزبیو دیموکراتیەو بۆ هەموو کەس هەیە پەیوەندی لەگەڵ دروست بکات. لیژنەی شار لە یەکەم جاردا دروست بووبوو لە برادەران

حەمە صالح دیلان - فائق رشید حسین- مامۆستا عمر کریم (کەریمی چایچی) کە تازە لە پارتییەوە هاتبووە ریزی حزب، کاك علی حسین جاف کە نوێنەری هەڵەبجە بوو، منیش ئەندامی لیژنەکە بووم کە نوێنەری یەکێتی قوتابیان بووم، لەگەڵ چەند برادەرێکی‌کەدا ئیشەکان بە رێکوپێکی جێ‌بەجێ ئەکرا. توانرا زۆربەی گەڕەکەکانی سلێمانی لیژنەی گەڕەکی لێ‌دروست بکرێت‌و ئەوانیش چەند شانەیەك بە خۆیانەوە ببەستن. برادەرانی باشی لەدەور کۆبۆوە، بەڵام هەر لەوانەی دۆستی حزب بوون‌و حزبیان خۆش ئەویست، نەیتوانی لەو تەوەرەیە دەرچێت‌و پەل بهاوێت بە چەشنێکی گونجاو. هەرچەندە لەلایەکەوە هەوڵ ئەدا لەگەڵ برادەرانی پارتیدا رێك بکەون‌و چەند کەسایەتییەکیان بێنە ریزی لاوانەوە. بەڵام سەری نەگرت‌و بەوە قایل نەئەبوون کە بێنە رێکخراوی سەر بە رێکخراوی عێراقییەوە. بەڵکو ئەبێت رێکخراوێکی کوردستانی بێت بەمانای ئەوەی هەر لەو گۆشەگیرییەدا مایەوە کە ئەبوایە لە حزبەوە سەرپەرشتی بکرایە. بەڵام پاش چەند مانگێك توانیان هەنگاوی گەورە بێنن‌و نەختێك بەرو ئاشکرابوون بڕۆن‌و لاوانی غەیرە حزبیش لە دەوریان کۆبێتەوە، لەگەڵ ئاشتی‌خوازان‌و یەکێتی قوتابیان‌و یەکێتی نەقابەکاندا کەلەوان کۆنتر بوون دەورێکی مام ناوەندی ببینن لە جموجۆڵەکانی ئەوسادا. زیاتر کەڵکیان لە رۆژنامەی ژین ئەبینی بۆ نووسینی هەندێ شت‌و بەستنی چەند کۆبوونەوەیەکی بچوك لەماڵان‌و دەشت‌و دەورووبەری سلێمانی کەحەمە صالح دیلان رۆڵێکی باشی تیادا دەبینی‌و بەگێڕانی ئاهەنگ‌و سازدانی یاری پاڵەوانێتی لە لایەن برادەرانمانەوە، رۆژێکیان هەرهەموومان لە سەرچنار دانیشتبووین بۆ قسەی خۆش‌و نوکتەو گۆرانی، بازنەیەکمان بەستبوو، هەندێ برادەری تەمەن بچوکمان لەگەڵدا بوو کەوتنە ناو باخەکانەوە بۆ میوە ڕنین، ئەوکاتە میوەیەکی زۆر بەدارەوە بوو، پیاوەکانی تۆفیق قەزازیان لێشێواندین‌و هاتنە سەرمان‌و هەموو چەك بەدەست بوون ئێمەیان خستە بەر شاڵاوی قسەو هێرش بردنە سەرمان‌و خەریك بوو کێشەکە گەورە بێت،

برادەرانمـان لێیـان هەسـتانە سـەرپێ و چـوون بـە گژیـاندا. لەوکاتـە تەنگوچەڵەمەیەدا تۆفیق قەزاز خۆی هاتە ناو کێشەکەوە کە لە دوورەوە گوێی لێبوو، زۆر بە هێمنی و لەسەرخۆ لەگەڵ ئێمەدا کەوتە قسەو لەگەڵ پیاوەکانی خۆیدا کەوتە هاوارهاوار بەسەریانداو وتـی ئێوە بە کـەرێتی خۆتـان هـەموو شتێکتان لەمن تێکدا، ئەوە سەعاتێە گوێم لە دەنگی کاك حەمە صالح دیلان گرتـووە خواخوامـە بێدەنـگ نـەبێت ئێـوە لێتـان تێکـدام، من چـەند سـاڵێکە بەتەمای گوێ گرتنێکی ئەم دەنگەم، لە جێگەیەکی وادا نـەبێت ناهێڵێ گوێم لێبێت، بۆیە بڕۆن دوورکەونـەوەو میوەیان بۆ بهێنن و ئاگاتـان لێیان بێت تـا ئەڕۆنەوە. ئێمـەش ئـەوەمان پـێ خۆش بـوو داوای دانیشـتنمان لێکـرد لەسـەر بەردێ هەڵتروشکاو چایەکیان بۆ برد، بەڵام هەر خۆی دواخست و نەئەڕۆیشت، وا بەتـەما بـوو حەمـە صـالح شـتێ بڵـێ هـەر گـوێی لێنـەبوو. خـۆی بـاش قیرسیچمەیی حەمە صالحی ئەزانی لێ‌داو دوعا خوازی لێکردین و وتـی ئێرە ماڵی خۆتانەو هەموو جارێ لـێرەبن. منیـش و پیاوەکانیشـم لـە خزمـەتتاندا ئەبین. نـائب عبداللەمـان لەگـەڵدا بـوو سـەیرێکی حەمـە صـالحی کـرد و ویسـتی سەربکاتە سەری و پێی وت ئەبوایە شتێکت بۆ ئاغا بوتایە، حەمە صالح تەنها بە سەیرکردنێك وەرامی دایەوەو تورە نەبوو. نائب دوورکەوتـەوە. ئەم شتانەو زۆر جموجوڵی کە لاوان پێی هەڵئەستان کە هەندێ جاریش مامۆستا گۆران و حەمـەی احمدی طەو برادەرانـی تریشمان لەگـەڵدا ئـەهاتن، علـی فـەوتاویش هەندێ جار بە دەنگەخۆشەکەی گۆرانـی بـۆ ئـەوتین و سـەریشـی ئـەکردە سـەر حەمـە صـالح دیـلان و هـەندێ لـە بـرادەران. هـەر لـەم کاتەشـدا بـوو ئەگـەر مێژووەکەیم لێتێك نەچووبێت، ئاشتی خوازان هەستان بە ئیمزا کۆکردنەوە بۆ جێگیربوونی ئاشـتی و هـەندێ داواکـاری تـر. زۆربـەی ئیمزاکـان لای حزبـی گرتبۆوە. کە بینێرین بۆ بەغدا بۆ جێگەی خۆی. ڕۆژێك کاك فتـاح فـرج لـە کۆڵانـی ئـەوقاف دا بوخچەیـەکی پێ ئـەبێت، شـکی ئەخەنـە سـەرو پۆلیسـی تحقیقات بە کۆڵانەکەدا راوی ئەنێن، ئەویش زۆربـەی شـتەکانی لێ ئەکـەوێت،

بـەڵام خـۆی بـۆی دەرئـەچێت، تحقیقـات هـەمووی کۆئەکاتـەوە، کەیـەکێك لەوانەئیمزاکان ئەبێت. بۆ شەو هەموویان ئەگرن‌و بەرەو بەندیخانەیان ئەبەن. ئەمەش کێشەیەکی گەورەی بۆ دروست کردین‌و بووە هۆی تێکچونـی زۆربـەی رێکوپێکییەکانمان‌و دوورکەوتنەوەی زۆر لە برادەرانی ئێمە. کە کاتێکی زۆری ویست بێینەوە سەر خۆمان. هەر لەم کاتەدا کاك لطیف مصطفی بە کۆمەڵێ بەیان‌و نامەی حزبییەوە لە رێگەی کرکوك گیراو بە یەك دوو ساڵ حوم دراو هاوڕێ (کمال کریم)یش لە سلێمانی نەما، وابزانم چوو بۆ بەغدا بۆ خوێندن، هەر من‌و عمر اسماعیل ماینەوە، ئەویش لەلایەکی‌کەوە پەیوەندییان پێوەکرد. برادەرێکی کە هات منی بینی کە تازە هاتبووە سلێمانی‌و بوبووە لێپرسراوی یەکەم‌و ناوی هاوڕێ (تۆماشابا) بوو برادەرێکی لەسەرخۆو باش بوو لەگەڵ ئەوەشدا هێندە خوێندەواری نەبوو. بەڵام تا رادەیەك ئیشی ئەبرد بەڕێوە، زۆر کەڕەت گوێی بۆ بۆچوونـی برادەرانـی شـل ئـەکردو هـەندێ جاریش ئـەبوو بگەڕایەتەوە بواری ئەو چـەند بـرادەرەی لەگـەڵیدابوون، بـەمانای ئـەوەی کـە خـەڵکی سـلێمانی نـەبوو، لـە زۆر کێشـەی نەئەزانی‌لەسـەرەوە دایـان نـابوو ئیشوکاری ئەم شارە گەورەیە جێبەجێ بکات، ئەویش هەرئەوەندی پێ ئەکرا. نـازانم بۆچـی سـەرکردایەتی ئـەوەندە بـیری لـەوە ئـەکردەوە کـادر لـە دەرەوە بهێنێ‌و کاروباری بداتە دەست کە ئەوە دیاردەیەکی ئاشکراو خراپ بوو لە رێکوپێکیدا. مـن تـا ماوەیـەکی زۆر هەرچـەندە گـەورەترین رێکوپێکیـم پێـوە بەسترابوو هەر بە تەنها لەگەڵ ئەودا مامەوە کە زۆر کەڕەت دەوری هەیئـەتێکی بەرزی شارمان ئەبینی‌و هـەموو شـتێکی لەگـەڵمدا بـاس ئـەکردو بـە جووتـە کارمان ئەکرد.

هـەر لـەو سـاڵەدا بـوو کـە توانـرا زۆربـەی نەقابـەکان دابمـەزرێنرێ‌و ئیشوکاریان رێك بخرێت، نەقابەی شۆفێرەکان قادر رشید ناسك سەرۆکی بوو، نەقابەی نانەواکان احمد مارف‌و نەقابەی خەیاتـەکان نـائب عبدالله‌و نەقابەی مەلاریا‌و سەرتاشەکان‌و بەقاڵەکان‌و زۆر پیشەی‌کە هەموو بەیەکەوە یـەکێتی

نەقابەکانی سلێمانیان دروست ئەکرد. هەرلەو کاتەدا گەورەترین کێشە لەبەینی بەقاڵەکان و قەسابەکاندا روویدا کە خەریك بوو چەند کەسێکی تێدا بکوژرێت، لە ماڵی ئێمە بە سەرۆکایەتی باوکم و چەند برادەرێکی کە کێشەکەیان چارەسەر کردو ئاو کرا بەسەر ئاگرداو ئەو ئێوارەیە هەموو لەسەر خوانی ماڵی ئێمە میوان بوون، ئەمەو زیاترو باشتر ئێمەو برادەران بوینە جێگەی بڕوای هەموو لایەك. نەقابەکانی سلێمانی لە زۆربەی کێشەکانی شاردا خۆیات تێ ئەگلان و جاروبار کۆتاییان پێ ئەهێنا و هەموو لایەك رێزی بۆ دائەنان. لەگەڵ ئیعاشەو خاوەن گەراج و قەساب باشەکان و بەقاڵە گەورەکان بەینیان خۆش بوو. نەقابە بە جۆرێکی سەیر دروست کرابوو، چونکە کارگەیەکی گەورەو پڕ کرێکار نەبوو، بە وەستاو شاگردو بەردەستەوە هەموو رێك ئەخران و گوێڕایەڵی بڕیاری سەرەوە بوون. خۆی هەر لەخۆیدا قوتابخانەیەکی گەورە بوو بۆ حزب کە برادەرانی تیا گۆش ئەکراو هەموو بۆچوون و بیرکردنەوەیەکیان هەروەکو هاوڕێیانی حزب بوو، بەو جۆرەش لەگەڵیاندا ئەجووڵانەوە. رێکوپێکی و پەیوەندی لەسەر بناغەی خەلیەی حزبی بوو، ناوەندێکی توندوتۆڵ و بەهێز هەبوو، کۆبوونەوەو یەکتربینین و نامە گۆڕینەوەو ئیشوکاری رۆژانە هەرهەمووی بەشێوەی هەرەمی ئەچوو بەڕێوە، تێکۆشانی رۆژانەیان هیچ لە یەکتر جیا نەئەکرایەوە.

رۆژێك دەنگ بڵاوبووەوە کە هەندێك بازرگانی دانەوێڵە ئەیانەوێت گەنم و جۆ بەرن بۆ بەغدا، حزب ئەمەی قۆستەوەو کردییە خۆپیشاندان و هەموو برادەرانمان لەبەر مەیدانی ماستەکە گرد کردەوە لە چایخانەی کاکە سورو چایخانەی حاجی صالح و مزگەوتی خومخانەکان و دەوروبەری حەمامی سورەت و دەبۆکە، لەوکاتەشدا چەند لۆرییەك لەبەر دوکانی سعید صالح دا لە تەنیشت (ئاشی گاورەکە) وەستابوون بۆ گەنم بارکردن، یەك دوانێکیان پڕکرابوون ئامادەی رۆیشتن بوون. خۆپیشاندان دەستی پێکرد و هەڵکوترایە سەر لۆرییە گەنم و جۆکان، لەپێش هەموومانەوە علی حاجی عبداللە

(بۆسکانی)و سعیدی گەوهەرو عبدالرحمن هەلاج و احمدی مارف و حمە رشیدی احمد شانەو حەمە امینی ئاسنگەر (کاوە)و عثمانی ئاسنگەرو نائب عبداللهو زۆر لە برادەرانی کە، بە چەقۆو خەنجەر فەردەکانیان دڕاندو تەلەفۆنی خاوەن دوکانەکەیان شکاندو بووە شەڕ لەگەڵ پۆلیس دا دوایی پاشەکشێ کرا بۆ کۆڵانەکانی ئەو ناوەو چەند برادەرێك گیران. عبدالرحمانی هەلاج لەو راکردنەدا لە سەربانی ماڵێك ئەکەوێتە خوارەوەو قاچێکی ئەشکێ و ئەبێتە ئەوڕەحمانە شەلی هەلاج و هەر بەو ناوەوە ئەناسرا، بەڵام سەری چەند پۆلیسێك شکا. ئەمە بووە ئەوەی کە شیوعییەکان بەتەواوەتی و بە چەشنێکی باش لەلایەن میللەتەوە سەیر بکرێن و بە پارێزگەری بەرژەوەندی خەڵك دابنرێن، لەم ماوەیەدا زۆر شت کرا، هەربە هەڵمەتی حزب و برادەرانی نان هەرزان کرا، نرخی جل وبەرگ دانرا، کرێی ئۆتۆمبێل شکێنرا، میوە هەرزان بوو، شەڕو ئاژاوەی بەینی نوێژەکان نەما، هەر هەفیتەیەك رۆژێك بۆ پشوو دانرا، کۆمەڵی نابینایان دروست کرا کە لەلایەن (جلالی میرزا کریم و حسین عارف و صلاح احمد)ەوە سەرپەرشتی ئەکران. بەهۆی خاڵمەوە (مەلا تۆفیق)و حاجی ابراهیم و مەلا محمودی گەچ و مەلا عبداللەی عەزە مامەوەو مەلا مصطفی عبدالرحمن باڵخی و چەند مەلایەکی‌کەوە قوتابخانەیەکی بچوکیان بۆ کرایەوە بۆ فێربوونی خوێندن بە هۆی نووسینی (برایل)ەوە کە بە پەنجە ئەیانخوێندەوەو پیتەکانی لەڕووی کاغەزەکە بەرزتر بوو. ئەمە نووسینێکی جیهانی بەربڵاو بوو ئێمەش لێرە بەکارمان هێناو توانرا زۆربەیان فێری ئەم نووسینە بن و کەڵکی لێوەربگرن. لەسەرێکەی تریشەوە ئێمە بووینە خاوەن دۆستێکی زۆر، لەناو ماڵ و خەڵك و مزگەوتەکاندا پشتگری تەواویان لێئەکردین. ئەمانەو زۆر شتی کە دروستکرا بە هیممەتی برادەری باش و رۆشنبیر کە ئەمانویست جوڵانەوەکەمان بەرەو ئاشکرابوون و رێگەی دیموکراتیانە بچێت. بەڵام زۆربەی ئەم ئیشانە لە بۆچوونی هەندێ برادەرەوە دوور بوون کە کاربەدەست و خاوەن بڕیاریش بوون.

کاتی تاقیکردنەوەی قوتابخانەکان، ئێمەی قوتابیان گەیشتبوینە باوەڕێك کە یەکێتی قوتابیان ئەبێت پارێزگاری لە بەرژەوەندی هەموو قوتابیان بکات، هەوڵی یەکەمی پێشخستن و سەرکەوتنی خوێندن بێت و قوتابیان بەم جۆرە رابهێنرێت. هەر لەم گۆشەیەوە بڕیارماندا کە مانگێك پێش تاقیکردنەوەی گشتی زۆربەی کۆبوونەوەو ئیشەکانمان رابوەستێنین بۆ ئەوەی رێگە لە کۆششی قوتابیان نەگرین و بینینی رۆژانە کەم کەینەوە، قوتابیان خەریکی دەرس و دەور بن. بێئەوەی ئیشی یەکێتی تەگەرەی تێبکەوێ و بوەستێ، ئەمە بووە کێشەیەکی گەورە بۆمان لای حزب و هەندێ هاوڕێ، هەمووشی بەرۆکی منی گرتەوە بووە هەرامان لەگەڵ هاوڕێ (تۆما)دا کە سور بوولەسەر ئەوەی ئێمە بڕیاری حزبمان شکاندووەو لەخۆمانەوە ئەم ماوەی پشووەمان داناوە ئیشی حزب ئەوەستێ، هاوڕێ تۆما هاوڕێیەکی باش بوو رێگەی وتوێژی زۆری ئەدا بەڵام بەگوێ‌ی‌دا نەئەچوو مانگێ ئیش بوەستێ بۆ بەرژەوەندی قوتابیان و ئەو بە گەورەترین هێزی دائەنا بۆ جموجۆڵی حزب، هەمیشە ئەیووت قوتابیان بڕبڕەی پشتمانن. هەرچەندە تێم گەیاند ئەمە شتێکی زۆر ئاساییەو لە هیچ شتێ دوورمان ناخاتەوەو هەموو قوتابیان پێیان باشەو پشتگیری ئەکەن. پێشنیاریشم بۆکرد کە ئەبێ لەگەڵ قوتابیاندا کۆببێتەوە، بەڵام لاگوێ‌ی خست و ئیشەکەی ئێمەش چووە سەر. قوتابیان ئەم هەلەیان قۆستەوەو کەوتنە کۆشش کردن بۆ خۆئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوەکانیان بێئەوەی ئیشی یەکێتی و حزبیش بوەستێ و توانرا هەردوولا بەیەکەوە ببەسترێت، بەڵام هەردەم ئەیدایەوە بەچاوماندا کە تێکۆشانی قوتابیانم لەهی میللەت جیاکردۆتەوە، هەر ئەوەندەی لێ تێگەیشت بوو. بۆیە من لای خۆمەوە چووم هاوڕێیانم بینی و مەسەلەکەم بە دوورودرێژی بۆ باس کردن و هەمووشیان گرنگیان دا بە بۆچوونەکەمان بەتایبەتی حەمە صالح دیلان و گۆران و تا ڕادەیەکیش وەستا عبدول و چەند هاوڕێیەکی کە.

تا کاتێکی زۆر ئیشەکانمان باش ئەڕۆیشت بەڕێوەو هیچ گرفتێکی

ئەوتۆ بەرەنگارمان نەئەبۆوە. كە ببێتە كۆسپ لە ڕێگەماندا. بەڵام هەر بەو چەشنەش نەبوو كە ببێتە ئەو هێزەی كە خۆمان ئەمانویست لەگەڵ قەبەیی جموجۆڵەكانماندا بگونجێ. هەرچەند هەندێ گیروگرفتمان هاتە ڕێگەو تارادەیەك كەموكوڕی خستە ئیشەكانمانەوە، ئەویش ئەوەبوو عبدالرحمن مەلا تۆفیق كە دوكانەكەی لە كانێسكان بوو بە كۆمەڵێ كتێبو بەیاناتەوە گیراو زۆربەی بەشێك بوو لە مەكتەبەی حزب، صابر مصطفی (صابرە لوتە)ش لەگەڵ چەند برادەرێكدا گیرا، هەر لەوكاتەدا یەك دوو براەری نانەوامان گیران كە ڕێكوپێكییەكی زۆریان پێوە بەسترابوو ڕێكخەرەكەیان برادەرێكی قوتابی بوو ناوی هێنا بوون. ئەم كۆمەڵەش عبدالله میدیای لەگەڵ گیرا، ئەویش بەشێكی زۆر كتێبو بەیان نامەی لاگیرا. لەكاتی تاقیكردنەوەشدا لە قوتابخانە پۆلیس هات لە ژووری تاقیكردنەوەدا منیان گرتو بەدەست بەستراوی بردمیانە دەرێ بەرەوماڵەوە بۆ پشكنین، بەڵام هیچیان نەدۆزییەوەو بەرەو بەندیخانەی سەرەوە برام، كە عبدالرحمن تۆفیقو برادەرانی نانەواو چەند هاوڕێیەكی هەڵەبجەیی لێبوو لەگەڵ عبدالله میدیا كە جێگەی بۆ چاكردمو لای ئەو مامەوە، بەڵام بەهیچ جۆرێك نەئەچووە ژێری چۆن گیراوەو چی گیراوە، منیش ئەم ئەناسیو لە ڕێكوپێكیدا هیچ ناویم نەبیستبوو، وادیاریش بوو شتەكان هەمووی هی صالحی برای بوو كە برادەرێكی پێشكەوتوی ئێمە بوو. لە بەندیخانەدا بووم وتیان هاوڕێ (تۆما) لە سلێمانی نەماوە، ئەمەش بووە هۆی زیاتر تێكچوونی ڕێكوپێكی. بەڵام وادیاربوو وەستا عبدول بە تەنها مابۆوەو هەموو برادەرانی بە فەردی ئەبینیو هەروەها ئەوانیش یەكتریان ئەبینی، من یەك دوو هەفتە مامەوەو بەربووم. پاش هەندێ حەوانەوە دەستم بە ئیشكردن كردەوەو هاوڕێ اسماعیل ئەهات بۆ لامو ئەیبینیم، تا لیژنەی شاری سلێمانی تازەیان پێكهێنایەوەو بوومەوە بە ئەندام لەو لیژنەیەداو كەوتینەوە جموجۆڵی تازە.

## لیژنەی ناوچەی سلێمانی و کاری نوێ

لە سەرەتای ساڵەکانی ١٩٥٢ ڕێکخراوەکانی حزب لە سلێمانی گەشەو پێشکەوتنێکی بێهاوتای بەخۆیەوە دی، لە ڕۆڵی بیروباوەڕو چۆنایەتیو ڕێکوپێکییەکانییو گردبوونەوەی کۆمەڵێکی باش لە ڕۆڵەی بە جەرگی خەڵکی سلێمانی لە پشتگیرو پاڵێوراوو ئەندامو دروستبوونی هەیکەلێکی ڕێکوپێکی بەربڵاو لە لیژانو شانەو ڕێکخراوە دیموکراتییەکانو جەماوەرێکی زۆری سەر بە حزب.

لەم گڕوکڵفو هەڵچوونو داچونەدا ئەبوایە نەختێ بەخۆماندا بچوینایەتەوە لەڕووی سەرکردایەتی کردنو بەڕێوەبردنی کارەکانمانەوە، ئەوەبوو یەکەم هەنگاو کە بیری لێئەکرایەوە پتەوکردنی لیژنەی ناوچەی سلێمانی بوو کە توانرا فراوان بکرێ بە هەڵبژاردنی هاوڕێ نەژادی احمدی عزیز ئاغا کە تازە گەڕابووەوە سلێمانیو خەسرەوی تۆفیق ئاغا فتح الله بۆ ئەندامێتی لیژنە، کە بێجگە لە خۆم هاوڕێیان احمدی مارفو عمرو لەتیفی نانەواو هاوڕێ کمال محمودیش بە ئیشوکاری ڕێکخەری هەڵدەستا. هەفتەی جارێك کۆبوونەوەمان هەبوو، جگە لە یەکتری بینین بەتایبەتی منو کاك نەژادو خەسرەو کە بە ڕاستی دەورێکی باڵایان هەبوو لە پێشخستنی ڕۆڵی ڕۆشنبیریو بیروباوەڕی حزب دا، کە گۆڕانێکی گەورەو بەهێزی بەسەردا هات لە چۆنایەتی جوڵانەوەی دیموکراتیو بیروباوەڕی نەتەوایەتیو کردنەوەی دەرگایەکی گەورە لەم دەروازەیەوە، بەتایبەتی کاك نەژاد کە لە بەیروتەوە بە کۆمەڵێ بۆچونی نوێوە هاتبۆوەو زۆرجاریش لەگەڵ بۆچوونی حزب دا نەئەگونجا. بۆچونی سەرەکیمان ئەوەبوو کە ئەو قۆناغەی ئێمەی تێداین، قۆناغی دامەزراندنی حکومەتێکی دیموکراتی میللییە. هەروەها کێشەی نەتەوایەتی بخەینە پێش هەموو کێشەکانەوەو بەستنەوەی بە تیکۆشانو بەرژەوەندی چینی کرێکارو فەلاحەوە، لەگەڵ هەوڵدان بۆ چەسپاندنو ئاشکرا کردنی ڕێکخراوە دیموکراتییەکان. هەر ئەمە بوو پاڵی بە ئێمەوە نا هەموو پیشەیەكو توێژێك یەکێتییەکی بۆ دروست بکەین، وەکو لاوانو قوتابیانو

خەیاتەكانو شۆفێرەكانو نانەواكانو ...هتد... كە قوتابیان ڕێكخراوی تایبەتی خۆیان هەبوو.

لە لیژنەكەماندا من سەرپەرشتی كاری یەكێتی قوتابیانم ئەكرد، احمدی مارف نانەواكان، عمر اسماعیل خەیاتەكان، كاك نەژاد سەرپەرشتی لاوانی ئەكرد، بێجگە لە ئیشی حزبی كە هەردوو بەیەكەوە بەسترابوون كە لیژنەی حزبیو لیژنەی ڕێكخراویو دیموكراتیش بوو. ئەمە بوبووە كێشەی سەرەكیمان، من پشتگیری كاك نەژادم ئەكرد كە ئەم بەستنە لێك جیابكەینەوە، بەڵام هەمیشە بەرەنگاری گیروگرفت ئەبووینە لە جێبەجێكردنیا. لیژنەكەمان لیژنەیەكی ڕێكوپێك بوو بەڵام دۆگماۆ خۆبەستنەوەیەكی زۆر بە ڕێكوپێكو چەسپاندنی ناوەندییەكی هێجگار قایم ئیشەكەی لێ‌ئەشێواندینو دوای ئەخستین. ئێمە بە سەركردایەتی هاوڕێ نەژادو كۆبوونەوەی منو هاوڕێ خەسرەو لە دەوری بوبووینە سەنگەرێ لە چەسپاندنی هەندێ شتی تازەدا. هاوڕێیانی‌كەش بە سەرپەرشتی هاوڕێ كمال محمود بوبوونە كۆسپ لەڕێی فراوانكردنو جێبەجێكردنی كارەكانماندا، هاوڕێیان لەگەڵ ئەوەی هاوڕێی ئازاو بە جەرگ بوون هەموو هێزوتوانایان، ماڵو منداڵیان، سەروگیانیان لەڕێی حزبو میللەت دا ئەكردە قوربانی. بەڵام رادەی تێگەیشتنیان لاواز بوو، لە ئیشی ڕۆژانەو جێبەجێ كردنی داواكانی سەرەوەی حزب كارێكی كە نەئەچوو بەڕێوە، هەوڵی ئەوە ئەدرا كە فێری لێكۆڵینەوەو رەخنەو شیكردنەوەی ڕووداوەكان بین، بەڵام زۆر بە قورس ئەهات بە دەستەوە، هەرچەندە كەشێكی خۆش ئەخوڵقێنرا بۆ ئەم كارە بەڵام بەڕادەیەكی پێویست نەبوو. توانرا هەفتەی ڕۆژێك بۆ كۆبوونەوەی خۆمان دابنێین بۆ بەرزكردنەوەی رادەی زانیارییمانو دووان لە ڕووداوەكانی ناوخۆو جیهانو باسكردنی ئەزمونی حزبە شیوعییەكان كە كاك نەژاد ئەو كارەی خستبووە سەرشانی خۆی، ئەمەش چەندین كۆسپی خرایە بەردەم، هاوڕێ كمال بەچەشنێ خۆی ئەبەستەوە بە داواكارییەكانو بڕیارەكانی سەركردایەتییەوە، دەرگایەكی

قایمی لەسەر هەموو شت دائەخست. زۆر جار کاك نەژاد تورە ئەبوو دەستی ئەدا بەیەکداو ئەی بۆلان و کاغەزو قەڵەمی فڕێی ئەداو هەندێ جاریش هێرشی ئەبردە سەر هاوڕێیان و ئەیوت بەشەرەفم بە هاوڕێ کمال بڵێ ئەبێ لەسەر ئەژنۆ بگەیتە کرکوك، ئەکەوێتە ڕێی بێئەوەی چرکەیەك بکات و پێیان بڵێ ئاخر هاوڕێیان ئۆتۆمبێل هەیە، وڵاخ هەیە، هیچ نەبێ بە پێ دێم. من هەندێ جار ئەو هێرشانەی هاوڕێ نەژادم پێناخۆش بوو بەتایبەتی بەرامبەر هاوڕێ کمال چونکە بەراستی خۆشم ئەویست و هەڵوێستە پاڵەوانەکەیم ئەهاتەوە بیر کە ساڵانی ١٩٥٠ لە بەندیخانەکەی ئەبوغرێب لەباتی هەموو بەندییەکان و هاواری کردو بەسەر بەڕێوەبەری بەندیخانەکەدا نەڕاندی وتی من نوێنەری ئەمانەم و مانم گرتووە فەرموو لەگەڵ مندا بدوێ. هەرچەندە ئەو نوێنەر نەبوو بەڵام نوێنەرە راستەقینەکەمان لە ترسدا بێدەنگ بوو، ئەم کارەکەی ڕاست کردەوە ئێمەش وەنەبێ کەموکوڕیمان نەبووبێت، بگرە بەهۆی نهێنی و جێبەجێکردنی هەموو بڕیارەکانی حزبەوە هەروەك مەکینە هەڵئەسوڕاین. بەڵام بیروهۆشی خۆمان ئەخستە ئیش هەرچەندە زۆر کەمیش بوو.

هەردەم لە دانیشتنەکانماندا هەوڵمان ئەدا هەریەکە بەکورتی گورج وگۆڵی خۆی و پێشنیارو ڕەخنەکانی بخاتە بەردەم لیژنەو گیروگرفتەکانی بۆ چارەسەر بکرێ و بە ئیشی لاوەکییەوە خۆمان خەریك نەکەین. بەڵام ئەم کارەمان بۆ نەئچووە سەر بەهۆی ئەزموونی هاوڕێیانەوە کە هەموو شت تێکەڵ و پێکەڵ ئەکرا، تا ڕێگەی ئاسایی خۆی ئەگرتەوە زۆر کاتی بەفیڕۆ ئەبردین. هاوڕێ احمدی مارف کیسەیەکی خامی گەورەی لەبەر پشتێنەکەیدا گرێ دا بوو پڕ بوو لە وردە، هەر لەو پارەیە مانگانەی هاوڕێیانی ئەداو دوایی لێی ئەسەندنەوە کە ئەبووە مقۆمقۆیەکی زۆر لەسەر ئەمە. هەموو جارێك کاك نەژاد بە پێکەنینەوە بۆ گۆڕینی کەشی کۆبوونەوەکە ئەیووت کاتێ حزب پێش ئەکەوێ هاوڕێ احمد واز لەو کیسە خامە بهێنێ و پارەکانی بە جۆرێکی کە هەڵبگرێ. ئەویش ئەیوت بێقەزابی لە بەیانییەوە تا ئێستا ئیش

ئەکەم‌و خەڵکیش هەموو وردەم ئەدەنێ ئەم کیسەیە نەبێ هەڵناگیرێ، حزب لەلایەك‌و ئەم کیسەیەش لەلایەکی تر. یا سەرمان ئەکردە سەر هاوڕێ عمر کە هاوڕێیەکی زۆر بێدەنگ‌و لەسەرخۆ بوو، ئیشەکانیشی هەروا بوو تا هاوڕێیان لە دوکان سەریان لێ‌نەدایە ئەو نەیئەبینین، جا شانەکەی خۆیان‌و ئازایەتی خۆیان کە ئەبوایە بیان جوڵانایە. هەموو جارێ هاوڕێ نەژاد باسی ئاغا عەرەبەکەی بیر ئەخستەوە کە دائەنیشت لە دیوەخانەکەیدا دوو نۆکەر لە راست‌و چەپییەوە ئەوەستان خۆی نەیئەتوانی قاچ لەسەر قاچ بگۆڕێ، بەدەنگی بەرز ئەیووت یەمین مانای قاچی راستی بخەنە سەر چەپ. کە هیلاك ئەبوو ئەیوت یەسار گوایە ئاڵ‌وگۆڕی بۆ بکەن. سەرمان ئەکردە سەر ئەو هاوڕێ باشە گوایە جوڵاندنی نییەو ناچی هاوڕێیان ببینێ‌و سەرپەرشتیان بکات، ئەویش ئەیوت هەرئەوەندەم پێ‌ئەکرێ ناتوانم دوکان چۆڵ بکەم. رۆژانە ئەم شتانەمان لا دووبارەو سێ‌بارە ئەبووەوە بێ‌ئەوەی هاوڕێیەك بیگرێتە دڵ. خۆ کاك نەژادیش لەمە دەرنەئەچوو، هێرشی باشی ئەکرایە سەر، چونکە ئەوەندی خەریکی قژو دەم‌وچاوی‌و جلەکانی‌و خۆڕێکخستنی دوای ئەخات نیو ئەوەندە ئیش بۆ حزب ناکات. جارجاریش ئەکەوتنە لاسایی کردنەوەی من کە چۆن قسەئەکەم‌و چۆن تەزبیحەکەم رائەوەشێنم‌و یاری پێ‌ئەکەم، تا لە ماڵیشەوە چۆن رەفتار ئەکەم، ئەمەش احمدی مارف هەمووی ئەزانی بەهۆی دۆستایەتی لەگەڵ باوکم دا و هەمووی باس ئەکرد، کە زۆر ئەهاتە لای دائەنیشت‌و قەسی خۆشی بۆ ئەکرد.

هەر لەوکات‌و سەردەمەدا ساڵی ١٩٥٢ مانگی گەلاوێژ، کە میللەتی ئێران بە پێشڕەوی پارتە پێشکەوتووەکان‌و پارتی تودەی ئێرانی‌و بەسەرکردایەتی پیاوی نیشتمان پەروەرو پێشکەوتنخواز (مصدق) راپەڕی‌و توانی نەوتی وڵات بگەڕێنێتەوە بۆ میللەت‌و دەست بەسەر حکومەتی شادا بگرێ‌و بیخاتە ژێر حوکمڕانی پارتە نیشتمان پەروەرەکانەوە، شا لە وڵاتی خۆی هەڵات‌و خۆی گەیاندە بەغداد لای هاوسێکانی. ئەم سەرکەوتن‌و

پێشکەوتنەی میللەتانی ئێران هەموو لایەکی هەژاندو خۆیان ئامادەکرد بۆ پشتگیریو داکۆکی کردن لێیان. هەروەها راکردنی شا بۆ بەغدادو تورەیی و نارەزایی میللەتی عێراقی پەرەپێداو بووە جێگەی نارەزایی خەڵکی. هەر بەخۆشی ئەم رووداوەوەو نارەزایی دەربرین لە پێشوزای کردنی شا، ئێمە لە سلێمانی ئەبوایە بە کارێ هەڵسابینایە، ئەوەبوو بیرمان کردەوە کە بەپێی توانای خۆمان جموجۆڵێ بکەین، پێشەکی هاتین دوو عەرەبانەی یایلی دوو ئەسپی کە باوبوو لە سلێمانیدا بە کرێمان گرتو رازاندمانەوە بە گوڵو هەندێ پەرۆی رەنگاورەنگو دروشمی بچوك، ١٠-١٢ منداڵی برادەرانی خۆمان ئازادی مامو ئازادی مصطفی خۆشناوو سروەی احمدی عزیز ئاغاو ئەوانی کەم لەیاد نەماوە بەجلی ئاڵو والآوە ئامادەمان کرد. مامۆستا گۆران هەڵبەستێکی بەم بۆنەیەوە دانا لەسەر وەزنی هەی بەلارو هەیبەلار منداڵانمان فێرکرد بە دەنگی بەرز بیڵێنەوە، لەکاتی دیاریکراودا منو مامۆستا گۆرانو حەمەی احمدی طە (کامەران موکری) لەگەڵ چەند منداڵێکدا سواری عەرەبانەکەی علی فایز بووینو عمر کریمو عمر ئاشتیو عەبدولی سوران سواری عەرەبانەکەی علی بەگ بوون لەگەڵ چەند منداڵێکی تردا. کەوتینە رێ بە شەقامی مەولەویو کاوەو سجن دا وردورد بەناو خەڵکدا ئەرۆیشتین کە پێشەکی ئاگادارکرابوونەوەو ئامادەکرابوون بۆ پێشوازیمان. ئێمەش لەگەڵ گۆرانی منداڵەکانو هۆرِن لێدانی عەرەبانەکان چەند کەرەتێك بە شەقامەکاندا گەراینو بووە فیستڤاڵێکی قەشەنگو هەموو کەس لە مەبەستەکەمان گەیشت، لە زۆر جێگەی تایبەتو قەرەباڵغدا نقوڵمان بۆ خەڵکی هەڵئەدا وەکو بەر کتێبخانەی گەلاوێژو هەندێ چایخانەی سەر شەقامەکان. بەبێ زیانو بەهێواشی توانیمان ئیشەکانمان جیبەجێبکەین بێ ئەوەی میری هیچ شتێك بەرامبەرمان بکات. بۆ ئێوارە بانگهێشتی برادەرانی خۆمانو پارتیمان کرد بۆ باخچەی گشتیو کۆمەڵ کۆمەڵ دانیشتینو باسی راپەرینی میللەتی ئێرانمان کردو کردمانە هەڵمەتێکی گەورە بۆ خۆناسینمانو نزیك بوونەوە لە میللەتی

خۆمان. هەر بۆ بەیانیش لەهەموو قوتابخانەکاندا نوقوڵ دابەشکراو بوە باسی تێکۆشانی میللەتان و راپەڕینی میللەتانی ئێران، ئەم جموجۆڵەش هەموو سلێمانی گرتەوە، یەکێتییەکان و نەقابەکان و خەڵکی ناوبازاڕ هەموو ئەم راپەڕینەیان لەسەر زار بوو، چونکە هەلمەتێکی باشی بۆ کرا، یەکەم کە راپەڕینی میللەتێکی دۆست بوو، دووەم لەبەر بەرژەوەندی کوردستانی ئێران پێمان خۆش بوو.

## ئاهەنگی قوتابیان

بڕیارماندا ئەبێ بجوڵێین بەرەو فراوانکردنی رێکخراوە دیموکراتییەکان و بەهێزکردن و گەشەپێدانیان و ئاشکراکردنی جوڵانەوەکەیان و رێکخستنیان بە شێوەیەك کە لەبار بێ بۆ هەڵسوکەوتی ئەو رێکخراوانە.

پێش هەموو لایەك دەست خرایە سەر یەکێتی قوتابیان کە پێشەکی بەم ئیشانە هەڵسن و ببنە هەوێنی ئەم بڕیارەمان. ئەوەبوو یەکێتی قوتابیان یەکەم هەنگاوی نا بۆ ئەم کارەو بەبۆنەی رۆژی دروست بوونیەوە یەکەم کۆبنەوەی لە (ساحەی سباع) لە بەغدا ئەبێت یادی ئەو رۆژە بە ئاشکرا بکرێتەوە. بڕیارماندا چایخانەی ئەوقاف بەکاربهێنین کە کەوتبوە ناوەڕاستی شارەوە لەبەر دەرکی سەرا بەرامبەر سینەمای رشید، پێشەکەی هەشت جامخانە بوو، قوڵاییەکەشی ئەوەندەو نیوی رووەکەی ئەبوو، بەهەر چوار دەوریدا قەنەفە ریز کرابوو لەگەڵ چەند ریزێکی ناوەڕاستی، بێجگە لە تاکە کورسی و مێزو تەپڵەك بۆ چاخواردنەوەو یاری دۆمینەو تاوڵە، ئەوەندە گەورە بوو چەند کەڕەتێك سینەماو شانۆگەری تیا نیشان درابوو. تێکڕا بە ئاسانی جێگای (٢٠٠) کەسی تیائەبۆوە، چەند خاوەنێکی بەخۆیەوە دیبوو، بەڵام ئەم جارەی کە ئێمە ئەمانویست ئەو کۆبونەوەیەی تیادا بکەین کاك (عمری حاجی قادر) بوو کەبەناوبانگ بوو بە عمری ئەوقاف و کوڕێکی چاکی خەڵکی سلێمانی و

گەڕەکی کانێسکان بوو، دۆستی ئێمە بوو ڕێزی تایبەتی لێئەگرتین و ئێمەومانانی هەمیشە لای خۆیەوە دائەنا و جاری واش هەبوو جێگەکەی خۆی بۆ چۆڵ ئەکردین لەکاتی کەم جێگەییدا. هەمیشە قسەی خۆشی بۆئەکردین و جارجارەش لەژێر لێوەوە گۆرانی بۆ ئەوتین.

من یەك دوو ڕۆژ پێش کۆبوونەوەکە دواندم ڕەزامەندی خۆی نیشانداو بڕیاریدا ٢٠-٣٠ کورسییەکی‌کەمان بۆ پەیدا بکات و بیخاتە بەینی کورسییەکانەوە. ئەو ڕۆژەش چا زۆر تر لێبنێ و شەربەتیش بفرۆشێ، بەڵام بە مەرجێ خەڵکەکە نەیکەنە هەراو دەنگەدەنگ و هوتاف کێشان نەك پۆلیس بێتە سەرمان و توشی گێرمەو کێشە بین. بە پێکەنینەوە وتی بەخوا یەکسەر ئەڵێم قادری میرزا کریم ئەمانەی هێناوە ئیتر کەیفی خۆتە. هەر زوو پەشیمان بوەوەو وتی مەگەر زمانم ببڕن و پارچەپارچەم کەن دان بەهیچ دا بنێم، منیش پێم وت خۆ بە گاڵتە ئێرەمان هەڵنەبژاردووە. بەڵێنم دایە کە کۆبوونەوەکە بەبێ دەنگی ئەڕوا بەڕێوە، تەنها کۆمەڵ کۆمەڵ قسەوباس لەسەر یەکێتی قوتابیان و جوڵانەوەی نیشتمانی و ئاشتی خوازان ئەکەن، لەگەڵ هەندێ هەڵسوکەوتی ئاسایی کە دانیشتنەکە تێك نادات وەکو تەوقەکردن لەگەڵ یەکترو جێگەگۆڕکێ بۆ لای یەکترو دانیشتن بەکۆمەڵ.

لە ڕۆژی دیاریکراودا هەر لە بەیانییەوە دوودوو سێ‌سێ قوتابیان بەرەو چاخانەکە کشان بە چەشنێ کە پارێزگاری لە خۆیان و جێگەکە بکرێ، هەریەکە جێگەی خۆی گرت و کۆمەڵ کۆمەڵ لە یەکتر گردبوونەوەو وەکو ڕۆژانی‌کە داوای چاو شەربەت و ئاویان لە شاگردەکانی ئەکردو تاوڵەو دۆمینەیان ئەخرایە بەردەست بۆ یاری کردن و خۆپیشاندان بە دانیشتنێکی ئاسایی چایخانە تا هەمووان ئامادەبون. لە کەشێکی دیموکراتیانەی خۆش دا بەدەم وت و وێژو هەڵسوکەوتێکی ژیرانەوە کەوتنە باسی هەموو ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە، لە تێکۆشانی قوتابیان و ئاشتی خوازان و کرێکاران و جووتیاران. بە ئاشکرا برادەران وەکو فوئاد مجیدو جەزای میرزا حسین و

کریمی عەبە چنگیانیو کمالی حاجی مصطفیو جلالی میرزا کریمو حەمە کاکەو فاروقی عبدالخالقو عباسی ملا قادرو چەندانی تر بەسەر کۆمەڵەکاندا ئەگەڕانو وتوێژیان لەگەڵ ئەکردن، چونکە ئەمانە برادەرانی پێشکەوتووی حزبو یەکێتی بوون. هەروەها لەکاتی دیاریکرادا دوو قوتابی منداڵ هەریەکەی بە سینییەکی پڕ لە چکلێتەوە کەوتنە ناو خەڵکەکەو بۆ دابەشکردنی بەسەریاندا کە لەوەبەر ئامادەکرابوو، هەریەکەی پارچە کاغەزی لەناودا بوو کە دروشمەکانی ئەوسای حزبو یەکێتی قوتابیانی تێدا تۆمارکرابوو بێجگە لە دروشمی یادکردنەوەی دامەزراندنی یەکێتی قوتابیان، بڕیاربوو دوای خواردنی چکلێتەکان هەریەکە ئاگاداری دروشمەکان بێتو فڕێ نەدرێتە سەر زەوی بۆ پارێزگاری لە چایخانەکە کاتی هێرشو هاتنی پۆلیس.

بە چەشنێ کۆبوونەوەکە بەڕێوە چوو دوژمن بەهیچی نەزانی، تەنها چەند کەسێکی هاتوچۆکەری چایخانەکە سەریان سوڕما بوو نەیانئەزانی چییەو ئەم خەڵکە زۆرە بۆ گردبوونەتەوەو نیازیان چییە؟ هەرچەندە گوێیان لە هەندێ قسەوباسو ئاگاداری هەندێ هەڵسوکەوت بوو. هەندێکیان هەڵاتنو هەندێکیان پێیان خۆش بوو مانەوە. لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا بڕیار بوو دوودوو برادەران بڕۆنە دەرەوە، لەبەردەرگای چایخانەکەشدا برادەرێك بە سەفتەیە بەیانی یەکێتی قوتابیانەوە وەستابوو هەریەکەو بەیانێکی ئەدانێو خواحافیزی لێ ئەکردن، تا چایخانەکە کەسی تیانەما کاك عمر خۆیو شاگردەکانی نەبێت. دوایی پۆلیس هاتبووە سەریان، ئەوانیش زۆر بە شێنەیەیو لەسەرخۆ وەرامیان دابوونەوەو خۆیان لێگێل کردبوونو وایان نیشاندا بوو کە هەر هیچ شتێ رووی نەداوەو چایخانەکە زۆر جار بەم چەشنە خەڵکی تێئەڕژێ. هەرچەندە پۆلیسەکان باوەڕیان بەمە نەبوو بەڵام نەشیان ئەویست لەسەری بڕۆنو شتەکە گەورە بکەن، چونکە سەردەمەکە ئەوە نەبوو میری نەختێ کەمتەرخەمی ئەکردو نیمچە پشودانێك لە ئارادابوو.

بۆ رۆژی دوایی کۆبوونەوەی لیژنەی ناوچە، من راپۆرتی کۆبوونەوەکەی

قوتابیانم خستە سەر باس، هەموو لایەك زۆر پێی خۆشحاڵ بوون لە ئەنجامەکەی کە گەورەترین دەستکەوتی هەبوو لە پێناسینی ڕێکوپێکییەکانی یەکێتی و حزب بە ئامادەبووان، کە زۆربەیان پەیوەندییان نەبوو تەنها بانگهێشت کرابوون، هەرچەندە لە دواییدا بوونە دۆستێکی تەواوی جوڵانەوەکەمان و خوێندنەوەی بەیان و بڵاوکراوەکانمان. هەروەها بووە دەرسێکی باش بۆ ئامادەبوونیان لە چالاکییەکانی داهاتوودا، بەتایبەتی ڕێکخراوە پیشەییەکانی تر کە ئەندامەکانیان لە دەوروبەری چایخانەکەدا وەکو چاودێرو پاسەوان لەوناوەدا بڵاوبووبوونەوە. لەسەری هەموو کۆڵان و شەقامەکانداو لە زۆربەی چایخانەکانی ئەوناوەدا برادەرانمان دانیشتبوون بەتایبەتی چایخانەی حەمە ڕەق کە ئەوێش یەکێك بوو لە جێگە گرنگەکانی ئێمەو خاوەنەکەی دۆستێکی باشی هەموو لایەکمان بوو. دیسان ئەم کۆبوونەوەیەش بەیەکێ لە چالاکییەکانی حزب ئەژمێردرا کە بووە ئەزموونێکی باش بۆ هاوڕێیان، هەر لەبەر ئەوە لەو دانیشتنەدا بڕیاردرا کە ئەو چالاکیانە لەهەموو ڕێکخراوەکاندا ئەنجام بدرێ.

## چالاکی هەمەڕەنگ

دوابەدوای ئاهەنگەکەی قوتابیان هەموونەقابەکان و یەکێتییەکان دەستیان کرد بە چالاکی لەم بارەیەوە بە هەستان بە ڕێکخستنی سەیرانی بە کۆمەڵ، هەرتوێژەی لە ڕۆژێك دا. هەینی نانەواکان، سێشەممە سەرتاشەکان و ڕۆژانی پشووی هەر پیشەیەك لەرۆژی خۆیدا بێجگە لە سەیرانی گەورەو گشتی بۆ هەموو ڕێکخراوەکانی حزب، کە سەرجەم ئەم ڕێکخراوانە بێجگە لە خواردن و هەڵپەڕکێ و گۆرانی، ئەکرایە مینبەرێکی گورە بۆ وتوێژو لێکۆڵینەوە لەسەر ڕووداوە جیاجیاکان. بۆ ئەم مەبەستەش حەمە صالح دیلان بە دەنگە خۆش و هۆنراوە جوانەکانییەوە ئەبووە سەرقافڵەی زۆربەی سەیرانەکان. بێجگە لە ابراهیم خەیات و علی فەوتاو شێخ صدیقی شێخ محمودو لە برایانی

پارتی قادری حاجی حسین‌و دەنگ خۆشانی تر سەیرانەکانیان ئەخرۆشان. یاری ئاسن‌و زۆران گرتن‌و جوانی لەش لەلایەن کریم پاڵەوان‌و حەمەرشیدی ئەحە شانەو سمە پاڵەوانیشەوە جێگە خۆی ئەگرت. ئەمەو خوێندنەوەی هۆنراوەکانی گۆران‌و کامەران‌و هەندێ جاریش دڵزار ئەبووە هەوێنی سەرکەوتنی ئیشەکانمان. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو جارێك كاك كريم عارف ئەبوایە هەڵبەستە بەناوبانگەکەی ئەوکاتەی بخوێندایەتەوە بەدەنگی دلێرو بەرزی خۆی (انا نطالب بالسلام) کە ئەبووە چەپڵە لێدان‌و هوتاف کێشان.

ئەم هەموو جموجۆڵ‌و سەرکەوتنانەی بەدیمان هێنان وای لێکردین بگەینە بڕیارێك کە هەر شەوە ناشەوێك لە ماڵی برادەرێك کۆبوونەوە بە ١٥-٢٠ برادەر بکرێ بۆ شیکردنەوەی سیاسەتی حزب‌و هەندێ بۆچوونی زانیاری‌و رۆشنبیری‌و هەڵوێستمان لە رێکوپێکی‌و هەنگاوی تازەمان کە هەندێکیان خستە سەرشانی من، ئەویش لێدوان بوو لەسەر رەخنەو رەخنە لەخۆگرتن کە رێکخراوەکانمان زۆر پێویستیان بەم رۆشنبیرییە هەبوو، بەتایبەتی پاش چەند ساڵێك کاری ژێر زەمینی‌و نهێنی تەسك‌و پڕ لە شێواندن کە برادەرانمانی فێری لەخۆبایی بوون‌و خۆبەزل زانین‌و گۆشەگیرییەکی تەواوکردبوو. کە گوێ نەگرتن لە بیروباوەڕو رەخنەی رێکخراوەکانی خوارەوەو چەسپاندنی زۆر شت بەسەریانداو بڵاوبوونەوەی ترس‌و لەرزو ترساندن، کە نابێت باسی چەوتی‌و لادانی حزب‌و برادەرانی سەرەوە بکرێت چونکە تاوانێکی گەورەیە. جابۆ شکاندنی ئەم قەڵا سەختەو نەهێشتنی ئەم گیروگرفتە، ئەم باسە دەورێکی باش‌و کاریگەری ئەبینی بۆ هوشیارکردنەوەی رێکخراوەکانمان بۆ خۆئامادەکردن بۆ وەرزێکی رۆشنبیری‌و کردنەوەی رێگایەکی پان‌وبەرین بۆ لێدوان‌و شیکردنەوەی هەموو بڕیارێك کە لە سەرەوە بێتە خوارێ بۆ ناو رێکخراوەکان، وتوێژێکی تێروتەسەلی لەسەر بکرێ‌و بیروباوەڕی هەموانی دەربارە بوترێ‌و ببێتە کاری گشت ئەندام‌و لایەنگرانی حزب.

پێش چەند رۆژێ خۆم بۆ کۆبوونەوە ئامادەکرد، بە خوێندنەوەی نوسراوێك لەم بارەیەوەو وتوێژ لەگەڵ کاك نەژاد کە رۆڵێکی دیاریکراوی هەبوو بۆ خۆئامادەکردنم بە نوسینی هەندێ سەردێڕو لێکدانەوەی هەندێ بۆچوون و شیکردنەوەی هەندێکی تر لەگەڵ برادەران و خودی خۆمدا. تا لە خۆم دڵنیابم کەئەتوانم بەم کارە هەڵسم و رۆڵێکی کاریگەری چاکی تیا ببینم.

یەکەم کۆبوونەوە ماڵی کاك فەرهادی علی عارف ئامادەکراو شەوێکمان دەست نیشان کرد. بە برادەرانمان راگەیەنرا کە لەماوەی یەك کاتژمێردا یەك یەك و دوودوو بێن بۆ ماڵی فەرهاد. لەوێش جێگە داخرا بەدەوری ژوورەکەداو چایی دەم کراو هەندێ میوەش ئامادەکرا تاوەکو میوان سەیر کرێین و بۆ سەردان کۆبوینەتەوە. لەماوەی دیاریکراودا هەموو ئامادەبوون کە خۆی ئەدا لە بیست برادەر. لەلایەن برادەرێکەوە بەخێرهاتن کران و چۆنیەتی بانگێشەی دانیشتنەکەی بۆکردن و بڕیاری حزبی پێ ڕاگەیاندن .، کە شەوێك لە هەفتەیەکدا ئەم دانیشتنە سازکرێ. هەر کۆبونەوەیە لە باسێك ئەدوێین و هەموو برادەرێك بۆی هەیە باسێك هەڵبژێرێ و لەسەری قسە بکەین، بەڵام ئەمجارە لەسەر بڕیاری حزب باسی رەخنەو رەخنە لەخۆگرتن ئەکرێ. کە کاك قادر خۆی بۆ ئامادەکردووە. کۆبونەوەکەم پێشەکی بە بەخێرهاتنی برادەران دەست پێکردو کەوتمە پێشکەشکردنی باسەکەم، لەسەرەتاوە هەندێ رەخنەم لە خۆمان گرت کە دورین لە برادەران و میللەت و زۆربەی کارەکانمان تەنها وەکو ئەوامر دەرئەچێت، چەسپاندنی بەزۆرە ملیی تیادا هەیەو رێگەی لێکۆڵینەوە تا رادەیەك قەدەغەیە. ئەمەو زۆر شتی کە کە هەموان پێیان خۆش بوو، جا هاتمە سەر هەڵوێستی ئەوان، کە ئەم نەخۆشییە ئەوانیشی گرتەوەو تەمەڵی و کەمتەرخەمی و دڵەراوکێ و هەندێ گێرەشێوێنی و درکاندنی نهێنییەکانی حزب و باسکردنی بەرێگەیەکی خراپ پاڵەپەستۆی زۆری خستوەتە سەر رێکخراوەکانمان کە ئەمەشیان تارادەیەك پێ باش بوو. بەڵام هەندێ بە نابەدڵییەوە، چونکە بەبێ چەندوچوون هەمووی سەروگوێلاکی

خۆیانی گرتەوە. جا ڕێگەکرایەوە بۆ لێدوانی و رەخنەگرتن لە حزبو ڕێکخراوەکانی و هەندێ لێپرسراویش بەڵام پاشان بە زەقی و بەربڵاوییەوە زۆربەیان کەوتنە رەخنە لەخۆیان و بڕیاری ئامادەبوونیان بۆ چاکردن و پێشکەوتنی خۆیان لەم رووەوە. کۆبوونەوەکە بە سەرکەوتویی دوایی هات و پاش چەند رۆژێ بەدیارکەوت کە بە ئاشکرا جموجۆڵێکی باش ئەبینرا لە ریزەکانی حزبو ڕێکخراوەکانیدا، کە بە دەیان نامەمان بۆ ئەهات برادەران رەخنەیان لە خۆیان ئەگرت و بەڵێنیان تازە ئەکردەوە کە بەخۆیاندا بچنەوەو ڕێگەی تازە بگرن بۆ پێشخستنی حزبو جوڵانەوەی نیشتمانی. کۆبونەوەی دوهەمو سێهەمو ...هتد...لەوماوەیەدا گیرا لە ماڵی عبداللە نوری ئەفەندی و عمر ئاشتی و علی فەوتاو و ماڵی خۆمان و هەندێکی لە دەشت ودەر کە هەر هەمووی دەورێکی باشی هەبوو لە پێشخستنی رادەی رۆشنبیری برادەراندا. بۆیە ئەم کارە لەناو هەموو ڕێکخراوەکاندا جێبەجێکراوە بە نەقابەکانیشەوە. ئێمەی قوتابی زیاتر رۆژانی هەینی کۆبونەوەکانمان ڕێك ئەخست، برادەرێکی پارتیمان هەبوو کاك (محمود میرزا عبداللە) خزمی من و ئەنوەری عزت نجیب و عبداللە نوری ئەفەندی بوو، خۆی پیکابێکی پێبوو ئیشی پێئەکرد، پیاوێکی چاك و قسەخۆش و ئازاو چاونەترس بوو، بەردەوام لەگەڵ خۆماندا ئەمان برد بۆ سەیران. هەموانی ئەهێنایە جۆش خرۆش بە قسە خۆشەکانی و سەرچۆپی هەڵپەڕکێ و هەندێ جاریش جنێوەکانی کە بە سنگێکی فراوانەوە پێ ی قایل ئەبووین. زۆرجار ئەیوت منێکی پارتی زۆر سەیرە بێئێوە هەڵناکەم، هەر لای ماڵەوە و چەند کەسێ نەبێ کە بە پارتیم ئەزانن، هەموو کەسێ بە شیوعیم ئەزانن و بۆ ئێوە ئیش ئەکەم و هەڵئەسوڕێم. تەنها خۆی و سەکنەکەی کە کوڕێکی باش و هەورامی بوو زۆر بە قسەکانی دڵخۆش ئەبووین کە لەگەڵ وەستاکەیدا ئەیکردو جنێوەکانی لەگوێ ئەگرت. هەڵئەسان بە گۆشت پارچەپارچەکردن و برژاندنی و رازانەوەی سفرەی نان خواردن و بەشداربوونی لە هەموو گفتوگۆکاندا کە زۆربەی برادەران دایان ئەنا بە ئەندامێکی فەخری

یەکێتی قوتابیان. هەر لەم کاتەدا هەندی جار شەوان کۆبوونەوەی تایبەتی ئەکراو خواردنێکی چەورو بەلەزەت ئامادە ئەکرا بەتایبەتی لە مالّی ئێمە یاخود مالّی عبداللّەی نوری ئەفەندی بە بۆنەی ئامادەبوونی سەید احمدەوە کە هاوڕێیەکی حزبی بوو، هەر لە منداڵییەوە هاوڕێی فەقێی مزگەوتەکان و مەلاو شێخەکان بوو، هەندێ جاریش خۆی مەلای مزگەوتەکانی لادێی کردبوو، ئەم برادەرە لە هەموو شتێکدا وەستابوو، لە قسەی خۆش و نەستەق و خوێندنەوەی هەڵبەستی شاعیران و دوان لە سەریان، بێجگە لە گۆرانی و هەڵپەڕکێی کوردی و سەمای جۆراوجۆر. هەر شەوێ ئەومان لەگەڵ بوایە تا بەیانی ئەماینەوە و بەرەبەیان گیپەو سەروپێمان بۆ ئامادەئەکرا. جاوەرەە جێگەی ١٥-٢٠ کەس لە مالّێکداو لەو سەردەمەدا ئامادەبکرێ و ئەرك بخرێتە سەر مالّ. لەگەڵ ئەوەشدا پێمان خۆش بوو، ئەو شەوە ئەبووە جەژن، دوای نیوەشەو بۆ ماوەیەکی کەم وتوێژ لەسەر سیاسەت ئەکراو هەندێ شت باس ئەکرا. لە پشوی خۆئامادەکردندا بۆ پێشکەشکردنی شانۆگەری کە سەید احمد هەر خۆی پاڵەوانی سەرەکی بوو، هەر خۆی دانەرو ئامادەکەرو پێشکەشکەری بوو، رازاندنەوەی هەر خۆی بوو کە ئەکتەرەکانی رێکوپێك ئەخست و ئارایشتی ئەکردن و جلەکانیانی بەپێی دەورەکانیان ئەگۆڕی، بەتایبەتی ئەوانەی دەوری ئافرەتیان ئەبینی. بە چەشنێ ئەچووە دەورەکەیەوە کتومت وات ئەزانی هەموو شتێ بەراستی ئەڕوا بەڕێوە، ئەچوویتە ناو رووداوەکانەوە بەتەواوی کاتێ کە دەوری ژن و مێردێکی شێخی ناسیاوی هەمووماني ئەبینی، یا کە دەوری مەلاو ژنێکی مزگەوتێکی سلێمانی یا هەڵەبجەی ئەبینی، یا مالّە دەوڵەمەندێکی ناو شار، یا لاسایی یەکێ لە لێپرسراوە حزبییەکان کە وەکو خۆی رەفتاری ئەکرد، چۆن ئەچێتە مالّە برادەران و چۆن دائەنیشێ و لەگەڵیان ئەکەوێتە وتوێژەوە، چۆن نانی بۆ ئامادە ئەکەن و بەزۆر دەرخواردی ئەدەن. زۆر کەڕەت دەوری ژنێکی لادێیی ئەبینی چۆن منالّەکانی ئەخاتە خەوو لای‌لایەی بۆ ئەکاو مێردەکەشی لە تەنیشتییەوە

ڕائەکشێ‌و هەندێ کەرەتیش دەست بازی ئەکەن، چۆن لەگەڵ شێخێکی خزمیاندا کە شیوعی ئەبێت چووە بۆ ئێران‌و ئەم بووە بە شێخی ئەوو ئەوی کردووە بە نۆکەری خۆی‌و یەك دوو مانگ بەم چەشنە کاتی بردۆتە سەر. سەید احمد هیچ برادەرێکی نەئەپەڕاند، تەنها شەوێك کە لەتەنیشت منەوە دانیشتبوو تەزبیحەکەی لێوەرگرتم‌و هەستایە سەرپێ‌و دەستی کرد بە لاسایی کردنەوەی من، چۆن دێم بۆ دانیشتنەکان‌و ئاوڕ ئەدەمەوە سڵاو ئەکەم‌و جێگەی خۆم دەست نیشان ئەکەم‌و قسە ئەکەم. بە چەشنێ ئەم دەورانەی ئەبینی هەموومانی سەرسام کردبوو بەتایبەتی دایکم‌و باوکم‌و خوشکەکانم‌و خزمەکانم کە ئەو شەوە میوانداریمان کردبوون بەبۆنەی هاتنی سەید احمدەوە. ئەم دانیشتنانە بەردەوام بوو یەك دوو مانگ تا بەهۆی چەند هۆیەکی تایبەتی‌و گۆڕانی بارودۆخی ئەوکاتەوە کۆتاییمان پێ‌هێنا. هەرچەندە ئەم بیرەوەریانەمان هەمیشە لە یاد ناچێت کە بە بینینی سەید احمدیشەوە تازە ئەبۆوە، کە هاوڕێمان بوبێ بە لێپرسراوێکی گەورەو نەختێ خۆی بە توندی ڕائەگرت‌و وازی لە هەندێ شت هێنابوو،زیاتر سیاسەت‌و ڕێکخستنی لەسەر زار بوو.

## هەندێ بیرەوەری

باسکردن‌و تازەکردنەوەی بیرەوەرییە کۆنەکان‌و یادکردنەوەی هاوڕێیانی باش‌و خۆشەویست‌و ئازاو نەبەردی جوڵانەوەی کۆمۆنیستی‌و دیموکراتیمان ئەهێنینەوە یادو بە میللەت‌و ڕۆڵەکانی دوارۆژیان ئەناسێنین. یەکێ لەم هاوڕێیانە علی عبدالله -علی بۆسکانی-یەکە هاوڕێیەکی بە جەرگ‌و ئازاو چاونەترس بوو، بیرەوەری خۆش‌و پڕ لە ڕوداوی سەیرو سەمەرەی لامان بەجێ هێشتووە، هەرچەندە دڵشکاندن‌و گێرمەوکێشەی تیادائەبوو، بەڵام جێگای شانازی‌و ڕێز لێ گرتنە. هاوڕێ علی هەمیشە سەر قافڵەی خۆپیشاندان‌و جموجۆڵەکانی حزب بوو. بەندیخانەکانی سەراپای عێراق

نەمابوو لەگەڵماندا شارەزانەبێت و ئازایی و کۆڵنەدانی بەخۆوە نەگرێتێ، بەڵام کەم چیکڵدانەو قسەزۆرییەکەی و هەڵچوون و هێرش بردنەکەی وای لێکردبوو ئێمەش هەردەم سەر بکەینە سەری بەتایبەتی چەند جارێك لە حزبەوە جموجۆڵیان ئەوەستان (واتە تجمید ئەکرا) هەر لەخۆڕایی بۆ ئەوەی تووڕەی بکەین و هێرش بهێنێتە سەرمان، یا ئەماندایە دەست برادەرێکی ترسنۆك و تەمەڵ و کاتمان بۆ دائەنا یەکتر ببینین، ئەم جاری واهەبوو هەر لە دوورەوە جێگەی بینینەکەی بەجێئەهێشت. ئەهاتە سەرمان ئەیوت من پەیوەندی بەم کەسەوە ناکەم و لە ئێوەش دوور ئەکەومەوە. جارێکیان ڕێکخەرەکەی ئەچێتە لای وتەی نهێنی پێئەڵێ و ئەڵێت کاك علی بۆلای تۆ هاتوم. ئەویش ئەڵێ ناوم کاك علی نییەو ئاگام لەم وتە نهێنییە نیە! هەرچەندە ڕێکخەری ڕۆژانەی خۆی بوو. جاری واهەبوو دوور کەوتنەوەکەی لێمان درێژەی ئەکێشا، ناچار ئەبووین ئەچووینە لای و دڵیمان ئەدایەوەو ڕێك ئەکەوتینەوە بەتایبەتی خۆشی خۆی پێنەئەگیرا لە حزب دووركەوێتەوە، ئەیووت چیم لێبکەن حزب هەر حزبی خۆمەو ئەبێت لەم تەمەڵ و ترسنۆك و بێکەڵکانە پاك بکرێتەوە. زۆر جار دۆستەکانی خۆی و پۆلیسەکانی میریش ئەکەوتنە گاڵتە کردن لەگەڵیداو هێرشیان ئەبردە سەر بۆ ئەوەی جنێویان پێبدا، لەم چەشنە برادەرانەمان زۆر بوون کە هەمیشە ڕووی ئاشکرای حزبیش بوون. یەکێك لەوانە هاوڕێ علی فەوتاو بوو کە هەموو ژیانی لەڕێی حزب و میللەت دا دانابوو. هەردەم ئەمانویست لەگەڵماندا بێت، سەرەڕای بەستنی زۆربەی کۆبوونەوەکان لە ماڵی ئەوان، دوکانەکەشیمان کردبووە جێگەی دانیشتن و یەکتری بینین و شت خواردن، زۆربەی جار بە دڵێکی فراوانەوە چنگی پڕ ئەکردین لە دەنکە کولەکەو نۆك و گوڵەبەڕۆژەو نوقوڵ و ڕەحەتەلقوم و بە دەنگێکی بەرز ئەیوت ئەمەیان بۆ فلان هاوڕێ باشەو ئەمەشیان فلان هاوڕێ نەیخوا دیق ئەکا، ڕووی دەمیشی ئەکردە حەمە صالح دیلان. زۆربەی کاتمان لە دوکانەکەی ئەبردە سەر، هەندێ شتی لێ ڕوودابوو بە زۆر ئەیگێڕایەوەو ئەبووە پێکەنین ڕۆژێ

کاك علی خۆی ئارایشت ئەکاو دەمی دائەپۆشێ و خۆی ئەگۆڕێ و ئەبێتە ئەفەندیو دێتە دەرەوە بچێ بۆ ئیشی حزب، وا ئەزانێ کەس نایناسێ! لەپڕ چەند منالێکی گەڕەك لێی دێنە پێشەوەو دەوری ئەگرن و ئەڵێن ئای کاك علی بۆ وات لەخۆت کردووە ئەچیت بۆ ئاهەنگ، ئەویش دەست ئەکا بە پێکەنین و ئەڵێ نەوەڵڵا کورەکانم ئەمە لای خۆی لە پۆلیس خۆم گۆڕیوە، وادیارە بە خۆڕایی خۆم هیلاك کردووە، هەروەکو خۆم بم چاکتر نییە؟

جارێکیان بڕیاری خۆپیشاندان ئەدرێ لەو گەڕەکەی ئەوانەوە دەست پێ بکرێ، ئەمیش دێت لە سەربانی خۆیان دوو باگردێن دائەنێ بۆ ئەوەی کە پۆلیس لەوێوە هاتن تلۆری کاتەوە بەسەریاندا جا چەندی کوشت ئەیکوژێ. ئەمە حەمە صالح دیلان پێی ئەزانێ ئەنێرێ لای ئەبەن، ئەبێتە بنێشتە خۆشەی بن دانیو بە علی ئەڵێت ماڵ کاول هەموو کەس ئەزانێ ئەم باگردێنە لە کوێوە ئەکەوێتە خوارێ یەکسەر دێنە ماڵی ئێوەو راپێچی سەرا ئەکرێن، هەموو ئەیوت ئەم شتانە حەمە صالح بۆی دروست کردووم، هەرچەندە ئەکەوتە هێرش بردنە سەری بەڵام بە کورتی ئەی بڕانەوە چونکە دەرەقەتی حەمە صالح نەئەهات و زۆریشی خۆش ئەویست.

جارێ لە گرتنەکانمان کەچەند مانگێ ماینەوە علی فەوتاومان لەگەڵ نەبوو، چەند جارێك بۆ کاتێکی کەم ئەهات بۆلامان، کە ئەمە بێتاقەتی کردبووین بەتایبەتی دەستی ئەکرد بە گاڵتە پێکردنمان و نەختێ نوقوڵ و قورسی نەعناو یاری منالانی بۆ ئەهێنایین، بوکە شوشەیەکی ئەگرت بەدەستەوەو شەقشەقەی بۆ لێئەدایین، بەتایبەتی بۆ حەمە صالح کە ئەبووە پێکەنین و زۆرمان پێناخۆش بوو. بیرمان لێکردەوە ئەمە وا ناڕواو لەدەستمان دەرناچێت. حەمە صالح پۆلیسێکی راسپارد کە علی زۆر خۆش ئەویست و باشی ئەناسی و لە ئێمە زیاتر ئەیویست علی لێوەی نزیك بێت. پیلانێکیان دانا کە بچێت شەڕی پێبفرۆشێ و شکاتی لێبکات بەڵکو بیگرن و بیهێنن بۆ لای ئێمە. چۆنمان پیلانەکە دانابوو سەری گرت و علی فەوتاو گیراو راپێچی

لای ئێمەکرا، کاکی پۆلیس وەردیانی بەندیخانە بوو علی هێنایە بەردەمی ئێمەو دەرگای بۆ کردەوەو کردییە ژوورەوەو هاواری کرد ئەویش بەندییەکی تر وەری گرن هەرچەندە برادەری خۆتانە بەڵام سیاسی نییە. ئێمە هەموو گوێ قوڵاخ بووین‌و چووینە پێشەوە کاك علی بە بۆڵەبۆڵ کرا بە ژوردا. پێشەکی خواردنمان بۆ داناو چای خواردەوەو هاتینە سەر چۆنییەتی گرتنی، بەشێنەیی و لەسەرخۆ دەستی کرد بە قسەکردن‌و بارودۆخی ئەو رۆژانەی چۆن میری‌و دەست‌و پێوەندەکانی کەوتونەتە پیلان دانان بۆ سەر برادەران‌و گرتنیان‌و دوور خستنەوەیان لە تێکۆشان، ئەمەش یەکێکە لەو پیلانانە کە منیان گرتووەو ئەیانەوێ ئازارم بدەن یا ناوم بزڕێنن کە پیاوێکی شەڕکەرو توندوتیژم. بەچەشنێ رووداوەکەی ئەگێڕایەوە وای ئەزانی باوەڕی پێ‌ئەکەین، چونکە بەچەشنێ گوێمان لێ‌گرتبوو بەرامبەری واقمان وڕمابوو، بۆیە ئەیویست زیاتر لەسەر قسەکانی بڕوات‌و درێژەی پێ‌بدات، لەپڕ حەمە صالح دیلان دایە پڕمەی پێکەنین‌و بەدەنگی بەرز وتی هاوڕێ ئێمە یاغنیش نین، ئێمە چەند مانگە گیراوین‌و جەنابت نایەی بەلاماندا، لەگەڵ ئەوەشدا نوقوڵ‌و دیاری منداڵان‌و بوکە شوشەمان بۆ ئەنێری‌و خۆشت لە دەرەوە پیاسە ئەکەیت‌و قسەی زل ئەکەیت، دەسا نەپیلان هەیەو نەکەسی‌کە ئەگرن، ئێمە ئەو وەردیانەمان ناردو پیلانمان دانا بتگرن‌و چەند رۆژێك لامان بیت، ئێستا ئەتوانین وەرت نەگرین‌و دەرت کەینە ئەودیو چونکە باش بزانە ئەم جارە سیاسی نیت‌و شەڕکەریت، بەڵام بڕیارماندا لای ئێمە بمێنیتەوە بەمەرجێ باسی سیاسەت نەکەیت. جا سەیرت بکردایە بە چ چەشنێ توڕە بوو، چۆن دەستی کردە هێرش بردنە سەر هەمووومان، ئێمەش بێدەنگ بووین وتمان جێگەیەکی بدەنێ بانەختێ راکشێ‌و ماندوێتی دەرچێ. هەندێ بێدەنگ بوو هەر چارەکە سەعاتێکی نەبرد کەوتە قسەی خۆش‌و نوکتە گێڕانەوەی زۆرو شت لەسەر حەمە صالح‌و چەند هاوڕێیەکی کە، پاش یەك دوو رۆژ کەوتە پاڕانەوە کە بە وەردیانەکە بڵێین لێی خۆش بێت‌و مەزبەتەیەکی بۆ بدات تا بەربێت. وتی

خەڵکی حەفتەو حەفتە دێنە لاتان وا من دوو شەوە لاتانم ئیتر بەسە. بۆ ڕۆژی دوایی لە حاکمەوە بڕیاری بەربوونی بۆ دەرچوو خۆی گۆڕی و لێی دا چووە دەرەوە.

لە گەرمەی تێکۆشان و خۆپیشاندان و بەندیخانەکاندا زۆر لەم یادە خۆشانە هەیە کە برادەرانی باش و تێکۆشەری ئازاو لێهاتووی میللەتەکەمان لەگەڵیدا ژیاون و بونەتە سەرمەشقی ئەم روداوانە. هیچ برادەرێ یادی هاوڕێیان عثمان دانش و ابراهیم عبداللە و (بلە جۆرج) و حسین شەشۆیی و جلال عبدالرحمن و احمد عباس و وەهاب صالح کۆیی و جەزای میرزا حسین و عبداللە نوری افندی و کریم عبداللە (کریمی عەبە چنگیانی) و عبدول سوران و دکتۆر فارس و محرم محمد امین و محمود هەژار لەم بوارەدا لە یاد ناکات. کە هەریەکە لە جێگەی خۆیدا باسم کردوون یا باسیان دەکەم کە بونیان لە ریزی تێکۆشەراندا بایەخێکی تایبەتی هەبووە. لە روداوی سەیرسەیرو لەبیرنەکراوی ڕۆژانی تێکۆشان و بەرگریدا بەگشتی ئێمە ئەبێت ئەوە لەیاد نەکەین کە ئەو ئازارو کێشەو گیروگرفت و جموجۆڵە سیاسییە بەرەنگاریان ئەبوینەوە بەزۆری زۆرداری و ئازایەتی و لەخۆبوردنی خۆمانەوە، هەر هەموویمان کردبووە گۆڕەپانێکی خۆش و بەرەنگاریەکی نەپساوو بێکۆتایی هاتن لە ژیانماندا، کە هەمووی وەکو سەیران و ئاهەنگ ئەهاتە پێشمان و بەندیخانەمان کردبووە جێگەی حەوانەوەو فێرکردن و ڕۆشنبیری و قوتابخانەیەکی گەورە بۆ برادەران.

## بەرەی یەکگرتوو

لە سلێمانی توانرا بوو هەندێ کاری نیشتمانی و بەڕێوەبردن و رێکخستنی بەرگری میللەت بەرەیەکی فراوان دروست بکرێت لە ئێمەو برایانی پارتی و هەموو رێکخراوەکانی ئەو سەردەمە کە لیژنەیەکی سەرەکی و هەندێ لیژانی تریش پێکهێنرا. ئەم بەرەیە بێجگە لە حزبی شیوعی و پارتی هەموو یەکێتی و نەقابەکانی شاری سلێمانی لەخۆگرتبوو کە هاوڕێ وەستا عەول

نوێنەرایەتی حزبو حلمی علی شریف پارتیو خۆمو قوتابیانو حەمە صالح دیلان لاوانو عبدالرحمن صالح خلە جوتیارانو احمد مارف نانەواکانو زەکیەی مصطفی خۆشناو ئافرەتانو قادری رشید ناسك شۆفێرەکانو هەندێکی تر نوێنەر بوون. بڕیاردان بەپێی زۆرینەی دەنگ بوو لە دانیشتەکاندا، هەردەم ئەبووە مشتومڕ لە بەینی ئێمەو پارتیدا کە ئەبووە پێکەنینو گاڵتەجاڕی بەتایبەتی کە کاك حلمی زۆر قۆشمەو قسەخۆش و پلار هاوێژ بوو، هەمیشە ئەیکردە هەراو رەخنەگرتن لە ئێمە کە هەموومان هەر شیوعینو تەنها ناوەکانمان جیاوازی هەیە. ویستمان جارێك بۆ پێکەنین داوا لە نقابەی سینەماچییەکان بکەین ببنە ئەندام (کە تەنها علی فەوتاوو دووکەسی کەبوون) و بەهەموو توانایەوە کەوتە بەرگری لێیانو ئەیوت نەقابەیەکی تێکۆشەرو لێهاتوونو دەورێکی باشیان هەیەو پێویستە جێگەیان دیار بێت. ئێمە هەموو ئەمانزانی بۆ پێکەنین ئەمە ئەکاتو رەخنەیەکی گەورەیە لێمان، زۆرجار رووی دەمی ئەکردە منو ئەم شتانەی باس ئەکرد. چونکە ئەیزانی زۆر جار لەگەڵ بۆچوونەکانیدامو ئەم ووت نابێت بەرەبەم رەنگە بێت. بەڵام چار نەبوو چونکە ئەوان هیچ یەکێتییەك یا نقابەیەکیان نەبوو کە بیکەن بە ئەندام، بۆیە هەمیشە ئەماندایەوە بە چاویانداو ئەمان وت ئێوە هەر خۆتانن، ئێمە بڵێین چیو چیمان لەدەست دایە. بگرە خۆشیان هێزێکی بچوکی کەم بوون کە لە دەیان کەس تێپەڕیان نەئەکرد، بەڵام بەراستی خاوەن بیروباوەڕێکی چەسپاوو رۆشنبیرو پیاوی ناوداری شارەکەبوون کە نەئەتوانرا دەست بەرداریان بین، لەگەڵ ئەوەشدا دوو باڵ بوون ئێمە لەگەڵ هەردوو لایاندا رێك بووین، بەڵام پەیوەندی بەرەییمان تەنها بە لایەکیانەوە هەبوو، نەمان ئەتوانیو نەش ئەکرا هەردوولایان پێکەوە دانیشن. کارەکانمان بەیەکەوە ئەنجام ئەداو خۆپیشاندانەکانمان ئەکرد، برادەرانی هەردوولا بەیەکەوە لە شەقامەکانو بەندیخانەکان دەست لەناودەست، پشت بەیەکتر هەنگاوی گەورەیان ئەنا بۆ چەسپاندنی دروشمەکانی ئەو کاتەی هەردوو حزب.

## خۆپیشاندانی قوتابیان و راپەڕینی تشرین

هەر لەو ساڵەدا بە بۆنەی کردنەوەی قوتابخانەکانەوە لە قوتابخانەی ناوەندی سلێمانی خۆپیشاندانمان سازکرد کە زۆربەی قوتابیان لە گۆڕەپانی قوتابخانەکە ئامادەبوونو هەندێ وتار خوێندرایەوەو بوو بە چەپڵە لێدانو هوتاف کێشان بۆ ماوەیەکی کەمو پاشان بڵاوەی پێکرا بێئەوەی هیچ شتێ روویدات. بەڵام بۆ رۆژی دوایی چەند قوتابییەك گیراو رەوانەی بەندیخانەی سەرەوە کراین کە منو هۆگر گۆرانو ئەژی برایو امینی میرزا کریمو عمر نەمەڵیو هەندێکی کە بووین. هەموومان لەیەك ژووری بەندیخانەکەدا ئەژیاین، خۆمان رێك خستبوو بە رێکوپێکی کاتمان ئەبردە سەر تا رۆژی مەحکەمە پێمان راگەیەنرابوو بۆ خۆئامادەکردنو رەوانەکردنمان بۆ بەغدا، دەنگوباسی راپەڕینی تشرینی دووەم بڵاوبۆوە کە سەراپای شارەکانی عێراقی گرتەوە جەماهیری میللەت رژانە سەر شەقامەکانو بەرەنگاری پیاوەکانی رژێمو دەستو پێوەندەکانی بوونەوە، بە تەواوەتی میللەت لە شاری بەغدا دەستی گرت بەسەر هەموو شەقامەکانو کون قوژبنێکی شاردا. بە چەندان رۆڵەی بەجەرگی میللەتەکەمان شەهید کران، شاری سلێمانی ، شاری هەڵمەتو قوربانیش بێبەش نەبوون لەم قوربانییە کە رۆڵەیەکی تێکۆشەری بە خوێنی خۆی رێگەی ئازادیو برایەتی کوردر عەرەبی تۆمارکرد ئەویش هاوڕێ (احمدی حاجی رحیم) بوو کە لەدوای یەك دوو رۆژ تەرمەکەیان هێنایەوە بۆ سلێمانی، وەکو برادەران گێڕایانەوە رێکخراوی حزب لە سلێمانی دەورێکی باڵای هەبوو لە کۆکردنەوەی جەماهیرو هاندانیان بۆ پێشوازی تەرمی شەهید. ئەو رۆژەی گەیشتەوە سلێمانی، هەموو شار خرۆشاو کەوتنە خۆئامادەکردن بۆ هەڵمەتو هێرش بردنە سەر میریو سەپاندنی دروشمەکانی حزبو ناشتنی تەرمی هاوڕێ احمدیش بکرێتە رۆژی سەرکەوتنی میللەت. ئەوەبوو بڕیاردرا هەموو جەماوەری شاری سلێمانیو دەوروبەری بەتایبەتی هەڵەبجە

کە شەهید خەڵکی ئەوێ بوو، بەرەو گۆڕستانی سەیوانی ببەن بە هەڵگرتنی شاپلیتەی گڕاویەوە تا ڕێگەیان بۆ رووناک بکاتەوە، چونکە ئێوارەیەکی درەنگ تەرمەکە گەیشت. هەر بە گەیشتنی تەرمەکە خەڵکی بەرەو مشیراوا ڕۆیشتن تا لەوێ پێشوازی لە شەهیدی حزبو گەل بکەن بەهەموو شەقامەکانی شاردا بەرەو مەزاری دوایی بیبەن. زۆر بە ڕێکوپێکی خۆپیشاندەران لەدوای تەرمەکەوە ئەڕۆیشتن بە هوتاف کێشانو هۆنراوەو وتار خوێندنەوە تا گەیشتنە گردی سەیوان. لەوێ هاوڕێ کمالی کریم بەگ بەناوی حزبەوە وتارێکی ئاگرینی خوێندەوەو بەخێرهاتنی خەڵکەکەی کردو بڕیاری جەماوەری تازە کردەوە کە ئەبێت خوێنی شەهید بەفیڕۆ نەڕواتو لە تێکۆشان بەردەوام بین تا هەموو ئاواتەکانی میللەت دێتەدی. دوای ئەوبرای شەهید محمود حاجی رحیم وتاری بنەماڵەی خوێندەوە، پاشان یەك دوو هۆنراوەو وتاری تر پێشکەش کراو کۆتایی بە مەراسیمەکە هاتو بەرەو شار گەڕانەوە لە خۆپیشاندانێکی زۆر ڕێكوپێکدا کە میری بەهیچ جۆرێك نەیتوانی بەرەنگاری بێتەوە تا بەشێنەیی لە شەوێکی درەنگا کۆتایی پێ‌هێنرا. ئێمەش لە بەندیخانەوە هەموو شت ئاگاداربووین باش گوێمان لە دەنگی خۆپیشاندەران بوو. هەرچەندە ئەوشەوە هیچ رووی نەدا، بەڵام بەیانی هەر ئەوەندەمان زانی دەرگای بەندیخانە کرایەوەو بە دەیان لە برادەرانیان کردە ژوورەوە لامان، ئێمەش بەپێی پێویست جێگەمان بۆ سازکردن. لەوانەش احمد مارفو احمد حبیبو علی عبدالله (بۆسکانی)و کمال سلێمانو جلال عبدالرحمنو علی فەوتاو عبدالرحمن تۆفیق (عبدالرحمن شیوعی)و صادقی بۆیاخچیو هەندێ برادەری هەڵەبجەییو برادەرانی پارتی وەکو محرم محمد امینو عبدولی سورانو قادری حاجی حسینو دکتۆر فارس، کە هەندێکیان لای جلال امین بەگو نوری احمدی طه جێگەیان بۆ تەرخان کرا لە سورەکە کە لە دەرەوەی بەندیخانەکە بوو. هەر لەپاش رۆژێك هەموو ئیشوکارێکمان ڕێك خستو کەوتینە چالاکی رۆشنبیریو ڕێکخستن. بەڵام هەروەك پیشەی جارانمان، بۆ

پێکەنین و کات بردنە سەرو خۆشکردنی گوزەرانمان، هەموو شەو دەست ئەکرا بە بەستنی کۆڕی هەڵبەست خوێندنەوەو گۆرانی و گێڕانەوەی سەرگورشتەی هەمەجۆر، چەند برادەرێکمان لەگەڵدا بوو کە لەسەر سیاسەت نەگیرابوون، هەریەکەی لەسەر شتێ بەندبوون و لەوێ بوبوونە برادەری ئێمەو لەگەڵماندا ئەژیان و رۆڵێکی چاکیان هەبوو لە باشکردنی ژیانماندا. لەوانە مام پیرۆتی قەڵادزەیی (پیرۆت کەردن) و حەمەی رەشەخێڵ و محمودی حاجی سعیدو زۆری کە. هەر لەگەڵ ئەمانەشدا چەند مەلایەکی لێ بوو زۆر ناکۆك بوون لەگەڵماندا، هەرچەندە ئێمە لەگەڵیاندا رێك بووین و نەمان ئەهێشت پەتی بەینمان بپچڕێ، بەڵام هەندێ شت روویدا کە بەینمان نەختێ تێك چوو. ئەگەر ئەو برادەرانە نەبوونایە بەتەواوی ئازاریان ئەداین. هەرچەندە لەم گێرمەوکێشەیەدا توانرا ناوی شیوعی بەسەر هاوڕێ عبدالرحمن تۆفیق دا بسەپێنرێ و ببێتە عبدالرحمن شیوعی کە بەزۆر لەژێر دەستیاندا دەرمان هێناو لەمردن رزگارمان کردو بەکاتێکی کەم بردمانە سوورەکە لای جلالی امین بەگ و نوری احمدی طه.
بە نیازی خۆرێکخستن و دابەشکردنی ئیشوکار هەریەکە بۆ ئیشێ دەست نیشان کراو ئیشی خۆی وەرگرت. بە فیتی هاوڕێ احمدی مارف، کاك صادق حبیب (صادقی بۆیاخچی) کرایە سەرپەرشتی خواردەمەنی کە هەموو جۆرە خواردنێکی تیادابوو هەر لە خورماو گوێزو مێوژو بادامێکی زۆرو هەموو چەشنە میوەیەك، کە لێپرسراوی نوێ (کاك صادق) دەنگی بە باوکی نەئەدا بەپێی بڕیاری خۆی و لیژنەی حزب و لەکاتی دیاریکراودا نەبێت. شەوی وا هەبوو لەنیوەشەدا خەبەریان ئەکردەوەو رویان لێ‌ئەناو ئەیانوت هاوڕێ دەنکێ خورما یا هەڵوژەیەك بخۆین، ئەویش بە چاوی خەواڵووەوە دەستی ئەکردە هێرش بردنە سەریان و دەنگەدەنگ و هاوارهاوارو زۆرجاریش جنێودان بە هاوڕێیان. ئێمەش هەمووومان ئەچووینە پاڵی و کاك احمدو عمر نەمەڵیمان گوناهبار ئەکرد کە رێکوپێکییان شکاندووە، بەم جۆرە بێدەنگمان ئەکرد. ئێمەش تا درەنگ نەدەنوستین، بە قسەو گفتوگۆوە خۆمان خەریك ئەکرد،

صـادقیش هـەر لـە ئێـوارەوە لەبـەر هیلاکـی ئەنوسـت، بـرادەرێ ئـەچوو خواردنەکەی ئەهێناو دەست ئەکرا بە خواردنی و ئەوەی ئەمایەوە لەملاولای جێگەکـەیدا بڵاوئەکرایـەوەو پێڵاوەکانیشـی دوور ئەخرایـەوە. جـا بـرادەرێ ئەچووە سەری و ئەیوت هاوڕێ صادق هەستە میزەکەت بکە، یا ئەیوت بزانە کێ شتەکانی خـواردووە، ئـەویش لـەپڕ خەبـەری ئـەبووەوە پێڵاوەکـانی دیارنییەو دەست ئەگێڕێ توێکڵ و پاشماوەی خواردنەکان لەسەر جێگاکەی و دەوروپشتی فرێدراوە. ئەیکردە هەراو جنێودان و هێرش بردنە سەربرادەران و ئەیوت طبەقەی عاملەی حیزو دز ئەم شتانەیان لێدزیوم. ئەمە رێك و پێکی نییە! مـن ئـەم ئیشـە ناکـەم. هـەتا بێدەنگمـان ئـەکرد هـەموو بەندیخانەکـەی بەخەبەر ئەهێناو نوستن نەئەما. احمدی مارف و عمر نەمەڵیش خۆیان ئەکرد بە نوستوو هەروەکو ئاگایان لەهیچ نەبێت، بۆ بەیانیش پێی رائەگەیاند کە بە نوسین رەخنـەی خۆی بگرێ و شکی لە کێیە بینوسێ. ئەمە هـەموو شـەوێ ئیشمان بوو، بەم چەشنە هەر جارە بە رەنگێك کاتمان ئەبردە سەر. لەم کەشە خۆش و پـڕ حەوانەوەیـەدا بیرمـان لـەهیچ نەئـەکردەوە ناومـان خوێندرایـەوە رەوانـەی بەغدادمان بکەن و لە هاوڕێیـان دورمـان خەنـەوە، کە بـە ڕاسـتی زۆر نـاخۆش بـوو. پـاش رۆژێـك ئۆتۆمبێـل و پۆلیس و کەلەپچـەیان ئامـادەکردو ئێمەیان بردە بەردەرگاو دووبەدوو بەیەکەوە کەلەپچە کراین، و زۆر بە توندو تیژی لەگەڵماندا ئەجولانەوەو پارێزگارییان ئەکردین، ئێمە نەمان ئەزانی چییە تا چووینە دەرەوە روانیمان بە دەیان قوتابی و خزم و کەسوکارمان بەر شەقامی بەندیخانـەیان گرتووەو کۆمـەڵیان کردووە. هـەر ئێمـەیان دی دەسـتیان کـردە چەپڵەلێدان و هوتاف کێشان، دەنگی ئەوان و سرود خوێندنـەوەی ئێمـە تێکـەڵ ئەبوو. تـا ئەهات خـەڵکی زۆرتر ئـەبوون بۆیە بە پەلەپـەل و شڵەژاوی سـواری ئۆتۆمبێلیـان کردین و کەوتینە رێ. خەڵکەکە رێگـەیان نەئەدا تـا خواردنێکـی زۆرو جل و بـەرگی تـەواویان بـۆ هێنـاین و دەسـت کـرا بـە دەسـت گوشـین و ماچکردنمـان و چەپڵـە لێـدان رەوانـەیان کردیـن بـەرەو کرکـوك و لـەوەیوە بـۆ

بەغدادو لە بەندیخانەی وشاش فڕێیان داین و هەموومانیان خستە ژوورێکی بچوکەوە کە کونێکی بچوك لە دەرگا ئاسنەکەیدا بوو لەوێوە قسەیان لەگەڵ ئەکردین و خواردنیان بۆ فڕێ ئەدایە خوارەوەو رۆژی سێ جار ئەیان بردینە دەرەوە بۆ کاتێکی کەم بۆ ئاودەستخانە. تەنەکەیەکی بچوکی تیابوو بۆ میزکردن و دەست و دەم شتن لەسەری، دۆلکەیەکی ئاومان لابوو کە ئەبوایە بە نۆرە ئاوی لێبخۆینەوە یا دەم و دەست و چاومانی پێبشۆین چونکە بۆیان پڕنەئەکردینەوە، هەر کە پڕیشیان بکردایەتەوە ئەبوایە هەندێ جنێوو زللەو مستەکۆڵە بخۆین. لەبەر ئەوە زۆر ئاگاداری ئاومان ئەکردو دەستمان پێوە ئەگرت، هەموو جارێ برادەران لەگەڵ مندا ئەیانکردە هەرا کە نەختێ ئاوم لە دەمم وەرئەداو ئەیان وت ئەم ئاوە هی خواردنەوەیە نەك دەم‌ودان شتن.

لە ژوورەکەدا کە تەنها من و امینی میرزا کریم و هۆگر گۆران و ئەژی برای و عمر نەمەڵی گرتبووە خۆی نەمان ئەزانی شەوو رۆژ چییە لەبەر تاریکی و کپی ژوورەکە، بێجگە لە تەسکی جێگەکەمان کە رێگەی ئەم دیوو ئەودیومان هەرنەبوو، هەرچۆنێك بجولاینایەوە لەیەك ئەکەوتین. زۆر کاتمان بە خوێندنەوەی هەڵبەست و چیرۆك گێڕانەوەو قسەی خۆش ئەبردە سەر. زۆر جاریش ئەبووە باسی هەندێ کێشەی کۆمەلایەتی و لێکۆڵینەوەی بارودۆخی وڵات. لەملامانەوە ژورێك تەنها برادەرێکی تیابوو دانیشتوی بەغداو مهندس بوو ناوی فاضل بوو، هەموو دەنگوباسێکمان بەهۆی ئەوەوە ئەگەیشتێ، ئەویش بەوەی کە بە پەنجە لە دیوارەکەی ئەداو وەکو رێکەوتنێکی نهێنی لە نێوان خۆماندا لێی حاڵی ئەبووین، یا هەندێ جار گەر قسەکە درێژ بوایەو سەربازەکان لەوێ نەبونایە لە کونێکی بچوك کە لە دیوارەکە کرابوو قسەی بۆ ئەکردین. ئەملایشمان ژورێکی کۆتایی قاعەکە پیاوێکی بەتەمەنی لەگەڵ دوو کەس تیادا ئەژیا، خەڵکی چەمچەماڵ و وابزانم ناوی سعید هەمەوەندی بوو، کە هیچ پەیوەندیەکمان لەگەڵیدا نەبوو لە هاتنە دەرەوەدا سلاومان لەیەکتر دەکرد، هاورێ فاضل لەگەڵ عمر نەمەڵی دا بەینیان خۆش بوو، عمر بە

عەرەبیەکەی خۆی قسەی بۆ ئەکردو نیوەونیوە چڵ لەیەك ئەگەیشتن، ئەمەش ئەبووە هۆی پێکەنین و دەنگەدەنگ. زۆرکەڕەت سەربازەکان ئەهاتنە سەرمان و هەڕەشەیان لێ ئەکردین، بەڵام لێبوردنیان هەبوو، تا ئێوارەیەك کردبوومان بە ڕۆژی خۆمان، بە پێکەنین و قسەو شەڕە شیعر، لەپڕ سەربازەکان هاتنە بەر ژوورەکەو ئەفسەرەکە لە پێشیانەوە دەرگایان کردەوەو دەستیان کرد بە جنێودان و هەڕەشەکردن لێمان و لێدانی ئەژی. چونکە چاویان لێبوو دەستی ئەجوڵان و بەدەنگی بەرز قسەی ئەکردو دەنگێکی جیاوازو تایبەتی هەبوو لە ئێمە. ئەژی بەتوندی وەرامی دانەوەو بوو بە شەڕەقسەو منیشی گرتەوە چونکە بەرگریم لە ئەژی کرد پاشان هەردووکمانیان بردە دەرەوەو لە ڕاڕەوەکە لە سوچێکەوە هەردوو دەستیان بەستین و هەڵیانواسین بە پەنجەرەیەکداو کەوتنە لێدانمان تا هیلاك بوون، جا بەجێیان هێشتین وئەوشەوە تا بەیانی بە هەڵواسراوی ماینەوە وێڕای برسێتی و تینوێتی و ئازاری لەشمان لە سەرماندا هەڵئەلەرزین چۆقەچۆقی دانمان ئەهات. بەڵام هەرچۆنێك بوو خۆمان ڕاگرت و بۆ یەکتری ئەدواین و ئەژی هەندێ جار هەڵبەستی شۆڕشگێڕی ئەخوێندەوەو قسەی زلی بۆ ئەکردم، هەرچەندە ئەفسەرەکە جارناجارێ ئەهاتە سەرمان و لێدان تازە ئەبووەوە، بێ ئەوەی هیچیان لێمان بوێ یا داواکاریەکیان هەبێت، بەڵام کە ئەفسەرەکە قاعەکەی بەجێئەهێشت، سەربازەکان هاتن بەلامانەوەو نەختێ دڵنەوابیان کردین و ئاویان کرد بە دەممانەوەو پێناخۆش بوونی خۆیان بۆ دەربڕین. وادیاربوو ئەفسەرەکە ئەمە پیشەی هەموو شەوێکی بوو، چونکە دوایی بۆمان دەرکەوت کە زۆر برادەری بەم دەردەبردووە. بەیانی زوو دیسان بە جنێودان هاتە سەرمان و دەستمانی کردەوەو بە لێدان و پاڵنان خراینە ژوورێ. کاك امین هەندێ جار قسەیەکی خۆشی دەرئەپەڕان و پلارێکی ئەهاویشت. ئەمجارە بە دەنگی بەرز وتی بەخوا ئەمشەو جێگەمان خۆش و فراوان بوو. بە پێکەنینەوە وتی کوا هەموو شەوێ دووان بەرنە دەرێ و جێگەمان خۆش بێت، ئەژی وەرامی دایەوەو وتی ئەمجارە سەرەتە. ئەمانەمان

هەموو بە هاوڕێ فاضل وت‌و کردییە پێکەنین‌و وتی ئەبوایە کاک عمریشتان لەگەڵدابوایە، پێ‌ی ڕاگەیاندین کە یەك دوو ڕۆژی تر ئەم ئەفسەرە لێرە نامێنێ‌و ئەگۆڕێ‌و گوزەرانمان چاك ئەبێت. هەواڵەکە ڕاست بوو سەرجەم گۆڕانێکی باش بەسەر هەموو بەندیخانەکەدا هات، دەرگامان لێ‌کرایەوەو ڕۆژ تا ئێوارە لە دەرەوە بووین، هەموو برادەران یەکترمان ئەدی. ئەفسەری لێپرسراویش گۆڕراو ئەفسەرێکی لاوی خەڵکی بەصرەمان بۆ هات کە زۆر یارمەتی ئەداین، خەستەخانەمان بۆ کرایەوە، خواردنمان چاك بوو، ئێمەش خۆمان ڕێکخستن‌و نەختێ بە خۆماندا هاتین. هاوڕێیەکی خەڵکی بەغدا کە ناوی عبدالستار بوو قوتابی کۆلێژی پزیشکی بوو بووە نوێنەری هەموومان لای بەڕێوەبەری بەندیخانە. هەر لەم کاتەدا برادەرانی سلێمانی گەیشتنە لامان‌وجێگەیان بۆ ئامادەکراو علی فەوتاومان کردە نوێنەری دووەم لەگەڵ عبدالستارداو بەجووتە ئیشوکاریان ئەبرد بەڕێوە. کاك علی لەگەڵ بەڕێوەبەردا زۆر ڕێك بوو، زۆربەی کاتیان بەیەکەوە لە گۆڕەپانی بەندیخانەکەدا کە زۆر گەورە بوو ئەبردەسەربە پیاسەو بەدەم یەکترەوە پێ‌ئەکەنین‌و هەندێ جاریش دەست بازیان ئەکردو بە علی ئەووت هاوڕێ علی‌و ئەمیش ئەوی بە هاوڕێ بانگ ئەکرد. هەموو کاتێ کە ئەهاتە ژوورێ ئەم بەرەوڕووی ئەچوو پێویستی ڕۆژانەی ئەدایە تا بۆمان جێ‌بەجێ‌بکات. هەموو جارێ لە پشتەوە دەگەیەکی لەسەر شانی ئەدا، ئەیوت شنو های هاوڕێ، کاك علی ئەیووت های دەگە شیوعی. لەکاتی ئەم لێپرسراوەدا گوزەرانمان زۆر باش بوو، خۆمان باش ڕێکخستبوو لە هەموو لایەکەوە لەسەر ڕاپەڕینی تشرین لە هەموو چەشنە خاوەن بیرو باوەڕێك گیرابوو لەگەڵماندا. هەر لە پارتی‌وو شیوعی‌و بەعثی‌و نەتەوەیی‌یەوە، هەموو بەیەکەوە ئەژیاین. لەناو نەتەوەییەکاندا (شاكر الجاكري)مان لەگەڵدا بوو لەگەڵ علی فەوتاودا زۆر ڕێك بوون، هەردەم علی هێرشی ئەبردە سەرو هەڵبەستەکەی جواهری بۆ ئەگۆڕی‌و بە گوێیدا ئەدا ئەیووت (سلاما على شاكر الجاكري، سلاما على لقلق الطائري، سلاما على

ثعلب الماكري) بەم چەشنە تووڕەی ئەکرد. ئەویش ئەیوت (انت هم كردي، هم شيوعي، هم صاحب وجه الضيج). ئێمەش هەندێ جار سەرمان ئەکردە سەر علی فەوتاوو پێمان ئەوت بەخوا ئەمانە بەشتێکی سەیرت ئەزانن و تۆیان خۆش ئەوێ و قسەی خۆشت لەگەڵدا ئەکەن. جا بەڕاستی زۆریان خۆش ئەویست و رێزیان لێ ئەنا بەتایبەتی کە بڵاومان کردبۆوە ئەمە کوڕێکی زۆر قۆزو جوان بوو لە خۆپیشاندانەکاندا دەموچاوو لوتی وای لێهاتووەو ئێستاش هەر کوڵ نادات. لە بەندیخانەدا زۆر لە برادەرنی‌کەمان لەگەڵدا بوو وەکو عبدالوهاب القيسي و عبدالوهاب الطيارو حميد نحش و نەجیبی برای کە زۆر منداڵ بوو لەگەڵ عبدالستار الظاهرو زۆری تر... لەگەڵ گۆرانی بێژی عێراقی فاضل رشيد کە ئەوسا تازە پێ ئەگەیشت و هەمیشە گۆرانی بۆ ئەوتین و دانیشتنەکانی ئەڕازانەوە. لەم کاتی خۆشی و حەوانەوەیەدا پێمان راگەیەنرا کە خۆمان ئامادە بکەین بۆ مەحکەمەی عورفی، بەیانییەك زوو خۆمان پێچایەوەو هاتن بەشوێنماندا، سواری ئۆتۆمبێلێکی گەورەیان کردین هەمووی ژوورژوور بوو هەردوانمان بۆ ژوورێك و ئەبوو بەپێوە بوەستین، تەنها پەنجەرەیەکی بچوکی تیادا بوو ئەبوایە خۆمان بەرزکردایەتەوە ئەوسا دەرەوەمان ئەبینی، دیوارەکانی هەر هەمووی بەناوی تێکۆشەران و هەڵبەست و هەندێ هێرش بۆ سەر رژێم و هەوڵدان بە تێکۆشانی شیوعییەکاندا بوو، ئێمەش یەك بەیەك ناوی خۆمان و رۆژی گرتنمان وەکو ئەوان تۆمار ئەکرد لەگەڵ هەندێ نوسینی هەڵبەستی شۆڕشگێڕی کوردی و دروشمەکانی ئەوسای حزب. زۆر بە رێگەوە بووین، زۆربەی شەقامەکانی بەغدادیان گێڕایان، تا لەپڕ وەستان و هاوارمان لێکرا کە دابەزین، بە پاڵ پێوەنان و بۆڵەبۆڵ بردیانینە ژوورێکەوە بە چەندان خەڵکی تیادابوو بۆ مەحکەمە هێنابوویان و چاوەڕوانی مەحکەمە بوون هەر کۆمەڵێك لە سەعاتێ کەمتریان پێ ئەچوو بە حوکمێکی زۆرەوە ئەهاتنە دەرێ، هەندێ جار بە هاوارهاوارو هوتاف کێشانەوە بە ژیانی حزب و جووڵانەوەی نیشتمانی داو پۆلیسەکانیش لەدواوە دارکارییان

ئەکردن‌و نەیان ئەهێنانە لای ئێمەو بەرەو ژوورێکی‌کەیان ئەبردن‌و لەوێوە ڕەوانەی بەندیخانەیان ئەکردن، ئێمەش لەدەرەوە بە دەست‌و بەسەر سڵاومان بۆ ئەناردن، هەندێ جاریش بە هوتاف کێشان بەڕێمان ئەکردن.ئێمە تاکاتێکی درەنگ بەم چەشنە ماینەوە بۆ ئەوەی بانگمان بکەن‌و لێمان بپرسنەوە، وای بۆ ئەچووین دوائەخرێین بۆ ڕۆژێکی کە، بەڵام لەپڕ ناومان خوێندرایەوەو بانگیان کردین‌و براینە بەردەم ئەو جەلادانە. لە قاعەیەکی گەورەی پڕ لە کورسیدا، چەند ئەفسەرێ بە روتەبەی گەورە لە پشت مێزێکەوە دانیشتبوون، یەکێکی کەش لەم لایانەوە گوایە مدعی عامە، کە مەحکەمە دەستی پێکرد، پێشەکی پیاوێکی ئەفەندیان هێنا کە مەحکەمە داینـاوە بە پارێزەرمان‌و بەرگریمان لێبکا. مدعی عام دەستی کرد بە قسەکردن‌و هێرش بردنە سەرمان، کە ئێمە گێرە شێوێنین‌و سەرمان لە قوتابی‌و مامۆستایان تێکداوەو هەڵساوین بە خۆپیشاندان هێرشمان بردووەتە سەر ڕژێم وپیاوە گەورەکان لەبەر ئەوە داوای ئەوە ئەکات حوکمێکی زۆرمان بەسەردا بدرێ. جا نۆرە هاتە سەر شاهیدەکان، کە بەداخەوە بەڕێوەبەری قوتابخانەو جێگرەکەی‌و مامۆستاکەی خۆمان بوو. هەریەکە قسەی خۆی کردو ئێمەی تاوانبار کرد بەوەی کە هەستاوین بە هاندانی قوتابیان بۆ خۆپیشاندان‌و گێرە شێوێنی‌و پەیڕەوی قوتابخانەمان پێشێل کردووە، گوایە لای خۆیانەوە سزادراون‌و لە قوتابخانە دەرکراون‌و ئێستاش نۆرەی ئێوەیە سزایان بدەن، هەرچەندە داوای لێبوردنیان بۆ ئەکەین. دوای ئەوانیش پارێزەرەکەمان وتەیەکی خوێندەوەو داوالێبوردنی بۆ کردین گوایە هەموو لاوین‌و ئەمە یەکەم جارمانە. ئێمەیان بۆ چەند ساتێك کردە دەرەوە بێ‌ئەوەی هیچمان لێبپرسن ئایا ئەمە ڕاستە یان نا، پاش ساتێك بانگیان کردین لێیان پرسین ئێوە ئەڵێن چی؟ ئێمەش هەریەکەمان کەمێ قسەی کردو پێیان بڕین، گوایە ناهێڵن ئەوەندە لەسەری بڕۆین‌و بێدەنگیان کردین‌و کەوتنە مشتومڕ لەبەینی خۆیاندا بۆ ئەوەی بڕیارمان بۆ دەرکەن. لەم کاتە بێدەنگیەدا هۆگر گۆران نەڕانی‌و وتی قسەم هەیەو ئەبێ گوێم لێ بگرن. لێ‌ی

تووڕەبوون و بەدەست ئیشارەتیان کرد کە بێ دەنگ بێت سوودی نەبوو ڕێگەیاندا. هاواری کرد پڕ بەدەمی و نەڕانی و وتی ئەم مەحکەمەیەی ئێوە قەرە قوشییەو هیچ باوەڕمان پێ ی نییە، بەتایبەتی مامۆستای خۆمان کە وەکو باوکمان وان بێن شایەتیمان لێ بدەن. ئێمە بەمانە قایل نابین، ئەوانە ئەبێ خوێندنمان فێر بکەن و ڕێگەی باشمان نیشان بدەن نەك شاهیدی درۆمان لەسەر بدەن، ئەوانە هیچ کامیان لە ژووری خۆی نەهاتۆتە دەرێ کاتی خۆپیشاندانەکەو ئەمە هەمووی درۆیەو هەڵبەستراوە، داوا ئەکەین ئەوان مەحکەمە بکەن لەسەر درۆکانیان و سزابدرێن چونکە بەرامبەر قوتابی خۆیان درۆ ئەکەن و قسە ئەکەن. کاك هۆگر بەعەرەبییەکی باش و بەخێرایی ئەم قسانەی ئەکرد. کاك امین لەلاوە بۆڵەیەکی کردو وتی بەخوا کێشەکەی قورس کرد بە سەرمانداو هێجگار حوکمان زۆر ئەبێت. هەر لەوکاتەدا عمر نەمەڵی هوتافێکی کێشا و منیش بۆم سەندەوە. بووە هەراو لێدانمان و دەم کوت کردنمان. ئێمە بێدەنگ بووین دیسان ئەفسەرەکان کەوتنەوە گفتوگۆکردن لەگەڵ یەکترو بڕیاری حوکمیان بۆ خوێندینەوە کە یەکی ٣ مانگ حوکم یا ٢٠٠٠ دینار کەفالەت، ئەمەش لەبەر ئەوەی قوتابین و ئەبێ ڕێگە ڕاست بگرین. هەر لەبەرچاوی ئەوان بە شەق و مستەکوڵەو پاڵ پێوەنان ڕاپێچی دەرەوەیان کردین و لە سوچێکەوە ڕایان وەستاندین تا ڕەوانەی موقف سەرامان کەن، دیسان خستیانینەوە ژووری لۆریەکەوەو ئێمەش هەروەکو ئەوانی تر هەریەکە حوکمی خۆی لەسەر دیواری ژوورەکەنوسی و بە خوێندنەوەی سروودی نیشتمانی گەیاندیانینە موقف سەرای لای برادەرانی کە. لەبەر ئەوەی هەر بە توقیفی ٣ مانگمان تەواو کردبوو ڕەوانەی بەندیخانە نەکراین، بەڵکو هەموومان گەڕاینەوە سلێمانی و لەوێ بەردراین.

## گەڕانەوەمان بۆ ناو ڕێکخستنەکان

دوای بەربونمان لە سلێمانی بەچەند ڕۆژێ هەریەکەی گەڕایەوە بۆ ئیشوکاری حزبی خۆی و کەوتینە جموجۆڵ و هەڵسوکەوتی ڕێکخستن کە بەر کەموکوڕییەکی زۆر کەوتبوو بەهۆی گرتنی زۆربەی برادەران و هەندێ گێرمەوکێشەی سیاسی و ڕێکوپێکییەوە کە هەڕەشەی پارچەپارچەبوونی حزبی لێ ئەکرا. هەر لەم کاتەدا وەکو برادەران بۆیان گێڕاینەوە، ئەوانەی لەسەر راپەڕینی تشرین گیرابوون هەموویان لە مەحکەمەی عورفی هەریەکەی بە ٦ مانگ حوکم درابوون و ڕەوانەی بەندیخانەی گەورە کرابوون، کە یەکسەر بەسەر کێشەیەکی گەورەی حزب دا ئەکەون، ئەویش حزبی کردە دووبەش و راية الشغيلة جیابوونەوە لەبەر ئەوەی زۆربەی برادەران بەم شتانە نامۆ ئەبن، کێشەیەکی گەورەی بۆ دروست کردبوون، ئایا لایەنی چ لایەك بگرن، شەڕو ئاژاوە هەموو بەندیخانەی گرتبوو. برادەران ژیانیان لێ تاڵ بوبوو زۆربەیان نەیان ئەزانی بەرەوکوێ راپێچ ئەکرێن و دوارۆژیان چۆن ئەبێت. ئا لەم کاتەدا علی فەوتاو کە لەگەڵ برادەراندا ئەبێت لە کۆبوونەوەیەکدا ڕووئەکاتە هاوڕێ عزالدینی مەلا مصطفی (دکتۆر عزالدين) پێی ئەڵێ من نازانم لای کام لابم پێم بڵێ با خۆم ساغ بکەمەوە، بەشەرەف و ناموس کە چوومە دەرێ پێم بڵێن علی انتهازییە تۆ ئەکوژم، چ لایەکیان راستە بمبەرە لای ئەوەیان، هاوڕێش پێی ئەڵێ حزبەکەی خۆمان راستە، هەر ئەو حزبە و ئەوان لێی جیابوونەتەوە انتهازین، ئێمە هەر لەگەڵ ئەودا ئەمێنینەوە بەمە دڵی علی خۆش ئەبێت، کە هاتیشەوە سلێمانی هەموو برادەران هەر لەگەڵ حزب دا بوون و یەکێك نەبوو بە علی بڵێت انتهازی، هەردەم ئەیووت من قوتابی هاوڕێ (عزالدين)م و ئەو ڕێگەی نیشاندام.

لەو کاتەی ئێمە لە سلێمانی نەبووین چەند کۆبوونەوەو سەیرانێك کراوە بۆ قوتابیان و کاسبکاران بەهەموو توێژەکانیەوە لە تانجەرۆو سەرچنارو

زۆر جێگەی دی، کە گەورەترینیان و بە نرخترینیان کۆبوونەوەی چقڵاوەیە کە بووەتە بنەمایەکی مێژوویی لە ژیانی تێکۆشەرانی سلێمانیشداو هیوادارم ئەوانەی بەشدارییان تیادا کردووە شتێکی لەسەر بنوسن.

هەر لەو سەردەمەدا دیسان کەوتینەوە ئیشکردن و ڕێکخستن لەسەر ئەو ڕێگەیەی جاران لەسەری ئەرۆیشتین کە خۆی ئەنواند لە دیموکرات کردنی ڕێکخستنەکانماندا کە تا ڕادەیەك جێگەی خۆی گرت و سەرکەوتنی بەدەست هێنا. لەلای ئێمە توانیمان بنەمای یەکێتی قوتابیان بەربلاوبکەین و هەمە جۆر لیژان دروست بکەین و ئەو کێشەیەی بوبووە بەربەست لە بەردەمماندا تا ڕادەیەك یەکالای بکەینەوە، ئەویش گۆڕینی ناوی یەکێتی قوتابیان بوو بۆ یەکێتی قوتابیانی کوردستان و مەڵبەندێکی سەرەکی بۆ دروست بکەین کە یەکسەر پەیوەندی بە یەکێتی قوتابیانی گشتی عێراقەوە هەبێت. ئەم کێشەیە دەمێك بوو هەبوو بێ چارەسەر مابۆوە. برادەرانی یەکێتی گشتی بەهیچ جۆرێك دانیان پیانەئەنا و بەرهەڵستییەکی گەورەیان ئەکرد و ئێمەی خستبووە ململانێیەکی توندەوە لەگەڵیان، ئێمە توانیمان لە سلێمانی لیژنەی شار پەرە پێبدەین و بتوانین ڕۆڵی تایبەتی خۆی ببینێ، کە بێجگە لە امین میرزا کریم و کمال مصطفی و فؤاد مجید لە لیژنەدا دانران. هاوڕێ عزالدینی مەلا مطفی بووە ئەندامێکی لاوەکی لیژنەکەمان چونکە لە بەغداد ئەیخوێند. هەر بهاتایەتەوە سلێمانی لەگەڵماندا دائەنیشت کە بەڕاستی کۆبوونەوەکانمانی دەوڵەمەند ئەکرد. هەموو جارێك کاك فؤاد مجید سەری ئەکردە سەری و ئەیوت با هاوڕێ عزالدین دواهەمین کەس قسەبکات و باسی هەموو عالەم بکات.
هەندێ لە برادەرانی تێکۆشەری تریش لە دەورمان بوون بەسەر لیژنەکانی خوارەوەدا دابەش بوبوون ڕۆڵێکی باشیان بۆ ئەبینین، لەوانەش فرج احمدو جلالی میرزا کریم و حەمە کاکە و هۆگر گۆران و جەزای میرزا حسین و کریمی عەبە چنگیانی و علی مصطفی خاڵ و کمال ڕەمزی و براکانی و اکرمی صالحی ڕەشە و صلاحی علی ئایشە خان و زۆر لە برادەرانیکە. بەڵام ئێمە هەموو ئیشوکارەکانمان بەدڵ نەبوو ئەمان ویست باشتربین و بەو چەشنە بێت کە

بگونجێ لەگەڵ گۆڕانکارییەکاندا. هەردەم بۆ چارەسەرێك ئەگەڕاین کە ئەبێت یەکێتی ببێتە یەکێتی هەموو قوتابیان و تاڕادەیەك لە ڕێکخستنی حزبی جیابکەینەوە تا قوتابییانی بێلایەن و ڕۆشنبیر لێمان کۆبێتەوە و یەکێتیش دروشمە ڕاستییەکانی خۆی هەڵگرێ لە خوێندن و تەندروستی و چاککردنی ژیانی قوتابیان، ئێمە گەیشتبووینە بۆچوونێك ئەم تێکۆشەرانە لە قوتابیانەوە دوور بن، زۆربەمان لە خوێندن دواکەوتوین و لە قوتابخانەی شەوین، هەموو ساتێك بەڕێی بەندیخانە و ڕاکردن و خۆشاردنەوەین و ڕادەی زانیاریمان لەچاو قوتابیانی تردا نزمە و هەریەکەی بەچەند ساڵێك پۆلێك ئەبڕین، ئەمەش لەوەوە نەهاتبوو کە گوایە زیرەك نین بەڵکو باری ژیان و تێکۆشانمان ئەوەی خستبووە ڕێمان، بۆیە بیرمان کردەوە کە ئەبێت هەنگاوێکی بەپەلە بهاوین بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە. پێشەکی بڕیارماندا بچینە لای چەند قوتابییەکی زیرەکی ئەو کاتە کە بە هانامانەوە بێن و بتوانین لەگەڵیاندا چەند خولێکی تایبەت بکەینەوە بۆ بەرزکردنەوەی ڕادەی زانیاری قوتابیان بۆ سەرکەوتنیان لە تاقیکردنەوەکاندا. ئەوەبوو توانرا کاك محمود علی عثمان و نزار مجید و رفیق فتح الله و کاوس تۆفیق و چەندانی تر بۆ ئەو مەبەستە هاوکاریمان بکەن، هەرچەندە زۆر برادەری تریش ئامادەبوونی خۆیان نیشانداو ڕۆڵی تایبەتیان هەبوو لەم گورج وگۆڵییەدا. وەکو کمال ڕەمزی و علی خاڵ و عبدالله خلف و... هتد.

ئەم کارەمان دەورێکی باشی ئەبینی و ڕێگەیەکی فراوانی بۆ کردینەوەکە زیاتر بە خۆماندا بچینەوە بۆ بەربڵاوکردنی ڕێکخستنەکانمان، ئەوەبوو توانرا چەند قوتابییەکی لاحزبی و دیموکراتی بخەینە لیژنەی قوتابیانەوە وەکو محمد حسن کە قوتابییەکی زیرەك و خوێندەوارێکی باش بوو خەڵکی گەڕەکی صابونکەران بوو، خاوەن کەسایەتییەکی ناسراو و خۆشەویست بوو. رفیق فتح الله کە لە بنەماڵەیەکی شاری سلێمانی و خۆشەویستی قوتابیان و ڕۆشنبیرێکی سەرکەوتوو بوو، امینی میرزا کریم ئەمیش لە بنەماڵەیەکی گەورەی سلێمانی و خوێندەوارێکی باشی ئەدیب و ڕۆشنبیر بوو. ئەمان لەگەڵ برادەرانی خۆماندا لە لیژنەکەماندا بووە چەند

ئەندامێکی باش و هەڵکەوتوی ناو قوتابیان کە نەئەتوانرا رەخنەیان لێبگیرێ و هەر هەموو رێزێکی تایبەتییان هەبوو، توانای خۆمان یەکخست بۆ پێشخستنی یەکێتی و سەرخستنی بیروباوەڕەکەی. لەم روانگەیەوە بوو هەوڵێکی زۆرمان دا کە رێکخستنی حزب تا رادەیەك جیابکەینەوە و یەکێتی بدەینە دەست ئەو برادەرانەی کە بۆ ئەم کارە ئەشێن بەڵام سەرکەوتنمان بەدەست نەهێنا لەبەر بەربەرەکانی هەندێ لێپرسراوی حزبی ئەو کاتەو گۆڕینی هەل و مەرجی سیاسی و تێك چوون و زۆر بوونی کێشەو رۆڵی تێکۆشانی ئەوسای وڵات بە تایبەتی سلێمانی کە زیاتر پێویستی بە برادەری لە خۆبوردوو هەبوو.

## دروست بوونی رێکخراوی بێچووەشێران

هەل ومەرجی تازەی وڵات و بەربەرەکانی تیژی میللەت و بەرەنگاری هەمیشەیی لەگەڵ میریدا وای لێکردین لەم کاتەدا رێکخراوێکمان پێکهێنا بۆ قوتابیانی قوتابخانە سەرەتاییەکان کە هێشتا تەمەنیان نەگەیشتبووە ئەوەی لەگەڵ قوتابیانی گەورەدا رێکبخرێن بەناوی (بێچووەشێران)ەوە کە جلالی میرزا کریم هەوڵی دروستکردنیداو رێك وپێکی خست و چەند بنکەو لیژنەیەکی باڵای بۆ پێکهێنان و کاتێکی زۆر لەگەڵیاندا ماندوبوو، تا پێی خۆیان گرت و کەوتنە جموجۆڵ و زۆربەی قوتابیان لەدەوری کۆبونەوەو هەموو قوتابخانە سەرەتاییەکانی گرتەوە. پاشان دامانە دەست هاوڕێ ‌ که رەوشت و گورجوگۆڵی و تەمەنیشی لەگەڵ ئەم ئیشەدا ئەگونجا. بەتایبەتی یەکێك بوو لە وەرزشەوانەکانی سلێمانی و رێزێکی تایبەتی لەناویاندا هەبوو. هەردەم خۆی خەریك ئەکرد بە دروستکردنی یانەی وەرزشییەوە. کاك محمد بووە رێکخەرو سەرپەرشتکەری هەموو قوتابخانە سەرەتاییەکان بەکاتێکی کەم توانی بێجگە لەو رێکخستنەی لەوەوبەر هەبوو، لیژانی هەمەڕەنگیش دروست بکات و قوتابیان لەدەوری گرد بکاتەوەو بە چەشنێ بیانبات بەڕێوە کە ئەرکی

قوتابخانەشیان فەرامۆش نەکەن، ئەویش بە یارمەتیدانیان لە وانەکانیاندا لەپاڵ ئیشوکاری تریاندا. کە لە دوارۆژێکی نزیکدا بوونە باشترین پاڵپشتی جووڵانەوەکەمان. هەر لەو کاتەدا لە قوتابخانەی ناوەندی سلێمانی کۆبوونەوەیەکی فراوان کراو برادەرانی کرێکارو بێچووەشێران دەوروبەری قوتابخانەکەیان گرتو لەکاتی دیاریکراودا دەست کرا بە چەپڵە لێدانو هوتاف کێشان.

مێزێکیان بۆ رفیق فتح الله داناو کەوتە خوێندنەوەی وتارەکەی یەکێتی قوتابیان بە دەنگێکی بەرزو حەماسەتەوە قوتابیانی هەژانو لەدەوری کۆبوونەوە. کە زانرا زۆربەی قوتابیان ئامادەبوون هەموان بە چەپڵە لێدانو هوتاف کێشانەوە قوتابخانەیان بەجێهێشتو بەرەو شەقامی مەولەوی بەرێکەوتن تا گەیشتنە نزیك پلیکانەکانو بەرەو خوار بوونەوە بۆ بەر بەلەدیەو بەرەنگاری پۆلیسێکی زۆر بوون. برادەرانی کرێکارو دوکاندارەکانی ئەو ناوچەیە کەوتنە خۆیان بۆ پاڵپشتی خۆپیشاندەران. بێچووە شێرانیش هەریەکەی بە تورەکەیە بەردو دارلاستیك بەدەستەوە، هەر پۆلیس دەرکەوت کەوتنە لێدانیان کە یەکەم جار بوو بەرەو روویان بێنو خەڵکی شوێنیان کەوێ. لە سوچێکی بازاڕەوە ئەسپ سوار هاتنە بەردەم خۆپیشاندەرەکان ئەوانیش بەچەشنێ سڵەمینەوە لەبەر بەردبارانداو زۆربەی پۆلیسە سوارەکان کەوتنە خوارەوەو گلانو ئەسپەکانیان بەو ناوەدا بڵاوبوونەوە بەتایبەتی لە بەردەم بەلەدیەدا، کە من بەچاوی خۆم چەندان پۆلیسم دی ئەپاڕانەوە لێمان، وەکو باباشێخو جلالی حاجی علیو عەبەی علی محمد. بابە شێخ یەکێ بوو لەوانەی دەستی شکاو خوێن بەو ناوەدا بڵاوبۆوەو فڕانیان بۆ خەستەخانەو ئەسپەکەی لەو ناوەدا بەرەڵابوو، (جلالی حاجی علی)ش سدارەکەی لێبەجێما دوای هەڵاتنی پۆلیسێکی برادەری کە دۆستی ئێمەش بوو بەناوی شێخ حسین شێخ محمودەوە بۆی بردەوە بۆ سەراو لەوێ بەخشیشی ئەداتێو سوپاسی ئەکات. بەڵام دوایی گوشار ئەخەنە سەر شێخ حسێنو رەوانەی پشدەری

ئەکەن. خۆپیشاندان بەرەو بەردەرکی سەراو چایخانەی حەمە رەق رۆیشت، لەوێش بەرەو رووی پۆلیس بوونەوەو ئەمجارەش لەبەردەم هێرشی بەردەباراندا شکان، دوایی بەشێنەیی بڕیاری بڵاوەکردنیان دا.خەڵکەکە کشانەوە بەرەو صابونکەران و مەڵکەندی و گەڕەکی قەزازەکان، هەندێکیش بەرەو کۆڵانی مەحکەمەو مزگەوتی ئەوقاف رۆیشتن، من و امینی میرزا کریم چوینە مزگەوتەکەوە، چەند پۆلیسێك بەرەنگارمان بوونەوەو من توانیم لە سەربانەوە دەرچم، بەڵام نیشتنە سەر کاك امین و گرتیان و پەل بەستیان کرد، ئەو برادەرانەش کە بەرەو مزگەوتی گەورە رۆیشتن زۆربەیان گیران، چونکە هێزێکی گەورەی لێ بوو بە سەرۆکایەتی تۆفیقە ڕەش و عوسمانی مەلاو هەندێك لە پیاوانی تحقیقات لەوانە جلالی حاجی عبدالرحمن و صلاحی علی ئایشە خان و چەندانی تر. دوای یەك دوو رۆژیش من و جەزای میرزا حسین و حسن علی غالب و عبدولی سوران و وەهابی صالح کۆیی گیراین و بردیانینە لای برادەران. ئەم خۆپیشاندان و تێکهەڵچوونە لەگەڵ میری و پیاوەکانی، ئاسۆیەکی تازەی کردەوە بۆ تێکۆشانی ئەوسامان، کە بووە هۆی ئەوەی جوڵانەوەکەمان زیاتر تەشەنە بکات و خەڵکی لەدەوری کۆبێتەوە. بەتایبەتی بە بڕیارێکی حزب و یەکێتی قوتابیان کۆمەڵ کۆمەڵ برادەران ئەهاتن بۆ لامان و بەسەریان ئەکردینەوەو هەوڵێکی زۆردرا بۆ بەربوونمان، تا لەئاکاما هەموو بەربووین تا رۆژی مەحکەمە. بەڵام هەرواماینەوە مەحکەمە نەکراین و لەبیرچووینەوە.

لەم گرتنەدا کە لە موقف سرادا بووین حمە صالح دیلان و سعید ناکامیشمان لەگەڵ بوو، کە بۆ جاری چوارەم لە ئێرانەوە کردبوویان بەم دیودا، چونکە هیچ لایەك وەری نەئەگرت و ئەمدیوو ئەودیویان پێ ئەکرد و نەیان ئەتوانی چارەیەکی بۆ بدۆزنەوە چونکە پێناسەی نەبوو. بەڕاستی کاك سعید ناکام بەندیخانەیکەی بۆ خۆش کردبووین بە قسەی خۆش، هەمیشە لەگەڵ حەمە صالح دیلان دا ئەکەوتە گێڕانەوەی بەسەرهاتی سەیرو خوێندنەوەی

هەڵبەستی سیاسیی و دڵداریو ژیانی شاعیران، کاک سعید بە دووروودرێژی باسی مێژووی کۆنی بۆ ئەکردین، بەتایبەتی مێژووی حزبە کوردستانییەکان کە خۆی لە زۆریاندا ئیشی کردبوو. باسی بنەماڵەی شێخ محمودی بۆ ئەکردین بەتایبەتی کە خۆی لەگەڵ جەنابی شێخ دا بوو. لەهەموی خۆشترو سەیرتر لای ئێمە باسی حزبی پۆلیس بوو کە چۆن دروست بووەو ئەم هەرچەندە پۆلیس نەبووە بەڵام لەسەرداوای شێخ محمود لەگەڵیاندا بووە، ئەمەو زۆر شتی تر. هەر ئەم جارەشمان چەند کەسێکمان لەگەڵدا بوون کەلە سەر هەندێ شت گیرابوون، بەڵام کوڕی باش بوونو ئێمەیان خۆش ئەویستو لەگەڵماندا ئەژیان، وەکو حەمە سعید هەورامی کە پیاوێکی ناوشان پانی مەچەك ئەستوری سەر زل بوو جێگەی دوو کەسی لێداگیر کردبوین، هەردەم لەژێر لێوەوە ئەکەوتە ورتەورتو گۆرانییەکی سەیر کە هەمووماني بەئاگا ئەهێنا، ئەمیش دوو کوڕی خۆی لەگەڵدا بوو بەوە تاوانبار کرابوو کە گوایە پشتی بۆ کوڕەکانی داناوە سەرکەوتونەتە سەربانی ماڵی صالح افندی بۆ تاڵانیکردنی. لەگەڵ ئەمانەشدا رؤوفی علی فایز بوو کە ئەویش بەقەدەر ئەو ئەبوو، بەڵام بەپێچەوانەی ئەوەوە دەنگ زلو دەم بەهاوارو ئازاو ئیشکەرو رۆح سوك بوو سەرپەرشتی نانخواردنی هەمووماني ئەکرد. هەر ئەوەش بوبووە سیاسییەکی باشو رۆڵەیەکی تێکۆشەری میللەت. لە ساڵی ١٩٥٦ دا هێنانەوەی تەرمی شێخ محمود دا دەورێکی باڵای بینی، ئۆتۆمبێلچییەکی منداڵیشیان بەناوی (یونس)ەوە لەگەڵ بوو گوایە شتی پێبگوێزنەوە. بێجگە لە صالح شریف ئێرانی بوو، کوڕێکی لاوی جوانی قسەخۆش بووو دەنگ خۆشی تا بڵێیت هێمنو لەسەرخۆو بێدەنگ بوو زۆر شەرمی لە ئێمە ئەکرد، کە خۆی ئەبینی لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا گیراوە بەهەموو چەشنێ ئەیویست لەئێمە نزیك ببێتەوە. هەموو شەو ئەبووە سەرپشکی ئەو ئاهەنگی گۆرانیانەی ئەمانگێڕا، دەنگخۆشێکی بلیمەت بوو ئەوەی ئەیوت نەی ئەوتەوە هاوڕێی حسن زیرەك بوو. حەمە صالح دیلان زۆر دڵنەوایی ئەکردو گوێی بۆ

گۆرانییەکانی شل ئەکردو بایەخی پێئەدا بەتایبەتی کە ئاوازەکانی کوردستانی ئەودیوی هەموو ئەزانی حەمە صالح چێژی لێوەرئەگرت، بێجگە لەمانە (عارف قەرەچەتانی)مان لەگەڵدا بوو کە ئەویش سەرگوزشتەی خۆیمان پێئەگێڕایەوە کە پڕ بوو لە ئیشی سەیرسەیرو بەکەڵك وەکو هێنانی بەچەندان مەڕومالآتی ئەودیوو دابەشکردنی بەسەر هەژاراندا، یان فڕاندنی کچێکی خۆشەویستی لاوێك بۆ ماڵی کوڕەو مارەکردنی لێی بێپاداشت. یاخود خزمایەتی لەگەڵ قەرەجەکانداو هاتوچۆکردنی بۆلایان و یارمەتیدانیان، یا مشتومڕی لەگەڵ حەپسەخانی ژنیدا کە ئەویش شتێکی لەم کەمتر نەبوو یەکێك بوو لە ژنە ئازاو لێهاتووەکانی سلێمانی و زۆر خزمەتی برادەرانی ئێمەی ئەکرد. گرتنی کاك عارف ئەمجارەی شتێکی سەیر بوو، مەلایەکی گەڕەکی جولەکان کە ناوی شێخ احمدی پێنجوینی بوو هەموو هەڵسان و دانیشتنێکی جنێودان بوو بە حزب و شیوعیەت و جولانەوەی نیشتمانی، پیاوێکی خراپ و چارە گران بوو، بەتایبەتی لەگەڵ کاك عارف دا زۆر ناکۆك بوو. هەر لەسەر ئەم شتانە رۆژێ کاك عارف سوێند بە زەردەشت ئەخوات کە (خۆی بە مریدی ئەوان ئەزانی) ئەبێت شێخ احمد شاربەدەر بکات، نیوەڕۆیەك لەبەر حەوزەکەی ناوبازاڕدا کە ئەوکاتە دوکانەکەی کاك عارف لەو نزیکانەبوو، شێخ لەوێوە تێئەپەڕێ و لەبەر خۆیەوە قسەئەکا و جنێوئەدات، ئەمیش ئەم هەلە لەکیس نادا، یەکێ لە کوڕەکانی بانگ ئەکا و لای عارفە لچە کە بەرامبەری ئەبێت پیاڵەیەك رەنگی سور ئەکڕێ و لە سەتڵێکی گەورەدا بە خەستی ئەیگرێتەوە ئەیداتە دەست کوڕەکەی. کە شێخ لەوسەرەوە ئەگەڕێتەوە ئەیوەستێنێ و پێی ئەڵێت کاکە بۆ جنێوئەدەیت و نەختێ گلەیی لێئەکات، لەوکاتەدا کوڕەکەی هەڵمەت ئەبات و رەنگەکە ئەکات بەسەریداو هەموو گیانی سور ئەبێت، دەست ئەکات بە هاورهاوارو شیرەشیڕو جنێودان. خەڵکەکە ئەچن بە پیریەوە، بەڵام بێکەڵك ئەبێت، بۆیە کە ئەوەندە زرۆو خەست ئەبێت بەهیچ جۆرێ لەدەموچاوی و جلەکانی نابێتەوەو کەوشەکانیشی لە پێیدا

شڵپەی دێت، ئەوەبوو شکاتی لە عارف کردو هێنایان بۆ لای ئێمەو کاتێکی خۆشمان لەگەڵدا بردەسەر دوای بەربوونی ئەوجارەمان زۆرتر لەگەڵ کاک عارف دا یەکترمان ئەبینی، بەتایبەتی منو حەمە صالح دیلانو هەندێ جار کریمی ئەحەی هۆمەری قەساب کە زۆربەی نیوەڕوان لای حەمەی وەستا صالحی نانەوا لای بەلەدیەکە سەرونانی باشی کونجیاویمان هەبوو کە بە تایبەتی بۆی ئەکردینو هەندێ جاریش پەنیری تێئەکرد، لەوبەریەوە بە ماستاوێکی خەستەوە ئەمانخوارد، جارێ لای مەلا محمدی ماستاو یا عەبە کوڵی ماستاو یا شەربەتەکەی حاجی غفور. زۆر کەڕەتیش ئەپەڕینەوە بۆ لای حاجیلە کە شەربەتەکەی نایابترین شەربەت بووە لەو سەردەمەدا (دوای خۆی محمدی کوڕی دوکانەکەی گرتە دەست). زۆرجار (عارف)یش بە دەنگەدەنگو گۆرانی خۆی ئەکرد بەلاماندا و بەشداری ئەکردین، وەکو خۆی ئەیوت ئەم بەرکوڵەو خۆم بۆ ماڵەوە ئامادە ئەکەم چونکە ڕێگاکەم دوورەو ئەبێت بڕۆمەوە، بەتایبەتی ماڵی هاوڕێیەکی خۆمان لە تەنیشتیەوە بوو ئەبوایە دەنگو باسی ڕۆژانەی بۆ ببردایە کە کردبووی بە پیشەی ڕۆژانەی. هەر لەوکاتەدا گیرام پیاوێکی تحقیقات بەدەمیەوە دابووم گوایە نوسراوی حزبم بڵاوکردۆتەوە. باشی بۆ هەڵبەستبووم چونکە پارەی لە باوکم ئەویست. لەگەڵ ئەوەشدا کە ناسیاو بوو هەر وازی نەئەهێنا تا چەند کەسێکمان نارده سەری یەکێکیان خزمی خۆی بوو وتی کاک فتحی لەسەر من بەلام هەندێ پارەی بدەنێ، باوکیشم شتێکی کەمی بۆ ناردو پەشیمان بۆوە. فتحی ناسیاوی رۆوفی علی فایز دەرچوو، هاتوچۆی ماڵیانی ئەکرد. هەموو جارێك لە بەندیخانە ئەهاتە لامان بە جنێو دای ئەگرتو تەشقەڵەی پێئەکرد، بڕیاریاندا بە کەفالەت بەرم بدەن، ناردم بەدوای عارف قەرەچەتانیدا ببێتە کەفیلم ڕۆژی دانیشتنی حاکم ئامادەبوو، کە حاکم عبدالرحمن سعید کێشەکەی ئەبینیم پیاوێکی باش بوو لەگەڵیدا هەبوو تا ڕادەی خزمایەتی، زۆر کەڕەت یارمەتی ئێمەی ئەدا. کەڕەتێك کاکم مەحکەمەی هەبوو، شاهیدەکە کابرایەکی

فەرمانبەری لای خۆی بوو، ئەم لێی قبوڵ نەکردو کردیە دەرێ، هەرچەندە شاهیدەکە راست بوو بەڵام فەرمانبەرێکی مەحکەمەو خەڵکی شارو دۆستی هەموان بەلای حاکەوە نەئەبوایە شاهیدی وابدات هەرچەندە کاك محمود خۆشی لەم ساڵانەی دواییدا زۆر پەشیمانی دەرئەبڕی، کاك عارف هات و لەبەردەم حاکمدا وتی من ئەبمە کەفیلی قادر هەرچییەکی کردبێت، پێیان وت کەفالەتی (١٠٠) سەد دینارە زۆرە پێت نادرێ چونکە بە چوونە دەرەوەی دیسان ئەگیرێتەوە. ئەم هەڵیدایەو

بە پێکەنینەوە پێی وتن ئەم کەرەتە خۆشم ئەچم لەگەڵیدا بۆ هەرکوێیەك چوو. لە هەر کوێیەك خۆپیشاندان بوو کە گیراین لە مەحکەمەدا (١٠٠) سەد دینارتان ئەدەمێ، من بۆیە ئەبم بە کەفیلی کە سەرپەرشتی خۆپیشاندانەکان بکات. کاك عارف زۆر بە دڵ قسەکانی ئەکرد، (حاکم عبدالرحمن)یش زۆر بەشێنەیی گوێی لێئەگرت وتی ئافەرم عارف بەخوا وادیارە پارەت زۆرە وا ئەیخەیتە ئاوەوە، وەرامی دایەوەو وتی پارەی میللەتە، هی رەش و رووتانە. تێکەڵاوی دزێتی ناکەم، بە درێژی کات هەموو ئەم گفتوگۆیانە هەر هەمووی بە پێکەنین چووە سەر. دوایی لەگەڵ کاك عارف دا هاتینە دەرێ و بەرەوماڵ بووینەوە. ئێمە ماڵەکەمان لە رێگەی ئەودا بوو، لایدا بۆ بەرکوڵی نیوەڕۆ هاتەلامان و لەگەڵ باوکم دا نانیان خواردو نیوەڕۆیەکی درەنگ بەرەوماڵ بۆوە. حاکم عبدالرحمن و کاك عارف راستیان کرد کە بەربوونەکەم ئەوەندەی نەخایاند پاش هەفتەیەك گیرامەوە لەسەر هێرش بردنە سەر پیاوێکی تحقیقات لە چاپخانەی حەمە رەق کە دانرابوو بەسەرمانەوەو چاودێری ئەکردین و بەرۆکی بەرنەئەداین وەکو قیروزفت پێمانەوە نووسابوو، ئێمەش پێمان رائەبوارد، هەشت نۆ برادەربووین من و جەزای میرزا حسین و عبدولی سوران و کمال سلمان و فرج احمدو بەکرو یەکێکی کە، کە ساتە ناساتێ یەکێکمان بە پەلە دەرئەچووینە دەرەوەو ئەو بەدوامانا، لە سەعاتێکدا چەند جارێك وامان لێئەکرد تا بووە هەرامان و من و عبدولی سورانی بەگرتداو

لێشمان خۆش بوو دوو ڕۆژ زیاتر نەماینەوە.

## فەیسەڵی دووەم و تاجی پاشایەتی

ئێمە خۆمان و ڕێکخستنەکانمان هەردەم چاوەڕێی هەل و فرسەت بووین بۆمان هەڵکەوێ و جموجۆڵی خۆمانی تیا بەجێ بێنین و بیکەینە هەلا و خۆپیشاندان و بەیەکدا چوون لەگەڵ میری و پیاوەکانی بۆ دەرخستنی هێزی خۆمان، ئەوەبوو ڕۆژی ٢ی مایسی ١٩٥٣ فەیسەڵی دووەم تاجی ئەخرایە سەرو ئەبووە پاشای وڵات، لەو ڕۆژەدا لەبەر باخی گشتیدا خەڵکێکی زۆر کۆکرابوونەوە لە فەرمانبەران و قوتابی و کرێکارانی میری گەورەترین کۆبوونەوەیان پێکهێنا و لەچەند لایەکەوە دەهۆڵ و زوڕنا دەستی پێکرد، هەڵپەڕین و هەلهەلە کێشان کۆڕی بۆ گیرا، شیرینی و شەربەت دابەشکرا. خەڵکەکە زۆریان پێخۆش بوو نەک بۆ ئەوەی فەیسەڵ تاجی ئەخرێتە سەر، بەڵکو زیاتر بۆ هەڵپەڕکێ و چاوبڕکێ و خۆلەیەکتری سون و ڕەشبەڵەک. ئەوناوە جمەی ئەهات لە خەڵکی بە جلی سەوزو سورو خشڵی هەمە چەشنەوە ئاگایان لە هیچ نەمابوو، لەپڕ برادەرانی ئێمە دەستیان کرد بە چەپڵە لێدان و هوتاف کێشان، داوای نانیان کرد بۆ میللەت، داوای هێنانی حکومەتێکی دیموکراتیان کرد لەگەڵ زۆر دروشمی تردا، پۆلیس هێرشی بردە سەریان، بووە هەراو بەیەکدا چوون. زوڕنای لۆتیەکان شکا و دەهۆڵەکەیان دڕێنرا، خەڵکەکە شڵەژان و زۆربەیان کشانەوە، ئاهەنگەکەیان بەجێهێشت. برادەرانی ئێمەش وردەوردە دورکەوتنەوە بێئەوەی کەسیان دەسگیر بکرێن. بەڵام ئیشەکە بەهۆی گەورەیی مناسەبەتەکەوە ئەوەندە کاریگەری زۆر نەبوو. بۆ ئێوارە دیسان ئاهەنگ دەستی پێکردەوە بە تەقاندنی فیشەکی ڕەنگاوڕەنگ شاپلیتەی داگیرساندن و سەرلەنوێ هەڵپەڕکێیەکی گەرم، بەڵام ئێمە کارەکەی خۆمانمان زۆر لا چاک بوو کە توانیمان چالاکییەک بکەین بێزیان. ئەمەش زیاتر ئەگەڕایەوە بۆ جلالی میرزا کریم و سلامی مەلا سابیرو عبدالرحمن

شیوعی و احمد عباس و جلال عبدالرحمن و زۆر لە برادەرانی کە. بۆ رۆژی دویای هەر هەموو ئەو برادەرانە کەوتنە بەر رەخنەی سەرکردایەتی ئەوسای حزب کە گوایە سەربەخۆ ئەم کارەیان کردووەو نابێت جارێکی تر دووبارە بکرێتەوە، هەرچەندە بووە مشتومڕێکی زۆر لەسەر ئەم کێشەیە، بەڵام بەچاکی چارەسەر کرا، کە هاوڕێ دڵزار دەورێکی باشی هەبوو کە لەوکاتەداو لێپرسراوی یەکەمی حزب بوو، هاوڕێیەکی بێدەنگ و لەسەرخۆبوو. بێجگە لەکاری رێکخستن زۆر کاتی خۆی بە هەڵبەست و ئەدەبەوە ئەبردە سەر، هەر زوو لەگەڵ ئەدەب دۆست و شاعیرەکانی ئەو سەردەمەدا پەیوەندی پەیدا کرد وەکو گۆران و حەمە صالح دیلان و کامەران و زۆر لە شاعیرە لاوەکان. پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ مندا هەبوو هەموو رۆژێ نامەی بۆ ئەنوسیم و هەردوو کچەکەی زکیە خان (زەکیە مصطفی خۆشناو) لە بەینماندا هاتوچۆی ئەکرد زیاتر لەبەرئەوەی لە ماڵی ئەواندا بوو، دواتر لە جولەکان خانویەکی گرت. زۆربەی نامەکانی بێجگە لە چەند تێبینییەکی رێکخستن بە هەڵبەستی خۆی دەستی پێئەکردو کۆتایی ئەهێنا، زۆر جار لای گۆڕە جولەکان یەکترمان ئەبینی و وردورد بەشانی گردەکەی شێخ محی‌الدین دا بەرەو خوار ئەبووینەوە بەدەم قسەوباسی ئیشی حزبییەوە بەڵام ئەو هەر ئەوەی پێئەکرا گوڵاڵە سورەو گوڵە وردەی ئەوناوە کۆبکاتەوە. تا ئەگەیشتینە سەر کانیەکەی پشت گردەکە چەپکێکی تەواوی ئەکردەوەو هەڵبەستی بەسەریاندا ئەخوێندەوە...شتێکی سەیر کە لەیاد ناچێت...رۆژێ بەدەم قسەوە گەیشتینە سەر کانییەکە، لەپڕ هەردووکمان سڵەمینەوەو لەجێی خۆمان وەستاین دیمان کابرایەکی بە تەمەنی پان‌وپۆڕی جامانە بەسەری شەرواڵ لەپێ بەدەمدا کەوتبوو خوێن بە لەش و سەرو سنگیدا بڵاوبوبووەوە، چوینە پێشەوە دیمان گیانی تیا نەماوە جێگە خەنجەرو چەقۆی زۆری پێوەیە. ئێمە هەر ئەوەندەمان پێکرا زوو دوور کەوتینەوەو بەرێگەیەکی کەدا بگەڕێینەوە نەوەکو خەڵکمان توش بێت و پرسیارمان لێبکەن، بەتایبەتی کاک دڵزار زۆر تێکچوو بوو یەکەم

لەبەر کوشتنی مرۆڤێك کە هەردەم ئەیووتەوە، دووەم لەبەرئەوەی دانیشتووی سلێمانی نەبوو زیاتر تووشی گێچەڵ ئەبوو، بەرەوخوار بووینەوە تا گردەکانی ئەو ناوەمان تێپەڕاندو کەوتینەوە دەوروبەری تانجەرۆو لەوێشەوە بەرەو ڕێگەی هەڵەبجە ڕۆیشتین‌و نزیك گردی سەیوان بووینەوەو گەڕاینەوە شار. زۆر هیلاك بووین‌و دەرنگمان پێچوو، ئەو بەرەو جولەکان‌و منیش بەرو ماڵ بوومەوە بەجارێ کاس بووبووم وەکو ئەویش بۆی گێڕامەوە زۆر خراپ بووە، لەیەکەم نامەی ئەم بەسەرهاتە بە هەڵبەستێکی ناسك لەسەری دوابوو جا هاتبووە سەر ئیشی خۆمان. ئیتر لەو ڕۆژەوە بەو ناوەدا نەچووینەوەو نەشمان زانی کوژراو کێیەو دەنگیش بە شاردا بڵاونەبۆوە.

## دروستکردنی ماڵی حزب

بۆ جێبەجێکردنی ئیشەکانمان بە چاکی‌و نهێنییەکی توندوتۆڵ حزب‌و ڕێکخراوەکانی زۆر بنکەی یەکتری بینین‌و حەوانەوەیان پەیدا کردو بوونە ماڵی حزبی، لە هەموویان والاتر ماڵی حەباو خانی دایکی‌علی حەباو بوو، علی لە نوگرە سەلمان بەند بوو، لێرە ماڵەکەیمان کردبووە بنکەیەك بۆ دابەشکردنی گۆڤارو ڕۆژنامە دەرکراوەکانی حزب‌و یەکێتییەکان، کە هەر مەمووی لەوێ دائەنراو دابەش ئەکراو هەر برادەرێ‌بەشی خۆی ئەبرد. جا حەباو خان کە ژنێکی سادەو لەسەرخۆو ڕۆح سوك بوو، زۆر ساویلکەبوو هیچی نەئەزانی‌و نەخوێندەواریش بوو نەشی ئەزانی ئەمە بۆچی ئەکات، تەنها علی خۆش ئەویست لەبەرئەوەی علی شیوعییە. هەموو برادەرەکانی علی بە کوڕی خۆی ئەزانی‌و بە قوربان‌و بەساقەیان ئەبوو، زۆر کەڕەت ماچی ئەکردن‌و بە قوربان‌و بەساقەیان ئەبوو، زۆر کەڕەت ماچی ئەکردن‌و ئەیووت بۆنی (علی)تان لێدێ، ئێمەش هەر هەموو ڕێزێکی تایبەتیمان بۆ دائەنا. لە ژوورەکەیاندا سێ تاق هەبوو بە ڕیز، هەر تاقەی بۆ لایەنێك دانابوو یەکێکیان بۆ حزب‌و یەکێکیان بۆ لاوان‌و یەکێکیشیان بۆ کرێکاران. هەر برادەرێ بهاتایە

ئەبوایە خۆی شتی خۆی هەڵگرتایە و هەرچییەکیشی پێبوایە دایبنایە، ناوی کەسی نەئەزانی و ئەوەی ریش و سمێڵی هەبوایە ئەیووت حزب هاتووە، ئەوەی تەمەنی نەختێ لاو بوایە ئەیوت بە قوربان لاوەکە هاتووە، ئەوەی نەختێ منداڵ یا ئەفەندی بوایە ئەیووت کوڕە قوتابییەکە هات، زۆر لە خوشکانیش هاتوچۆیان ئەکرد و ئەوانی ئەناسی وەکو زەکیە خان و منیرە صالح و گەلاوێژی عبدالخالق و زۆری تر. بەم جۆرە هەموو لایەکی بەڕێ ئەکرد، بەڵام حمەصاڵح و حسین شەشۆیی و عەلی فەوتاو و عمر ئاشتی-شی ئەناسی چونکە خەڵکی گەڕەکی خۆیان بوون، زۆری من و فوئاد مجید و کەمالی حاجی مصگفی خۆش ئەویست چونکە لەهەموو برادەران زیاتر لای ئەماینەوە و هەندێ نیوەڕۆش نانی بۆ ئامادە ئەکردین.

لەم ساڵەدا کارەکانمان بەباشی ئەچوو بەڕێوە، لەلای میریشەوە هەندێ پشومان دابوو، ئەوەندە نەئەگیراین، بەتایبەتی من یەکەم جار بوو لە ژیانم دا چەند مانگێ نەگیرێم و ئیشەکانم بەرێکی و بەردەوامی بڕوا بەڕێوە، بۆیە ئەمانویست زیاتر هەنگاو بنێین و رێکخستنەکانمان بچەسپێنین بەتایبەتی قوتابیان و لاوان، کە بیرمان لێکردەوە ئەبێت لیژنەیەکی باڵامان هەبێت و بڵاوکراوەیەکی ناوەندی دەرچێت، ئەمە زۆر کەوت لەسەر ئێمە و لە ململانێ و هەڵچوون و داچوون دا لەگەڵ برادەران دا، لای هەندێك زۆر قورس بوو ناوەندیە هەبێت و هەموو کۆن و قوژبنێکی کوردستان بگرێتەوە، کە پێشەکی ئێمە سەرەتا بەناوی کوردیشەوە پێکمان هێنا، لیژنەیەکی بچوکمان پێك هێنا و کەرکوکمان کردە بارەگای هەمیشەیی، لاوان و ئاشتیخوازانیش بەم چەشنە کەوتنە ئیش و جوڵاندن، لیژنەکەی ئێمەش لە من و هاوڕێ فاضل فرج و مصلح مصطفی و برادەرێکی کەی کەرکوکی کە ناوی محەمەد بوو، ئەبوایە مانگی دووجار کۆبونەوەمان بکردایە، ئەو کاتە حمەصالح دیلانیش هاتە کەرکوك بۆ ئیشی لاوان و هەموو یەکمان گرتەوە، ئێمە دەنگی قوتابیان و ئەوانیش دەنگی لاوانیان دەرئەکرد و ئاشتیخوازانیش جم‌وجۆڵی خۆیانیان

هەبوو، هەندێ بەیان و دروشمی دژ بەشەڕیان دەرکرد، لەوێ کاک خەسرەوی حمەامین ئاغا و ابراهیم چەچان (برای مەحلان و بەبلە چەچان ناسرابوو) کارەکانیان ئەبرد بەڕێوەو اسعد خضرو حمەصالح دیلانیش یارمەتیان ئەدان، ئێمە زوربەی کۆبونەوەکانمان لە ماڵی مصلح ئەکرد، کتێب خانەیەکمان هەبوو بەرامبەر ماڵەکەیان دەشتێکی بەرین هەبوو لەوێ چاڵێکمان بۆ هەڵکەندبوو بەپێی پێویست لێمان دەرئەهێنا، باوکی مصلح شاعیرێکی باش بوو، بەزمانی تورکی زۆر هەڵبەستی هەبوو، هەمووجارێ هەڵبەستەکانی خۆی بە دەنگێکی دلێرەوە بۆ ئەخوێندینەوەو من هیچی لێ تێنەئەگەیشتم، بەڵام کە بۆی ئکردم بە کوردی زۆرم پێخۆش بوو هەرچەندە باسی تورک و ئەندێشەی خۆیانی ئەکرد. دایك و خوشکی ئێمەیان زۆر خۆش ئەویست و خۆیان بەکوردێکی تەواو ئەزانی، هەرچەندە بە تورکیش قسەیان ئەکرد، من و کاك فاضل و هەندێ جاریش حمەصالح دیلان زۆر لە چاخانەیەك دائەنیشتین لە شەقامی اطلس و کردبوومان بە بنکەی خۆمان و نیوەڕوان لەوێ شتمان ئەنوسی، چونکە لەئێمە زیاتر کەسی تیانەئەما، یەکەم ژمارەی دەنگی قوتابیانمان دەرکرد کە بریتی بوو لە چەند پەڕەیەك لە نوسین و هەڵبەست و هەندێ دەنگ و باسی کە کە محمد عزیز (شێخە) ئەیبرد بۆی چاپ ئەکردین لە چاپخانەی حزب. ئەو کەڕەتە من ئەبوایە من هەندێکی لێبێنمەوە بۆ سلێمانی هەرچەندە ئیشی من نەبوو جێگەی تایبەتیمان هەبوو بۆ گواستنەوە، بەڵام شتێکی خۆش و تازەو گۆڕانێکی گەورە بوو لە ژیانی یەکێتی قوتابیان دا ئەمویست بیکەمە دەستەگوڵی خۆم بۆ سلێمانی، چەند ژمارەیەکم پێچایەوە لەگەڵ هەندێ نامەدا خستمە پەڕۆیەکەوەو هاتمەوە بۆ ئوتێل خیام تا شەوێ لەوێ بنوم و بەیانی بکەومە ڕێ بۆ سلێمانی شەو ابراهیم چەچانم لێ پەیدا بوو یەك بوخچە بەیانی ئاشتیخوازانی پێ بوو بینێرێتەوە بۆ سلێمانی، کە زانی من بەیانی ئەڕۆمەوە سەری کردە سەرم کە ئەبێت من ئەمانە بەرمەوە، منیش نەچوومە ژێری، نەشم ئتوانی پێی بڵێم کە من ئیشێکی کەم هەیەو ئەمە ئیشی من نییەو جێگەکەم

ڕێگەی ئەوەم نادات بەوکارە هەڵسم. هەرچەندە کاك ابراهیم پیاوێکی چاك بوو بەراستی ئیشی ئەکرد کاتی خۆی لەگەڵ برایانی پارتی بوو لەگەڵ ڕؤوف مەعروف و ئەواندا هاتبونە حزبەوە، ئێمەش لەئاشتیخوازاندا جێگەمان بۆ کردبوونەوە، دەوری خۆیان بەباشی ئەبینی، لەگەڵ ئەوەشدا ناسیاوێکی باشە ئێمەبوو خەڵکی گەڕەکی سەرشەقام بوو لە خەستەخانە ئیشی ئەکرد، داوو دەرمان و هەموو ئیشێکی خەستەخانە لەلایەن ئەوەوە جێبەجێ ئەکرا، ئەو شەوە بەتەواوەتی تەنگی پێهەڵچنیم و هەرچەندم ئەکرد لەگەڵیدا بێسوود بوو، بەتایبەتی کە خەسرەوی حمەامین ئاغا بۆ پێکەنین و ڕابواردنی خۆی بەخۆڕایی پشتی ئەوی ئەگرت و ئەیکردە بڕیار کە ئەبێت شتەکانی ابراهیم بگەیەنم بۆ سلێمانی، بەڵام بێسوود بوو چونکە من بەیانی زوو لەخەو هەڵسام و خۆم گۆڕی و لە ئوتێل هاتمە خواریێ و چووم برادەرانم بینی و کاتێکی زۆرم لەگەڵیاندا بردەسەر و نانی نیوەڕۆمان خوارد لە چایخانەکەو بەڕێیان کردم بۆ گەراجی سلێمانی، لەوێ نەفەر نەبوو، بەڵام زوومان لەخاوەن ئوتومبیل نا کە بەدوو نەفەر بڕوات، بەڵکو لەڕێگا نەفەر هەبێت، کەوتینە ڕێگە من لەدواوە دانیشتم و شتەکانم لەپشتەوە دانا. هەر ئەوەندەم لاخۆش بوو تا گەیشتینە حەسیرەکان دەستمان لێڕاگیراو سەیرم کرد عبدالله و کوڵە لەبەردەمم دا قوت بۆوە، بەراستی تاسێك بەسەرمدا هات و ڕەنگم تێك چوو بەجۆرێك عەبە درگی پێکرد، بۆیە بەدەنگی بەرز بەسایەقەکەی ووت جێگەی دوونەفەر هەیە بۆ سلێمانی، ئەویش ووتی فەرموو سواربن، هەر لەو کاتەش دا ڕووی دەمی لەمن کردو ووتی کاك قادر ئەچیتەوە بۆ سلێمانی؟ بەڵام من وەرامم پێنەدرایەوە ئەوەندە شڵەژابووم نەمئەزانی چیبکەم، وام دانابوو تازە دەرچوونم بۆ نییەو هاتون بۆ گرتنی من، هەزارویەك بۆچون بەمێشکم دا هاتوچوو، بەڵام زوو هاتمەوە سەرخۆم و جێگام بۆ چۆڵ کردن و فەرمووم لێکردن کە سەرکەون، جا لەسەرخۆ کەوتینە قسە، یەکەم جار دەمی پرسیاریان کردە من کە لە کەرکوك چی ئەکەم و بۆ هاتوم بەم درەنگە بۆ ئەگەڕێمەوە، بە

دەمم دا هات کە لەبەغدا بوومو ئەمەویٚ لە ئیشیٚ دابمەزریٚمو هاتوم ئەوراقی پێویست بەرمو بگەڕێمەوە، ئەی ئێوە چی ئەکەن؟ هەردووکیان بەیەکەوە وەرامیان دایەوە کە هاتوون بۆ شاهێدی لە مەحکەمە چەند کەسێك گیراونو ئەمڕۆ مەحکەمەیان بوو، عەبە ووتی بەخوا قسەی باشمان بۆ کردن، سودی نەبوو یەکی ساڵێکیان حوکم دان، لەهەر شوێنیٚ دائەبەزین ڕێزێکی تایبەتیان بۆ دائەنامو میوانی عەبە ئەبووم، بەقسەی خۆشو گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی سلێمانی کاتمانی تێپەڕان، بەڵام من هەر بیرو هۆشم لای شتەکان بوو، باش بوو ئەوانیش هیچ ئاوەڕیان نەئەدایەوەو ئاگایان لەدواوە نەبوو، بەهۆی ئەوانەوە لە ڕێگا رایان نەئەگرتینو داوای ناسنامەیان لیٚنەئەکردم، بیرم کردەوە لە چەمچەماڵ شتەکان فڕیٚ بدەم یا بیدەمە دەست سایەقەکە یا ئەو کوڕەی لەپێشەوە دانیشتبوو، بەڵام نەئەکرا هەرچەندە وام ئەزانی بگەینەجیٚ بەرەو سەرام ئەبەنو شتەکان ئەگرن، جارناجاریٚ بیریشم ئەکردەوە ئەم ووت ئەگەر ئەوەیان بویستایە هەر لە کەرکوك دەست بەکار ئەبوون، چونکە زۆر باش ئەیزانی لە بەغدادەوە نەهاتومو بەدوای ئیشا ناگەڕێم، بەیانیش زوو منیان لە کەرکوك دیوەو لە قسەکانیان دا دەرئەکەوت کە ئەیانووت ئێمە پەیوەندیمان بەسەر زۆر شتەوە نیە تا خۆی یەخەمان نەگریٚ، جا بەراستی هەندێکیان بەم چەشنە بوون تارادەیەکیش یارمەتیان ئەدایـن، بەڵام ئەمجارە نازانم چارەنوسم چۆن ئەبێت وا لەبەردەستیان دامو ئەم هەموو شتەم پیٚیە؟.. ساتەناساتێکیش شەقێکیان لە جانتاکەی بەرپێم هەڵ ئەدا کە تەنها بیحامەو خاولیەکی تیادا بوو، کە نزیك سلێمانی بووینەوە ئەبوایە من لە چایخانەکەی سعید طە کۆییدا دابەزیمایەو بەوێوە بەروماڵ بومایەتەوە چونکە لەوێوە نزیك بووین بەڵام هەر بە زوویی بیرێك بەمێشکم دا هات، گەر دابەزم ئەبیٚ شتەکانی پشتەوە هەڵگرم یەکسەر ئەزانن، هەر چاویان پیٚی بکەویٚ یان دەستی لیٚبدەن هەموو شتێکیان بۆ دەرئەکەویٚ، چونکە ئەوان تەنها وایان ئەزانی هەر ئەو جانتایەی بەرپێم پیٚیە! لەبەر ئەوە بڕیارمدا هەرچۆنێك بێت ئەوان لەپێش مندا دابەزنو بڕۆن،

بۆیە لەسەرخۆ وتم وابزانم ئەمان لای سەرا دائەبەزن هەردوکیان صابونکەرانین منیش بەرەو سەرشەقام بە شەقامی کاوەدا، هەردووکیان ووتیان راستە ئێمە لای سەرا دائەبەزین، لەباخی گشتی تێپەڕ بووین، شەقامی مەولەویمان بینی یەك دوكان نەبوو، یەك كەسی پێوە نەبوو لە پۆلیس زیاتر، هەموومان نەك تەنها من دڵمان راچڵەكی و كەوتینە پرسیار لەیەك كردن كە ئەبێت چی رووی دابێت! لەپڕ عەبە ئوتومبیلەكەی راگرت و بەدەنگی بەرز پۆلیسێكی بانگ كردو لێی پرسی ئەمە چیە؟ وەرامی دایەوە ووتی شیوعیەكان خۆپیشاندانیان كردووەو بۆتە شەڕێكی گەورەو بریندارێكی زۆریش هەیەو هەموو دوكان بازاڕ هەڵگیراوەو زۆر كەسیش گیراون و ئێستاش پۆلیس خەریكی گرتنی خەڵكین لەناو شاردا. ئەمەی ووت و عەبە لەسایەقەكەی خوڕی بەرەو شەقامی مەولەوی بڕوات، لای سەرا ئەمان دابەزین، منیش تێهەڵكێشم كردو ووتم منیش لە شەقامی كاوە دائەبەزم، ئوتومبیلەكە بەتیژی تێپەڕی و لای سەرا دابەزین لەوكاتەدا هەندێ لە پۆلیس و ئەفسەرەكان منیان بینی و زانیان كە لەدەرەوەی سلێمانیەوە هاتوم، نەختێ تێپەڕیم لێیان منیش دابەزیم و بەرەو گەڕەكی سەرچیمەن بەرێكەوتم بۆ ماڵی عەلی حەبا و شتەكانم دانا و كۆڵان بەكۆڵان بەرەو ماڵ بوومەوە. شەو هاتنە سەرم و گرتیانم گوایە لەخۆپیشاندانەكە بەشداریم كردووە هەرشەو كەوتنە لێپرسینەوەم، دوو پۆلیس شاهیدیان لەسەر دابووم كە منیان دیوە لەپێش خەڵكەكەوە هوتافم كێشاوە! منیش بەدڵنیاییەكی تەواوەوە قسەی خۆمم كردو عەبەو كوڵەم كرد بەشایەت، كە لەگەڵ ئەواندا ئێوارە لەكەركوك گەڕاومەتەوەو ئاگام لەهیچ نییە، لەوێدا ئەفسەرێكیش ووتی من لە ئوتومبیلەكەدا لەگەڵ كاك عبدالله دا دیومە، بەڵام بێكەڵك بوو هەتا بەیانی هێشتمیانەوە تا بردیانمە بەردەم حاكمی تحقیق بە هەموو ئەوراقەكانەوە، دوای لێكۆڵینەوەیەكی زۆر بڕیاری بەرەڵاكردنم درا، بەڵام پۆلیس هەتا ئێوارە گلیان دامەوەو بەكەفالەت بەریان دام. لەهەمووی سەیرتر پاش ئەم هەموو گێرەو كێشەیەو پاش چەند رۆژێ نامەیەكی چەند

پەڕەیی هێرش و رەخنە لەسەرم گەیشتە حزب کە ابراهیم چەچان نوسیبوی دەربارەی خۆدزینەوەم بۆ هێنانەوەی شتەکانی ئاشتیخوازان لەکەرکوکەوە، لەکاتی خوێندنەوەی نامەکەدا بووە پێکەنین و دەمەتەقێیەکی زۆر تا وەراممان دایەوە، بەلاّم ابراهیم وازی نەئەهێنا و هەر سووربوو لەسەر رەخنەکانی، ئەوەبوو رۆژێ خۆم چووم بۆلای و هەموو شتێکم تێگەیاندۆ پەشیمان بووەوەو وازی لێهێنام.

## باری تێکڕای حزب و چلەی وەفاتی ستالین

ئەم کاتە ئیش و کاری حزب زۆر بەباشی ئەچوو بەڕێوە، نەك بەهۆی لیژنەی ناوچەوە کە تەنها هاوڕێ دلزارو وەستا عەول و هاوڕێیەکی کەی هەولێری مام خدر کە زۆر لاوازبوون لەچاو هاوڕێیانی خوار ئەوانەوە، چونکە ئیشی نهێنی وای لێکردبوون سەرکردایەتی ئەو حزبە گەورەیە بگرنەدەست بەتایبەتی هیچ دەورێکی بالاّیان نەبوو لە راپەرینی ئیشی رۆژانەیان زیاتر نەبێت، کە بریتی بوو لە بینینی برادەران و هەندێ کاری رێکخستن، کە زوربەی رۆشنبیران و برادەرانی لێهاتووی پێوە بەسترابوو، هاوڕێ دلزارتەنها منی ئەبینی و لابەلایی سەرپەرشتی ئەکردم، لاوان و نەقابەکانیش هەربەم چەشنە بوون، تەنها گیانێکمان بەو شتانەبوو کە لەسەرەوە بۆمان ئەهات و دابەشمان ئەکردو ئەبووە هەوێنی ئیش کردنمان سەرکردایەتی سلێمانی لەگەلّ هەموو رێکخراوەکاندا کەلێنێکی گەورە کەوتبووە نێوانیانەوە، هەموو توانامان لەکاردابوو بۆ چاك کردنی، بەلاّم بۆمان نەئەکرا، چونکە ئەوان بەو شێوەیەو بەو سێهاوڕێیە نەیان ئەتوانی ئەو هەموو ئیش و کارو رێکخستنانە بگرنە باوەش و بەرەوپێشی بەرن وەکو ئەو کات و رۆژگارە ئەیویست لێمان.

بەهەفتەیەك پێش چلەی وەفاتی ستالین مانگی مایسی ١٩٥٣ بیرمان کردەوەو بڕیارمان دا چلەیەکی قەشەنگ و گەورەی بۆ سازدەین و هەرچی

توانامان هەیە بیخەینە کار بۆ سەرخستنی، لەگەڵ احمد مارف کە سکرتێری نەقابەی نانەواکان‌و قادری رشید ناسك کە سکرتێری نەقابەی شۆفێرەکان بوو، کەوتینە ئامادەکردنی پێویستی‌یەکانی کۆبوونەوەکەو بڕیاردرا بەناوی سەیرانەوە بچێتە دێیەکی دووری شار کە چەرمەگا بوو، شوێنێکی ئێجگار سەخت‌و دوور لە دێکەمان هەڵبژاردو نەقابەی نانەواکانمان کردە سەرپەرشت کاری سەیرانەکە. دوو رۆژ لەوەوبەر کەوتنە ئامادەکردنی نان‌و پێویستی سەیران لە خواردن‌و هەندێ کورسی‌و مێزێك‌و قۆری‌و پیاڵەو پەرداخ‌و راخەر، ئێمەش کەوتینە رێکخستنی ئاهەنگەکەو ئامادەکردنی ئەو لایەنانەی ووتار ئەخوێننەوە، یا ئەو برادەرانەی هەڵبەست‌و دروشمی بەینی ووتارو نەشیدو گۆرانیەکان ئەڵێن، بۆ ئەوەی هەرکەس لەخۆیەوە شت نەڵێت، شەوی سەیرانەکە زوربەمان لە چاخانەکەی حاجی باقی بەنگینە لەئەسحابەسپی ماینەوە، کە پیاوێکی چاك‌و رۆشنبیرو شاعیرێکی لێهاتوو بوو لە شیعری شەعبیدا. بیروباوەڕی لەگەڵ برادەرانی پارتی‌دا بوو، هەموولایەکی خۆش ئەویست‌و چایخانەکەی کردبوو بە بارەگای نانەواکان، زوربەی برادەران بەرۆژیش لەوێ دائەنیشتن‌و یەکتریان ئەبینی، بۆ بەیانی زوو پێش هەتاوکەوتن نەقابەی شۆفێرەکان ١٠ – ١٥ ئوتومبیلێکیان ئامادەکردبوو لەگەراجی ئەسحابە سپی‌و کۆڵانەکان، هەموو برادەران روویان کردە ئەو ناوە بەپێی نەخشەیەکی تایبەت، هەرکەسە لەگەڵ لێپرسراوی خۆیدا سواری ئوتومبیل بوو بەبێ چرپەو دەنگەدەنگ بەرێکەوتن بۆ جێگەیەکی دیاری کراو کە تەنها یەك برادەر پێی ئەزانی، کاتی هەتاوکەوتن گەیشتینە چەرمەگاو جێگەی ئامادەکراو، هەموو برادەران ٤٠٠ – ٥٠٠ کەسێك ئامادەبووبوو لەهەموو توێژەکانی میللەت، کۆمەڵ کۆمەڵ هەریەکە لە شوێنێکدا دانیشتن‌و کەوتنە خۆرێکخستن بۆ نان خواردو یاری کردن‌و دروست کردنی بازنەی رۆشنبیری‌و خوێندنەوەی هەڵبەست‌و قسەی خۆش‌و پێکەنین‌و هەندێ یاری فۆلکلۆری' هەر لەبەینی تاشە بەردەکانا چایخانەیەکی خنجیلانە دروست کرا

کە ئاوێکی جوان و روون بەبەردەمیدا تێئەپەڕی، هەرکەس حەزی لەچا یا دانیشتنی ئەوێ بکردایە ئەچوو لەوێ پشویەکی ئەدا، چەند میوانێك لە کەرکوك و هەولێرو رانیە و هەڵەبجەوە هاتبوون جێگەی تایبەتییان بۆ دانرابوو وەکو میوان، تا کاتی کۆبوونەوەکە برادەران هەریەکەی بەشتێکەوە خۆی خەریك کردبوو، چەند برادەرێ نەبێ کە ئەرکی رازاندنەوەی جێگەی کۆبونەوەکەی گرتبووە ئەستۆ، پێشەکی دروشمی هەڵواسراو بۆ یادی وەفاتی ستالین لەگەڵ چەند نوسراوێکی بچوك بەم دیوو ئەو دیودا کە هەرهەمووی لەسەر تێکۆشان و قوربانی‌دانی شیوعیەکان بوو، لەبەردەمی گۆڕەپانەکەدا مێزێك دانرابوو وێنەیەکی هاوڕێ ستالینی پێوەبوو، سەرەکەشی چەپکێ گوڵی رەنگاورەنگ و دۆلکەیەك ئاوو پەرداخێکی لەسەر دانرابوو کورسیەکیش لەپشتیەوە، دوای نیوەڕۆیەکی درەنگ بانگ هێشتی برادەران کراو هەرەیك جێگەی خۆی گرت و دانیشت و هەندێکیش بەپێوە وەستان، ئێمەو چەند برادەرێك نەچوینە کۆڕەکەوە، بەڵێو لای چاخانەکەوە جێگەی خۆمان سازکرد زیاتر بۆ ئەوی چاودێری کۆڕەکە بکەین و نەختێ سەربەستی گفت‌وگۆشمان هەبێت، کۆبونەوەکە بەچەند وتەیەك لەلایەن برادەرێکەوە کرایەوە باسێکی تێروپڕی ژیان و تێکۆشانی هاوڕێ ـستالین ـی کرد، کە هەموو ساتێکی بەچەپڵەلێدان و هوتاف کێشان ئەبرایەسەر، هەریەکێتی‌یەك و نقابەیەك ووتاری خۆی خوێندەوە، خۆم ووتاری یەکێتی قوتابیان و قادری رشید ناسك ووتاری نقابەی شۆفێرەکان و احمدی مارف هی نانەواکان و کەریم پاڵەوان و زۆر برادەری تر ووتاری خوێندەوە، تا سەرە هاتە سەر عثمان دانش ووتارێکی دوورودرێژی خوێندەوەو بووە چەپڵەلێدان و هوتاف کێشان، ئێمە کە ووتم لەلای کۆڕەکەوە دانیشتبووین احمد مارف لەگەڵماندا بووهەردەم خەریکی قسەی خۆش و پێکەنین بووین لەگەڵ چاودێری کۆڕەکە، برادەرێ لەگەڵ بەڕێوەبەری کۆڕەکە دانرابوو هەر خەریکی ئاوهێنان بوو، کاتی ووتەکەی هاوڕێ عثمان هەر قریای ئەوە ئەکەوت

پەرداخە ئاو بداتە دەستی، لای ئێمەشەوە هاوڕێ احمد هەر پەرداخێك ئاو بەردێکی بچوکی لای خۆیەوە دائەنا بۆ بژاردنی پەرداخە ئاوەکان کە هاوڕێ عثمان ئەیخواردەوەو هەریەکەی بەساڵێك حوکم دانابوو بۆی. وابزانم کۆی بەردەکان ٦ - ٧ بەردبوو، مانای حەوت پەرداخ ئاوی بۆ هاتووە، جا بەپێکەنین و دەنگێکی بەرز کە زوربەی خەڵکەکەی ئاگادارکردەوە، ووتی ئەبێ هاوڕێ عثمان خۆی ئامادە بکات بۆ ٦ - ٧ ساڵ حوکم، دوای ووتارەکەی هاوڕێ عثمان هاتەسەرمان و هێرش بردن ووتی ئێوە هیچ ئیشێکتان نییە مراقبەی من نەبێت، بەڵام بەچەند چایەك ئاشتمان کردەوە، بەم چەشنە کۆبوونەوەکە بەردەوام بوو. چەند هەڵبەست و هوتافی تێهەڵکێش خوێندرایەوەو بەچەپڵەلێدان وەرام ئەدرایەوە، نۆرە هاتە سەر قادری حاجی حسین گوڵێکی سوری گرت بەدەستەوەو گۆرانیە بەناوبانگەکەی خۆی ووت (گوڵی سەربەستی) بەچەپڵەلێدان و هوتاف کێشان وەرام درایەوە. ئەم کۆڕە بێجگە لە قادری حاجی حسین زۆر لە برادەرانی پارتی ئامادەبوون، یەکێك لەوانە حاجی باقی بەنگینە هەڵبەستێکی خۆی خوێندەوە، ئێوارەیەکی درەنگیش کۆتاییمان بە کۆڕەکە هێنا و هەرکۆمەڵە سواری ئوتومبیلی تایبەتی خۆی بوو گەڕاینەوە بۆ شار بەڵام ئەمجارە نەك بە نهێنی بەڵکو سەرکەوتنی سەیرانەکە ئامادەبوانی وا لێکردبوو کە هێمنی و لەسەرخۆیی وەلانێن، بەسروودو هوتاف کێشان و چەپڵەلێدان گەڕاینەوە، نەختێکیش بەشەقامەکانی شاردا گەڕاین تا بیکەینە هەڵا، هەرچەندە هیچ شتێ رووی نەداو پۆلیس بەئاگا نەهاتن و فریای بەرهەڵستی نەکەوتن، ئێمەش هەر ئوتومبیلێك لەشوێنی تایبەتی خۆی دابەزانین و بەرەو جێگەو ماڵی خۆبووینەوە. بەراستی ئەم سەیران و کۆڕە یەکێك بوو لە کارە هەرە بەنرخەکانی حزب لەو سەردەمەدا، چونکە رێك وپێکیەکی وورد و ئامادەبوونێکی تەواوی بۆ دروست کرابوو، رەچاوی ئەوەش کرابوو کە لەوانەیە هێرشمان بکرێتەسەر، لەبەرئەوە هێزێکی تایبەتیمان لەبرادەرانی کارامە بەخۆیان و ئەو چەکانەی ئەوساڵە لەبەردەست

دا بوون، بێت و کاتی چونمان و کاتی کۆڕەکەو گەڕانەوەشمان چاودێریمان بکەن. ئۆتومبیلێکی تایبەتی تەرخان کرابوو بۆیان بەسەرپەرشتی هاوڕێیان قادر رشیدو حەمە رشیدی ئەحەشانەو کەریم پاڵەوان و عەزیزی میرزا کەریم و مەلا عەبدولی خەیات و چەندانی تر، ئەو شەوەمان بەئاسایی بردەسەرو لەلایەن ئێمەوە هیچ شتێك رووی نەدا، بەلام بەیانی کە هاتمەدەرەوە زانیم ١٠ – ١٢ برادەر ئەو شەوە گیراون و ئەم دەنگە بەشاردا بلاو بۆوە، کەس وکاری گیراوەکان و خەڵکێکی زۆر بەرەو بەندیخانەبوونەوە، هێرشێکی گەورە کرایە سەر میری و پیاوەکانی، بەلام حزب نەیهێشت رووداوەکە تەشەنە بسێنێت و زیاتر هێرشی گرتن و راونان بکرێتە سەرمان، هەرچەندە دوایی هەڵمەتێکی گەورەی راگەیاندنمان رێك خست و رۆژانی بینینی بەندیەکانمان ئەکردە رۆژانی هەڵمەت و جوولانەوە دژی میری و بەربونی هاورێکانمان، پارێزگارە نیشتمان پەروەرەکانی سلێمانی دەورێکی باشیان بینی و خۆیان ئامادەکرد بۆ بەرگری لێیان، ئەوەبوو لەبەر هێرشی زۆری خەڵکی و فشارخستنە سەرمیری بۆ بەربونی بەندیەکان، هەرهەموویان رەوانەی کەرکوك کران بۆ ئەوەی لەوێوە بیان بەنە بەغدا بۆ مەحکەمە. ئەوانەی گیرابوون لەسەر هەموویانەوە هاوڕێ عثمان دانش و احمد مارف و کەریم پاڵەوان و حەمە رشیدی ئەحەشانەو قادری حاجی حسین و براکەی و عمر نەمەلی و عبدالرحمن لێفەدروو و چەند برادەرێکی کە، هەر لەوکاتەدا وتووێژێکی زۆر لەناو برادەرانی حزب و یەکێتی یەکاندا بلاوبۆوە کە بۆ قادری میرزا کەریم نەگیراوەو یەکێك بووە لەوانەی ووتاریان خوێندوەتەوە بەئاشکرا سەرپەرشتی کۆبونەوەکەی ئەکرد، هەر بۆ ئەمە ژێربەژێر چەند هاوڕێیەکیان ناردە لای حەسەنی شێخ سعیدو بلەی شێخ حەسەن، کە ئەوانە شاهید بوون لەسەر برادەران و راپۆرتیان پێشکەش تحقیقاتی جنائی کردبوو، روو بەروو هەڕەشەیان لێکردبوون کە ئەبێت پەشیمان ببنەوە لە قسەکانیان و شاهێدی نەدەن لەبرادەران بەلام بێئەنجام بوو، لابەلاش درکاندبوویان گوایە قادر هەروەکو ئەوان ووتاری

خوێندوەتەوە بۆچی ناوتان نەهێناوە، ئەو چەند پارەی داوە ئێمەش بۆ برادەرانی ئەدەین، لەوەرامدا ئەڵێن هیچ شتێکمان وەرنەگرتووەو کەسیشیان نەهاتونەتە لامان. بەلام بەراستی لەترسی عەزیزی برای نەمانوێرا ناوی بەرین چونکە ئەیکوشتین‌و رزگارمان نەدەبوو لە دەستی، خۆباشمان ئەزانی‌و زۆرکەسی کە هەبوو ئەبوایە بگیرایە بەڵام ئێمە ئەم چەند کەسەمان بەس بوو، بەڵێ راستیان ئەکرد چونکە ئەو دوانە برادەری خۆمان بوون‌و کاتی خۆی گیرابوون‌و روخابوون‌و ناوی ئەو برادەرانەیان بردبوو بەدوورو درێژیش باسی سەیرانەکەیان بۆ تحقیقات کردبوو، (مەحکەمە هەروەکو احمدی مارف بۆ عثمان دانشی دانابوو سێ‌ساڵیان حوکم دا هەرچەندە حەوت پەرداخ زیاتر ئاوی خواردبۆوە، بەڵام هاوڕێیانی تر هەریەکی ساڵێک‌و شەش مانگیش لەگەڵ مراقەبە بەحوکم دران‌و نێردران بۆ بەندیخانەی بەعقوبە.

ئێمە لەم کاتەدا بەتەواوی لەئیشەکانی خۆمان بەردەوام بووین، بەتایبەتی کە لیژنەی باڵامان زۆر جم‌وجوڵی هەبوو، توانرا ژمارەیەکی کەی دەنگی قوتابیان‌و لاوان دەرچێ، وەکو بڕیاربوو ئەبوایە من ١٥ رۆژ جارێ بچومایە بۆ کەرکوك بۆ کۆبونەوەی لیژنەی باڵا، ئەو کاتەش ماڵی هاوڕێ اسعد خدر لەوێ بوو زۆر شەو لەوێ ئەمامەوە، دۆستایەتیەکی تایبەتیم لەگەڵ هاوڕێ اسعد هەبوو، لەزۆر هەڵوێستی نەتەوایەتیا پشتی ئەگرتم بەتایبەتی ئەوەی کە ئەبێت قوتابیانی گشتی دان بەوەدا بنێ کە رێکخستنەکانی لە کوردستان دا بەناوی یەکێتی قوتابیانی کوردەوە بەڕێوەبچێت‌و هەندێ دەسەڵاتی ناوەندی (مرکزی) لەسەر کەم بکرێتەوەو لیژنەی باڵای یەکێتی قوتابیانی گشتی عێراق خۆی بگونجێنێ لەگەڵیداو بایەخ بەرۆژنامەو بەیان‌و بڵاوکراوەکانی بەزمانی کوردی بدات، هەموو برادەرانی تریش لەکەرکوك ئەم بۆچونەیان هەبوو، کاك کەمالی کەریم بەگ کە لە بەغدا ئەندام بوو لە لیژنەی باڵای یەکێتی قوتابیانی گشتی عێراق دا پشتگیری تەواوی ئەکردین، بۆیە ئێمەش بایەخمان بەلیژنەی باڵامان ئەدا لە کەرکوك. حەمەی عەزیز ناسراو بە

(حەمەی عەزە دۆم) هەرچەندە لەگەڵماندا نەبوو بەڵام لەهەموو شتێکی ئەزانین و پشتگیری تەواوی ئەکردین بەهۆی نزیک بوونی لە لیژنەی اقلیمەوە کە ئەوانیش هەندێجار پشتگیریان ئەکردین، من لێرەدا کە نوێنەری قوتابیانی سلێمانی بووم پشتێکم بە کاک فاضل فرج بوو لەهەڵسوڕاندنی ئیش و کارەکانم دا کە ئەو بەتەواوەتی لە کەرکوک جێگیربوو. چونکە لە کۆلیژی پزیشکی دەرکرابوو تەنها بۆ ئێمەو حزب ئیشی ئەکرد، کە بەراستی دەورێکی باشی ئەبینی بۆ پێشخستنی یەکێتی قوتابیان. حەمەصالح دیلانیش ئەندامی بەرزی لیژنەی لاوان بوو لەگەڵماندا هەر خەریک بوو بەتایبەتی بۆ روون کردنەوەی هەندێ ڕێبیازی نەتەوایەتی و رۆشنبیری و بەسەرکردنەوەی بڵاوکراوەکانمان دا، و چاك کردنی لەرووی زمانەوانیدا، ئێمە هەردەم گیروگرفتمان هەبوو لە ریزەکانی یەکێتیدا، جووڵانەوەی نەتەوایەتی تەنگی پێ هەڵچنیبوین، سوور ئەمانزانی هەندێ شتمان بەچەوتی بەڕێوە ئەڕوات و ئەبێت خۆمان راست بکەینەوە، ململانێی ناو ڕێکخراوەکانمان لەم رووەوە دەم کوت ئەکران، یا بەهەر جۆرێك بوایە پاساو ئەهێنرایەوە بۆ کێشەکانمان، لەگەڵ ئەوەشدا تاکە هێزبووین لە گۆڕەپانەکەداو هەمووشت لەدەست ئێمەدا بوو.

## دروست بوونی یەکێتی قوتابیانی کوردستان

هەر لە ساڵەکانی ١٩٥٣ دا و لە کاتێك دا ئێمە لەوپەڕی گورج و گۆڵی و جموجۆڵییەکی بێ هاوتادا بوین زۆربەی قوتابیان لە دەورمان کۆبونەوە، برادەرانی پارتی بەتایبەتی قوتابیانیان توانیان یەکێتی قوتابیانی کوردستان دروست بکەن. لیژنەیەکیان پێك هینا لە حەمەی احمدی طە(کامەران موکری)و سمکۆ فتح اللە و روشدی عەلی شەریف و علی حسین کە قوتابی شەو بوو بە ڕۆژ شاگرد دارتاش بوو. کەوتنە جم و جوڵ و بەیان دەرکردن قوتابیان بینین و ڕێکخستنی خۆیان. بەڕاستی ئێمە یان خستە هەڵوێستێکی سەیرەوە. ونەمان توانی پشتگیریان بکەین یان دژایەتیەکی توندیان بکەین، لە بەر ئەوەی

بڕیارمان دا بەسەرێك گفت و گۆیان لەگەڵ بکەین و لە لایەکی ترەوە کۆبونەوەی فراوان بە هەموو قوتابیان بکەین بۆ وەرام دانەوە بۆ چونەکانیان. ئەوە بوو لە بڕیارێکی لیژنەی بالاو پشتگیری لیژنەی سلێمانی یەکێتی قوتابیان منیان هەڵبژاردو کە ئەبێت لە هەموو کۆبونەوکاندا قسە بکەم و بەرپەرچی یەکێتی قوتابیان بدەمەوە. ئەمە فرمانێکی هێجگار گەورەو نابەجێ بوو بۆ من چونکە بەراستی پشتگیری هەندێ بۆچونی ئەوانم ئەکرد. تەنها برادەرانی سەرەوەو هەندێ برادەری نزیك خۆم بیرو باوەڕی منیان ئەزانی، جا بەپێی پەیڕەوی حزب نابێت هیچ کەسێك رای خۆی بلاوبکاتەوە، ئەبێت بڕیارەکانی حزب و سەرکردایەتی جێبەجێ بکرێ، بۆیە کەوتمە سەرپەرشتی کردنی کۆبونەوەکان، حەفتەی جارێك پێشەکی بۆ ئەندامانی لیژنەکان، جا بۆ قوتابیانی پێشکەوتوو، دوایش بۆ لایەنگران و ئەوانەی بەدەم بانگهێشتەکەمانەوە ئەهاتن بۆ ئامادە بوون لەو کۆبونەوانەدا، هەرجارە لە شوێنێکی دوور لە شار ئەم کۆبوونەوانە سازئەکرا، جارێ لە تانجەڕۆ و کانی بۆگەنەو سەرچنارو قلیاسان. ئەوەی تانجەرۆ کە گەورەترینیان بوو کە ٢٥ - ٣٠ قوتابی ئامادەبوو، دوای پێشکەشکردنی باسێکی کورت لەوبارەیەوە، ئەبووە لێدوانێکی قوڵ و فراوان لە نێوان قوتابیان دا، پرسیاری زەق و سەیر ئەکراو وەرام دانەوەیەکی باشی ئەویست، من ئەوەی پێم سپێردرابوو هەندێکیم ئەخستە بەردەم. برادەرانی کەش دەورێکی سەرەکیان هەبوو بەتایبەتی فؤاد مجید بەگ و کەمال حاجی مصطفی و هەندێ برادەری کە، زیاتر گێرە وکێشە لەسەر کوردستانی کردنی رێکخراوەکان دەستی پێکرد، کە ئەبێت قەوارەیەکی تایبەتی خۆیان هەبێت و سەربەست بن لە رێکخراوە عێراقیەکان تەنها پەیوەندیەکی برایەتیان هەبێت، ئێمە تەنها بەڵگەمان بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەم بۆچونە ئەوەبوو کە یەکێتی تێکۆشانی هەموو قوتابیانی عێراق بپارێزن کە مەرجێکی گەورەیە بۆ هێنانەدی ئامانجەکانمان، ئەوا یەکێتی قوتابیانی گشتی هەیە و لقی کوردی لەپێشکەوتن دایە و هەموو ناوچەکانی گرتۆتەوە. دیسان ئێمە زانکۆمان نییە

کە مەرجێکی بنچینەییە بۆ دامەزراندنی یەکێتی تایبەتی بۆ خۆمان، ئەمەو زۆر شتی زەقی تر کە بووە جێگەی لێدان و پیاچوونەوەمان لەدوارۆژێکی نزیکدا، برادەرانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان تا یەك دوو ساڵیش هەروەکو خۆیان ئەوچەند کەسەمانەوە، پێش نەئەکەون، چونکە بەراستی وەکو ئێمە جموجۆڵیان نەبوو، هەڵس و کەوتیان هەر لەبەینی خۆیاندا بوو، نەشیان ئەتوانی خەڵکی بۆلای خۆیان راکێشن. بەتایبەتی کە حزبەکەیان دووساڵ بوو تەنگ و چەڵەمەیەکی زۆری بۆ دروست کردبوون.

## هاتنی عمر علي بۆ سلێمانی

هەر لەوساڵەدا سلێمانی گۆڕانکاریەکی گەورەی بەخۆوەبینی، متصرفی سلێمانی کە ناوی عمر علی بوو هاتە سلێمانی، کابرایەکی تا بڵێیت توندو تیژو کەللەڕەق بوو، هەموو ژیانی خۆی تەرخان کردبوو بۆ لێدانی ئێمەو دژایەتیمان، کۆمەڵێ پۆلیس و ئەفسەری لەدەوری خۆی گردکردبۆوە کە لەهیچ شتێ سڵیان نەئەکردەوە بۆ سەرکوت کردنی جوڵانەوەی نیشتمانی وەکو توفیقە رەش و معاون حسین و سعید ساقی و شێخ رەزاو عثمانی مەلاو هەندێکی کە، هەرچەندی هەندێکیان خەڵکی سلێمانی بوون نەختێ دەستیان ئەپاراست و لێبوردنیان هەبوو، عمر علی و تاقمەکەی وێڕای ئەوەی لەگەڵ ئێمەدا بەم چەشنەبوون، بەڵام زۆر بە توندی دژایەتی پیاوانی شەڕکەرو دزو درۆزنیان ئەکرد. رۆژنەبوو لەسەر شەقامەکان چوار پێنج لەمانە نەکەونە بەرلێدانی پۆلیس و گرتنیان، بەتایبەتی لەو سەردەمەدا جامانە بە سەرێکی گەنجت نەئەدی سوکایەتی پێنەکرێ و لێدان نەخوات، ئەوەی چاوی لەیەکێ مۆڕ بکردایەتەوە بەشەق و تێهەڵدانی پۆلیس ئەبرایە بەندیخانە، ئەوەی بە سەرخۆشی لە شەقامەکان بەدی بکرایە یەکسەر ئەگیراو بەند ئەکرا، خۆ ئەوەی شەڕی بکردایە هەردوولای شەڕکەر سزائەدران، ئەمەو زۆر شتی کە عمر علی خستبوویە سەر شانی خۆی بە بۆچوونی ئێمە ئەمانە هیچی بۆ بەرژەوەندی

خەڵکی نەبوو، بەڵکو بۆ چاوترساندن سازئەکرا. هەرچەندە لایەنی باشی هەبوو، بەڵام ئێمە زۆر دژایەتیمان ئەکرد، چونکە ئەوانەی زیاتر ئەو ئەیویست سەرکوتیان کات سەر بەجوڵانەوەی نیشتمانی بوون، ئێمەیان خۆش ئەویست و ڕێزیان لێئەگرتین، بۆ نموونە بۆ ئەم دژایەتیە سەلیم ناوێکی دانابوو بە مأمور مرکز هیچی لەخۆی نەگەڕابۆوەو بەئاشکرا خراپەی ئەکردو ئازاری خەڵکی ئەدا، جارێکیان ئێمە چەند برادەرێ لەبەندیخانەی خوارەوە گیراین، شەو چەند کەسێکیان هێنا لەسەر خواردنەوە کردبوویان بەشەڕو هەڵا، گیرابوون کە بەناوبانگترین شەڕکەری شاری سلێمانی بوون سەلیم هاتە سەریان و لێیان راپەڕی و کەوتە لێدان و سوکایەتی پێکردنیان لەسەر ئەوەی قایل نەبوون بێنە لای ئێمە چونکە سەرخۆشن، بۆ ئەمە بەرەنگاری سەلیم بوونەوەو هاواریان ئەکرد ئێمە سەرخۆشین و شایەنی ئەوە نین بچینە لای ئەو بەڕێزانە، بەم چەشنە لەڕوومان نایە لایان دانیشین و لەگەڵیاندا بدوێین لەبەر ئەم سەرماو بێجێگەییە هەڵئەکەین تا بەیانی بەم چەشنە بەمەرجێ لای ئەوان نەبین، ئەمە لای سەلیم زۆر سەیر بوو ئەوەندەی تر تورەبوو دەستی کرد بە هەڵچوون بەرویانداو کێشەکە گەورەبوو، هەرچەندە ئێمە دڵنەواییمان ئەکردن و ئەمانویست بێینە ژوورەوە بەڵام بێسوود بوو، تا بەیانی لە راڕەوەکەدا مانەوە، دوایی دەموچاویان شت و نانیان خواردو خۆیان رێکوپێک کردو هاتنەژوورەوە لامان. سەلیم پێی ووتن باشە ئێوە ئەوەندە شەرم لەم سیاسییانە ئەکەن بۆچی خۆتان والێئەکەن، یەکێکیان وەرامی دایەوەو ووتی ئەمە شتێکەو ئەوە شتێکی تر، ئیتر سەلیم ئەوەندەی لەسەر نەڕۆیشت چونکە هەندێ جاریش سەلیم دڵنەوایی ئەکردین، هەرچەندە بەئاشکرا زۆر دژمان بوو، هەر ئەوجارە بوو عمر علی هاتە لامان و هەریەکە بۆ ساتێك لەگەڵمانا دواو پێشەکی بە عبدالرحمانە شەلی ووت کە ئیفلیج بوو، ووتی: تۆ بەم چەشنە حکومەت ئەروخێنی؟ تۆ ناتوانی بەڕێگا بڕۆی! دانیشە خۆت بژێینە باشترە؟ عبدالرحمن ئازایانە وەرامی دایەوەو ووتی من بیروباوەڕم هەیە، بەزمان ئەدوێم

خەڵکی گوێم لێ‌ئەگرن، بەم چەشنە خۆشیان ئەوێم، ئێوەش بەم لەش‌و لارەوە لێم ئەترسن‌و ئەمگرن. عمر علی رووبەرووی بۆوەو ووتی: باشە بۆخۆت بنو لێرە باشترە، رووی کردە حەمە ئەمین ئاسنگەر کە سمێڵێکی رەشی گەورەی هەبوو لێی چووە پێشەوەو دەستی دایە سمێڵی‌و ووتی کاوەی ئاسنگەر ئەم سمێڵە زلە چیە وەك سمێڵی پس. ئەبێ بەیانی بیتاشی‌و بەم شێوەیە نەت بینمەوە، حەمە امین تورەبوو دەستی هێنا بەسمێڵی‌داو بەدەنگی بەرزو نەترسەوە ووتی ئەمە سمێڵی پیاوە، سمێڵی ئازاو لێهاتووە، نەك گەندەڵ‌و ترسنۆك، ئێوە لە سمێڵیشمان ئەترسن، عمر علی بەرامبەر ئەم رووبەرووبوونەوە هیچی نەووت‌و رووی کردە ئەحمەدی مارف‌و ووتی وەرە تۆ بۆ خەریکی نانەوایی نابیت، نانەوا چۆن ئەچێتە سەر حوکم؟ بەتەمای چییت؟ احمد بە پێکەنینەکەی خۆیەوە کە هەمووی سوکایەتی بوو بە عمر علی ووتی ئێمە میللەت ئەمان هێنێتە سەر حوکم‌و رەش‌و رووتی ئەم وولاتە لەگەڵمانە، لەدوایدا رووی کردە ئێمە کە چەند قوتابیەك بووین، ووتی ئێوە بۆ ناخوێنن‌و واز لەم سیاسەتە ناهێنن؟ هەرهەموومان وەراممان دایەوەو ووتمان پێویستە دوارۆژێکی باش بۆ میللەت بهێنینەدی، بەڵام زۆری لەسەری نەرۆیشت ووتی باشە باشە بۆ خۆتان دانیشن‌و بحەوێنەوە سەرئەکەون‌و ئێمەش هەموو لەسێدارە بدەن، هەر ئەمجارەش کاك عارفی رەشەگوڵەییمان لەگەڵدا بوو کە گەنجێکی جوانی چاوشینی سپی‌کەلانەی زیرەك بوو، لەسەر ئەوە گیرابوو تەقەی لە تۆفیقە رەش کردبوو لای پیرمەسوور، بەڵی ئەم هاورێیە زوربەی ناومالی خۆی فرۆشتبوو بۆ ئەوەی بیدا بە دەمانچەیەك لەسەر داوای حزب، دەمانچەو فیشەکی رۆژی خۆپیشاندان هەلگرتبوو، کاتێ دوای بڵاوەکردن ئەیەوێ بەرەومال بگەرێتەوە، رووبەرووی تۆفیقە رەش‌و چەند پۆلیسێك ئەبێتەوەو رێگەی پێ‌ئەگرن‌و هەڵمەتی بۆ دەبەن تا بیگرن، ئەویش ریزێ بەناویاندا ئەکاو تۆفیقە رەش بریندار ئەکاو پۆلیسەکان بڵاوەی لێ‌ئەکەن‌و ئەمیش دەرئەچێ، بەڵام دوایی ئەیگرن‌و بە بریندارکردنی تۆفیقە رەش

گوناهبار ئەکریّ، جا عمر علی ئەم هەموو شتانەی ئەزانی، لێی هاتەپێشەوەو رایکێشایە لای خۆیەوەو هاواری بەسەرداکردو ووتی هەردوو چاوت دەرئەهێنم، چۆن ویستوتە معاونێکی پۆلیس بکوژی بۆ گاڵتەی منالانە، ئەتۆ ئەبێت فەرمانی خنکاندنت بۆ دەرچێت، خۆم دێم بۆ شاهیدی، زۆری لەسەر رۆی تا بەرەنگاری وەرامی عارف بۆوە، پیّی ووت تۆ معاونت نییە سەگت هەیە! لاقی خەڵکی ئەگریّ، هەموو کەس دژێتی، پیلان بۆ ئەمو ئەو دائەنیّ، منێکی هەژار دەمانچەی چیو بریندارکردنی ئەوی چی، هەمووی درۆیە ئامادەم بۆ محاکەمە کردنێکی عادیلانە! باشە وەکو ئەلێن کۆمەڵیّ پۆلیسی لەگەڵ بوو بۆچی نەیانگرتم؟ خۆ هەموو کاتیّ پۆلیس چەك بەدەستن بۆ تەقەیەکیان لێنەکردم؟ ئەمەو زۆر قسەی تری کرد، عمر علی پشتی تیّکردو لێی دوورکەوتەوە، پاش چەند رۆژیّ بردیان بۆ کەرکوك. دە دوانزە پارێزەر بەسەرپەرشتی مەعروف بەرزنجی بەرگریان لێکرد، لەگەڵ ئەوەشدا دووساڵ بەندیان بەسەرادا. دوای ئێمە چووە سەر عوسە رەشو عثمانی میناو بلە کوێری قەسابو عەلی عەینەو ئەوان کەوتە هێرش بردنەسەریانو لە سەلیم تورە بوو پیّی ووت بۆچی ئەوانەی لای ئێمە داناوە، ئەبێت لەیەکتریان دوور بخەنەوە با لەوە زیاتر مێشکیان تێك نەدەن، بەم جۆرە ئەو رۆژە سەعاتێك زیاتری لای ئێمە بردەسەر، بەڵام وادیاربوو زۆر پەشیمان بوو چونکە هیچ دەست نەکەوت لەبەرهەڵستی زیاتر.

## عمرعەلی و قوتابیان

هەر لەدوای چەند مانگێك لەهاتنی عمر علی چەند خۆپیشاندانێکی قوتابیان کراو جموجۆڵی یەکێتی پەرەی سەند، کە بووە هۆی شلەژانی میریو پیاوەکانی، بۆیە بەپەلەو بەپیلانێکی راستەخۆ چەند قوتابییەك گیراو هەندێکیش لە قوتابخانە دورخرایەوە وەکو جەلالی مەلا کەریمو صادق صدیق کە بەتوندی لەکاتی سەردانی عمر علی بۆ قوتابخانەکەیان وەرامی دایەوە

لەپرسیارێکیدا کە لێی کرد گوایە ئەیەوێ ببێتەچی، صادق پێی ووت ئەمەوێ ببمە کرێکار، ئەویش لێی تورەبوو بەوەی چۆن وا ئەڵێت و پێی دەڵێ تۆئەبێ بخوێنی و ببیتە خاوەن پیشەیەکی باش، ئەمە بیروباوەڕی گێرەشێوێنەکانە، ئەویش دیسان پێی ئەڵێتەوەو ئەڵێ بەڵێ لەم رژێمە خراپەی ئێوەدا دوارۆژی قوتابیان هەر ئەمە ئەبێت.

مشت ومڕێکی گەورە لەبەینیان دا رووئەدات و بەرەو دەرەوە مل ئەنێت و ئەم هاتنەی عمر علی بۆ قوتابخانەکان و گەڕان بەسەریاندا، ئەیویست قوتابیان مل کەچ بکات و بیان ترسێنێ، بەڵام لە هەموو چۆنێك دا بەرەنگاری ئەبوونەوە، هەرلەم هەوڵەیدا بۆ سەرکوت کردنی جوڵانەوەی قوتابیان هات کۆڕێکی پێك هێنا لەهۆڵی ناوەندی سلێمانی و ٣٠٠ – ٤٠٠ قوتابی کۆکردەوە، خۆی هات و دەستی کرد بە قسەکردن و هێرش بردنەسەر جوڵانەوەی نیشتمانی و یەکێتی قوتابیان، بە ئاشکرا رایگەیاند هەرقوتابیەك سەرپێچی بکات توشی گرتن و راونان و بەندیخانە ئەبێت و دوارۆژی کوێرئەبێتەوە، زۆرشتی کەشی لەدەم هاتەدەرێ و دەستی ئەدا بە مێزەکەداو ئەیشیڕان و هەڕەشەی داخستنی قوتابخانەکانی ئەکرد، ئاگاداری کردین کە ئێستاش یەکێ لەقوتابیە گیراوەکانتان پیشان ئەدەین با بۆتان بدوێ کە لە خۆپیشاندانێکی خوێناویدا بەچەکەوە گیراوە، لەباتی خوێندن و کۆشش کردن ئەیەوێ وڵات تێك بدات، هەرئەوەندەمان زانی شێخ صدیق مەحمودیان بەکەلەپچەوە هێنایە پێش هۆڵەکەو کەوتنە سوکایەتی پێکردنی. ئەویش ئازایانە خۆی راگرت و هیچ ووتەیەکی لە دەم نەهاتەدەرێ، ناچاربوون بەپاڵ بردیانە دەرێ و دووریان خستەوە، ئێمە هەموو زۆرسەرمان سوڕما و برادەرانمان نەیان توانی ئەوکاتە هیچ بکەن چونکە شتەکە زۆر کتوپڕبوو، لەگەڵ ئەوەش دا پۆلیس و پیاوی میری لەخەڵکەکە زۆرتربوون و چەك بەدەست و ئامادەبوون بۆ هەمووکارێ، هەرچەندە ورتەورتێکی زۆرو ئاشکراو بەیەکا هاتنێك پەیدابوو بەڵام نەتوانرا هیچ شتێ بکرێ، پاش چەند رۆژێ

یەکێتی ڕەخنەی لەخۆی و قوتابیان گرت کە ئەبوایە ئەوکاتە شتێکیان بکردایە بۆ پشتگیریکردنی شێخ صدیق کە پاڵەوانانە خۆی ڕاگرتبوو لەبەر ئەو هەموو ئەشکەنجەو لێدان و بەندیەدا، بەڵام خێرایی ڕوداوەکەو خۆئامادەنەکردنی برادەران فریای هیچ نەکەوتن ئەوەبوو یەکێتی بڕیارێکی توندوتیژو ئازایانەی دەرکرد بە مانگرتنێکی گەورەو خۆپیشاندانێکی سەرانسەری بۆ ماوەی چەند ڕۆژێ لەقوتابخانەکان داو بۆ ماوەی چەند ڕۆژێ بەردەوام بوو بەچەشنێ میریان شڵەژاند پاشەکشەیان پێکرد بەوەی دەرکراوەکان بگێڕنەوە قوتابخانەو گیراوەکان بەردرێن، هەموو داواکاریەکان جێبەجێ بوو بەمەرجێ دەرکراوەکان بنێردرێنە قوتابخانەیەکی تر بخوێنن، جا قوتابیان کردیانە ئاهەنگ و هەڵپەڕکێ و نوقوڵ دابەش کردن لە قوتابخانەکانەدا.

## گورج و گۆڵی قوتابیان و شانۆگەری

بۆ گەشەکردن و بڵاوبوونەوەی ڕێکخستنەکان و چوونەناو زوربەی قوتابیانەوە، بڕیاری ئەوەمان دا شانۆگەری بێنەوایان (البؤساء) پێشکەش بکەین کە حەمەی ئەحمەدی طە (کامەران موکری) دەوری جان خال جانی ئەبینی، هەموو ئێوارەیەك دانیشتوان و سەیران کەرانی ئەهەژان و ئەبووە چەپڵەلێدان و هەندێ جاریش هوتاف کێشان، بەتایبەتی ئێوارەیەك هاتە پێش شانۆکەو بەدەنگی بەرز هاواری کردە ئەوانەی لە پێشەوە دانیشتبوون کە پیاوانی میری و کاربەدەستان و خاوەن پارەکان بوون، وتی لەگەڵ ئێوەمە ئەی چاوچنۆکەکان، ئەی خوێن مژەکان، نەختێ بەزەییيات بەم میلەتە هەژارو داماوەدا بێتەوەو زۆرشتی تر کە زۆری دانیشتوانەکە هەڵسان و ڕۆیشتن و کێشەیەکی گەورە بۆ ئێمە پەیدابوو، بەڵام دڵمان دانەوەو تێمان گەیاندن ئەوە دەقی شانۆگەریەکەیەو ئەبێ بووتریێ و شانۆگەرییەکەشمان لە داخستن دوور خستەوە، ئەم شانۆگەریە بزوێنەرو سەرپەرشتیکەرو دابەش کردنی داهاتەکەی لیژنەیەکی دروست کراو لەلایەن یەکێتی قوتابیانەوە هەڵ

ئەسورپێنرا، بەڵام سەرپەرشتی کردنی هونەری لەلایەن مامۆستا رفیق چالاكو مامۆستا ئەنوەر توفیی و كاك نوری وەشتییەوە بوو كە بەراستی دەورێکی بالاّیان هەبوو لەسەرخستنی شانۆگەریەکەدا، بەتایبەتی مامۆستا رفیق چالاك كە بیّلایەنانە ئیشی ئەکردو ئەکتەرەکانی سەربەئێمەی خۆش ئەویست. کێشەیەك روویدا لەهەڵبژاردنی ئەکتەرەکاندا هانایان بۆمن و چەند برادەرێکی تر هێنا كە بکەوینە بەینیانەوە، ئەنوەر توفی ئەیویست برادەرانی ئێمە دووربخاتەوە، لەبەردەمی منو هەموو برادەرانی دا رەفیق چالاك لیّی راست بۆوەو نەڕانی بەسەریداو هێرشی بردە سەریو پیّی ووت ئەمانە بەگیانێکی لەخۆبوردنەوەو بەپاکیو راستی ئیشمان بۆ ئەکەن تۆ چۆن رێگەیان ئەگری، ئەمانە گوڵی سوورن بەیەخەی میللەتەوە، ئەنوەر توفی لەقسەکانی رەفیق چالاك واقی ورماو نەیئەزانی ئەڵیّ چیو بۆ بەرگری لەمانە ئەکات، بەناچاری پاشەکشەی کردو کەوتە راپەڕاندنی ئیشەکەی، چونکە ئەگەر وانەبوایە شانۆگەرییەکە پێشکەش نەئەکرا، بۆ ماوەی هەفتەیەك هەموو ئێوارەیە بووە ڤیستقاڵێکی قەشەنگ بۆقوتابیانو هەموو جەماوەر بانگ هێشت ئەکران، هەروەها بووە کۆکردنەوەی یارمەتیەکی باشو لەبار بۆ قوتابیان، لەلایەکی تریشەوە بووە پێکەوە نوسانو نزیك بوونەوەی ئێمەو برایانی قوتابیانی کوردستانو توانرا بەهاوکاری هەردوولا ئەم کارە پیرۆزە بێتەدیو هەروەها كاك کامەرانو عەبدولی سۆرانو سمکۆ فتح اللهو هەندێکیتر دەورێکی باشیان لەگەڵماندا بینی.

## هەڵبژاردنی پەرلەمان

مانگی حوزەیرانی ١٩٥٤ هەڵبژاردنی پەرلەمان کراو بەرەی یەککگرتووی نیشتمانی لەسەرانسەری عێراق دا پێك هات، بەیاننامەیان بەم بۆنەیەوە دەرکردو نوێنەری خۆیان بۆ هەڵبژاردن دەست نیشان کرد، ئێمەش لەسلێمانی بەرەیەکمان بەو چەشنەی ئەوان کردەوە، بەڵام تەنها لەگەڵ پارتی

دیموکراتی کوردستان دا، ئەوانەش نوری احمد طە و حلمی علی شریف و حمەی حاجی تایەر نوێنەریان بوون، لەپاڵ برادەرانی ئێمەدا کە هاوڕێ دڵزارو وەستا عەبدول نوێنەرمان بوون، و مارف بەرزنجی و ابراهیم احمد هەڵبژاردەی بەرەبوون، بۆیە گەورەترین توانای خۆمان خستەکار بۆ سەرکەوتنیان، پێش چەند رۆژێك لەهەڵبژاردن، لە هەموو قەزاو ناحیەو شاری سلێمانیدا کۆبونەوەی گەروە گەورە سازکرا بۆ خەڵکی، زۆرجاریش خۆیان ئەهاتن لەگەڵ دانیشتوان دا ئەدوان، وێڕای ئەوەی کە ئەمانە نوێنەری حزبی شیوعی و پارتیبوون، بەڵام خودی خۆشیان لای میللەت بوون و تێکۆشەرو ئازاو لێهاتوون و خەڵکی شانازی پێوە ئەکردن و هەردەم لەناو خەڵکی رەش و رووتابوون، هەموو کەس ئەیناسین و رووبەروو مامەڵەی لەگەڵ ئەکردن، بەپێچەوانەی نوێنەرەکانی میریەوە هەرچەندە خەڵکی سلێمانیش بوون. بەڵام پارەدارێکی گەورەو خاوەن کۆشك و تەلارو پیاوی دەستەو دائیرەی تایبەتی خۆیان بوون. بێجگە لەوەی پیاوی میری بوون. خەڵکی خۆشیان نەئەویستن. میری هەوڵی زۆری دا بۆیان تا دەرچن و پارەیەکی بێشوماری بەسەر کارمەندانی خۆیدا بڵاوکردەوە، هەڕەشەو گوڕەشەیەکی بێهاوتای بەرەو رووی خەڵکی کردەوە،و سندوقەکانی پڕکرد لەدەنگ بۆ ئەوان، بەڵام هەر نوێنەرەکانی ئێمە زوربەی دەنگیان هەبوو، تا ئێوارەیەکی درەنگ لەهەموو لایەکەوە خۆپیشاندانی بچوکی خۆشی و هەڵپەرکێ و چەپڵەلێدان بەردەوام بوو، پەلەمان لە بڵاوکردنەوەی ئەنجامی هەڵبژاردنەکە ئەکرد، هەموو شەقام و مزگەوتەکان خەڵکی تێڕژاو تا شەوێکی درەنگ هیچ دەرنەچوو، زۆر دواخراو خەڵکیش بەپەرۆشەوە چاوەڕێیان ئەکرد، تا لەپڕ بڕیاری دەرچوونی نوێنەرەکانی خۆیان بڵاوکردەوە بە زۆرینەی دەنگ بەرامبەر ئەوانەی ئێمە، بوو بەهەڵا و خۆکۆکردنەوەو چەپڵەلێدان و هوتاف کێشان دژی ئەنجامی هەڵبژاردن، بەڵام بێسوود بوو هیچمان بۆ نەکرا. ئەوە نەبێت بۆ رۆژی دوایی چەند خۆپیشاندانێك کراو مانگرتنی دوکاندارەکان و نانەواخانەکان و

قوتابخانەکان دەستی پێکرد. لە مەحکەمە ناڕازی بوونی نوێنەرانی ئێمە نوسراو بڵاوکرایەوە، میریش کەوتە گرتنی هاوڵاتیانی زۆرو بەرەو رووی بەندیخانە کرانەوە، ئەم ناڕەزاییە لەهەموو عێراقدا بەرپاکرا، لەگەڵ ئەوەش دا ١٠ – ١٢ نوێنەری بەرەی نیشتمانی دەرچوون، بەڵام میللەت پێی قایل نەبوو چونکە زۆر فڕوفێڵ کرابوو داوای دوبارەکردنەوەی هەڵبژاردن ئەکرا، تا میری بڕیاری دا راستەوخۆ فڕوفێڵێکی زۆر کراوە ئەبێت هەڵبژاردن سەرلەنوێ بکرێتەوە لە کەشێکی دیموکراتی بەرفراوان دا، ئەمەش سەرەتای فێڵو فەرەجی‌نوری سەعید بوو بۆ سەرکوت کردنی میللەتو لەدەست دانی ئەو تۆزە سەرکەوتنەی کە بەدی هاتبوو بەناردنی چەند نوێنەرێکی میللەت بۆ پەرلەمان. دوای ٢ –٣ مانگ هەڵبژاردن کرایەوە بێ ئەوەی یەك نوێنەری راستەقینەی خەڵکی دەرچێ. و لەهەموو شارەکانی عێراق بووە خوێن ڕشتنو بەیەکادانو گرتنو راونان بۆ نەهێنانەدی خواستی میللەت.

ئێمە لەسلێمانی هەرزوو خۆمان بۆ ئەم جارە سازدابوو، هەموو رێکخراوەکانمان ئامادەبوون، رێکەوتنێکی چاك لەجاری پێشوو لەگەڵ برادەرانی پارتی‌دا هاتبوەدیو هەردوولا خۆمان ئامادەکرد بۆ چوونە ناو هەڵبژاردنەوە، چەند رۆژ لەوەوبەر ڕێگەو شوێنی گونجاو دەست نیشان کرا بۆ خۆپیشاندانو هەڵمەت بردنەسەر بنکەکانی هەڵبژاردنو سندوق فڕاندن لە کاتی ساختەکاریدا. ئێمە هەموو رێکخراوەکانمان ئامادەکردبوو بۆ ئەم بەیەکاهاتنە بەتایبەتی حزب بەرنامەیەکی تازەی بۆ خۆی دانابوو کە هێرشو سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو، هەرلەم کاتەشدا بوو هاوڕێ دڵزار لەسلێمانی نەماو هەڵگری ئەم رێگە تازیەی حزبیش هاوڕێ عثمان خۆشناوو عمر دیلان بوونو بوونە لێپرسراوی حزبو هەموو رێکخراوەکانو بەو ڕێبازە تازەیە گۆشکران. لەهەموو گەڕەکەکاندا بنکەی تازەمان دروست کردو هەموو شتێکی تیادا ئامادەکرابوو وەك هەندێ چەكو خواردنو پێخەفو داوو دەرمان. لە سەرشەقامو چوارباخو دەرگەزێنو مەڵکەندیو گەڕەکی قەسابەکان کە زیاتر بۆ

جوڵانەوەو هاتوچۆ ئەشیان، ئێمە قوتابیان ماڵی کاك حەمە سەعیدی برای حمە کاکەمان کردە بنکەی خۆمان کە بەتەنیشت ماڵی حەمە کاکەوەبوو. ئەم دەرگای لەدیوی گەڕەکی قەسابەکان بوو یەکسەر ئەهاتەوە سەر کۆڵانەکانی حەمامی سورەت و قوتابخانەی ئەیوبیەو گەڕەکی چوارباخ و سەرشەقام کە چەند کۆڵانێکی چڕو دوورو درێژ بوو، ماڵی حەمە سەعیدیش دەرگای لەودیو بوو ئەکەوتە بەر مزگەوتی شێخ سەلام و نزیك شەقامی مەولەوی و ئەوپەڕی گەڕەکی کانێسکان و ئەوبەرت بپڕیایە بەبێ ترس ئەگەیشتیتە گەڕەکی شێخان و مەڵکەندی. هەردوو ماڵەکەش دەرگایان لەبەیندابوو، بەمەرجێك عمر دیلان لەگەڕەکی چوارباخ نزیك بەجولەکان ئەژیا و ماڵی هەبوو، عثمان خۆشناویش لە گەڕەکی مەڵکەندی ئەژیا. ئەم دابەش کردنە زۆر یارمەتی ئێمەی ئەداو هاتوچۆی برادەرانی ئاسان کردبوو بۆ لامان، بەتایبەتی هاوڕێیان فؤاد مجیدو کەمال حاجی مستەفا لەگەڕەکی دەرگەزێن بوون، مزگەوتی حاجی مەلا عەزیز لەگەڕەکی سەرشەقام خوارماڵی خۆمانەوە بنکەیەکی هەڵبژاردنی لێدانرابوو بێچەندو چوون بەهی خۆمانمان ئەزانی چونکە سەربەخۆمان بوون، بۆیە بڕیاردرا هەر لەوێوە دەست پێبکەین و خۆمان ئامادە بکەین بۆ هەڵبژاردن و هێرش بردن. بەرماڵی ئێمەو دووڕێیانەکەی کە ئەچێت بۆ بازاڕو جولەکان و چوارباخ بەدوکاندارەکانیشەوە ناوبانگیان بە-مۆسکۆ- دەرکردبوو، چونکە هەرچی خۆپیشاندانێك و بەیەکدادانێك رووی ئەدا زوربەی لەوێوە دەستی پێئەکرد، گەر لەوێش دەستی پێنەکردایە، لەوێ بڵاوەی پێئەکراو کۆڵان و ماڵەکانی سەرشەقام ئەبووە جێگەی پاراستن و حەوانەوەی برادەران، رۆژی هەڵبژاردن هەرلە بەیانیەوە چەك بەدەستەکانمان کەوتنە خۆیان و ئوتومبیلێکی بێژمارەیان ئامادەکردو رەشاشێکی بچوکیان هەبوولێیان بەست بەچەشنێ ئوتومبیلەکانی پۆلیس، عەزیزی برام و حەمە رشیدی ئەحەشانەو مەلا عەبدولی خەیات و کەریم پاڵەوان و یەك دووبرادەری تر خۆیان بۆسەر ئوتومبیلەکە دیاری کرد بەو

ووردە چەکانەی هەیان بوو بەمەرجێ فؤاد سەرکردایەتی بکاتو نائب ببێتە یارمەتیدەرو پەیوەندی لەگەڵ لێپرسراوانی حزب لە دەرەوەی خۆپیشاندانەکان. کەمالی حاجی مصطفیو شێخ صدیقی شێخ مەحمودو یەك دووبرادەری کە لە دەرەوە ئاگاداری برادەران بنو لەگەڵ عمر دیلان دا پەیوەندیان هەبێت، بۆ بەیانیەکەی درەنگ کە زانرا ساختەبازیەکی زۆر ئەکرێتو پۆلیسێکی بێشومار دابەزیوەو خەریکی پشکنینی خەڵکین، خۆپیشاندانو هەڵمەت بردن دەست پێکرا بەچەپڵەلێدانو هوتاف کێشانو لەهەموو لایەکەوە خەڵکەکە بەرەو ناوەوەی خۆپیشاندانەکە هاتن، تا لەبەر گۆڕەپانی گومرگە سوتاو نزیکی بازاڕو شەقامی کاوەو سەیوانو سەرشەقام چەند ووتەیەك خوێندرایەوەو چاوەڕێی گردبوونەوەی زوربەی خەڵك بووین تا بەرەو شەقامی کاوە بڕۆین، هێرشی گەورەی پۆلیس کرایە سەرمانو بوو بەتەقە، هەر لەوێدا سەعید ساقی بریندارکرا لەگەڵ چەند پۆلیسێك بەرەو شەقامی کاوە رایانکردو ئوتومبیلێکی خەستەخانە هەڵگرتن، دوایی هێزێکی گەورەتر بەرەو رووی خەڵکەکە هاتنو بووە شەڕێکی دەستەویەخەو هێزی پۆلیس لەوەدا نەبوو کە بتوانین بەرگری لەخۆمان بکەین، تەنگیان پێهەڵچنینو ناچاریان کردین ببینە چەند کۆمەڵێكو بەرەو سەرشەقامو گەڕەکی گۆیژەو دەوروبەری حەمامی سورەت هەڵبێن، بەڵام تەقەکردنو شەڕە بەردو هوتاف کێشانەوە لەسەرشەقام حەمەی باخەوان (حەمەی حاجی غەفور) شەهیدکرا، وچەند برادەرێك بریندارکرانو هەندێکیش گیران، بەڵام توانرا زوربەی برادەرانمان لەگەڕەکی گۆیژەو ناوبازاڕو حەمامی سورەتو سەردەبۆکە خۆیان بگەیەننە گۆڕەپانی ئەسحابە سپیو لەوێ یەکتر بگرینەوەو دەست بکەینەوە بە هوتاف کێشانو چەپڵەلێدان، وهێزێکی کەمی برادەرانی چەکداریش دەوریان داین، لەوبەریشەوە لەسەر شەقامی کاوە پۆلیسێکی زۆر چاوەڕێی هێرش بوون بۆ سەرمان بەڵام کەمێ ئەسڵەمینەوەو پرکێشیان نەئەکرد، شێخ رەزای گوڵانی سەرکردەیان بوو لەگەڵ تۆفیقە رەشو چەند

ئەفسەرێکی کە، خۆپیشاندەرەکانیش هاوڕێ فؤاد مجیدو کەمال مستەفاو حلمی علی عەلی شەریفو حسە رەشو عەبدولی سوران سەرپەرشتیان ئەکردن، هەر لەوێدا کورسی‌یەکیان بۆ حەمەی ئەحمەدی طە دانا و چووەسەری و دەستی کرد بە قسەکردنو هەڵبەست خوێندنەوە بە دەنگە دلێرەکە، بەراستی خەڵکەکەی واهەژاندو هوروژانو ئامادەی کردن بە چەشنێ کە بۆ هەموو کارێ سەریان پێوە نەبوو، مەحمود هەژاریش لەژێر کورسی‌یەکەیدا نقەنقی‌بوو، ساتەناساتێ منجەمنجێکی ئەکردو دەستی لێبەرەلائەکردو هوتافی ئەکێشا، کامەرانیش خێراخێرا رووی لەشێخ رەزای گولانی ئەکردو ئەینەڕان بەرامبەری و ئەیووت، هەی پیاوی میری چاو مۆر کردنەوەت ئێمە ناترسێنێو دامو دەزگا شڕەکەت ئێمە نالەرزێنێ، ئێمە میللەتمان لەگەڵە تۆش ئەو پۆلیسە هەڵخەڵەتاوانە! وێڕای ئەوەی شێخ رەزا سەر بە پارتی بوو کامەرانیشی بەدۆستی خۆی ئەزانی و ئێمەشی خۆش دەویست، ئەمجارە ئەوەندەی لەدەست هات کە نەی هێشت کێشەکە گەورەتر ببێت، نەختێ کشایەوەو ئێمەش بەرەو گەڕەکی قەسابەکان رۆیشتین و لەوێ بڵاوەمان لێ کردو لەو گەرەکە هەندێکمان لە ماڵی حەمەسعید ماینەوە، پاش ساتێکی کەم گوێمان لە تەقەبەکی زۆر بوو لە شەقامی مەولەوی نزیك بیناکەی تۆفیق قەزاز، پاشان هاوڕێیەك بە هەڵەداوان هاتو پێی راگەیاندین مەلا عەبدولی خەیات کە یەکێك بوو لە گیراوەکانی گەڕەکی سەرشەقام لە ناو ئۆتۆمبیلێکی پۆلیس دا خۆی فرێداوەتە خوارێ و تەقەیان لێ کردوەو برینداره بەڵام بۆیان نەگیراوە لە ماڵێکی خزمی لەگەرەکی کانێسکان چاوەڕێی یارمەتیمانە تەداوی بکەین و دەرمانی بۆ بەرین. ئێمەش بە هۆی بەدیعەی مامەوە پەیوەندیمان کرد بە خوشکە – معزز – ەوە کە هاوڕێیەکی خۆمان بوو لە خەستەخانە ئیشی ئەکرد. بە خۆیو دەرمانو شرنقەوە لە گەڵ بەدیعەدا خۆیان گەیاندە ئەو ماڵەی مەلا عەبدولی تێداکەوتبوو، چارەسەری کردو بۆ شەو سەری لێدایەوەو دڵنیای کردو برینەکەی ئەوتۆ نیەو مەترسی لێ ناکرێ، دواجار گواستمانەوە

بۆ جێگەیەکی کە.

ئێمە لەماڵی حەمەسەعید برای حەمەکاکە گیرساینەوە، من و فؤاد جەلال و نائب عبدالله و هۆگر گۆران و حەمەکاکەو یەك دوو برادەری کە، لەو کاتەدا بەردەوام بوو لە پشکنینی ماڵ و خەڵك گرتن دا بەندیخانەکانیان پڕکرد لەگیراوان و ڕێگەی چاوپێکەوتنیان قەدەغەکرابوو، زۆریان بەبرینداری فڕێ درابوونە ژوورەوە بێئەوەی تەداوی بکرێن، هەرچەندە خوشکە معزز دیسان ئازایەتی خۆی دەرخست و لەگەڵ هەندێك لەخوشکانی خۆیدا چووبوون بۆ بەندیخانە بەناوی خەستەخانەوە چارەسەری بریندارەکاننی کردبوو.

لەیەکەم هەڵمەتی گرتن دا لەسەرشەقام باوکم و حەمەقادری چایچی خاڵی ماجدو نائب گیرابوون بەلێدان و سوکایەتی پێکردن بەرەو بەندیخانەی سەرەوەیان بردبوون. لەوێ هەموو لەش و دەم و چاویان بریندار کردبوون و لەژوورێکی تاکەکەسیدا دایان نابوون کە نەئەبوایە کەس بچێت بەلایاندا، بەڵام معزز خۆی گەیاندبوو بەو دەنگ و باس و سڵاوی باوکمی بۆ هێناین کە سوور بوو لەسەر بەرگری و دژایەتی میری و خۆبەدەستەوە نەدانی ئێمە بەرامبەر بەربوونی ئەو ئێمە بچینە جێگای، هەر لەو هەڵوێستە ئازایانەی ئەوەوە بوو کە ماڵ و حاڵیان داگیرکردین و لەماڵی خۆمان دەریان کردین و دەست بەسەر خانوەکەماندا گیراو کرا بەمەخفەری پۆلیسی سەرشەقام و جێگەی لێدان و ئازاردانی برادەران و تێکۆشەران، ئێمەش هەر لە گەڕەکی سەرشەقام خزمان خانویەکی بچوکیان بەکرێدایینێ و تیا ژیاین، کە تەنها دایکم و باوکم و خوشکەکانم لەوێ بوون، ئێمەش هەموومان گیرابووین یا دەربەدەر نەمانئەتوانی بچینەوە ماڵێ و مامم و کوڕەکانی سەرپەرشتیان ئەکردن ئەوانیش بەتەمەن منداڵ بوون شەو لایان ئەمانەوە، باوکم و حەمەقادری چایچی یەکی شەش مانگ حوکم دران، لەبەر ئەوەی شایەتیان لەسەردان کە گوایە لەپێش خۆپیشاندانەکەوە هوتافیانکێشاوەوخەلکەکەیان هانداوەکەروبەرویپۆلیس ومیری ببنەوەودەست بەسەر چەکەکانیان

دابگرن.هەرچەندە باوکم وحەمەقادر لەو تەمەنەدا نەبوون ومەحکەمەش باوەڕی بەو شاهیدانە نەبوو، بەلاّم زەبرو زەنگی پۆلیس و تحقیقات تەنگی بەحاکم هەڵچنی بۆحوکم دان . دوای تەمیز کردنەوە بۆیان دەرکەوت هەموو شاهیدەکان هەڵبەستراون و درۆیان کردوەو تێکەڵ و پێکەڵیەکی تەواوی تیادا هەیە، بۆیە حوکمەکەیان کرایە ٢ مانگ و بڕیاری بەربونیان درا، چونکە لەڕۆژی گرتنەکەیانەوە دوو مانگ بەندیان تەواوکردبوو.

ئێمە هەر لە ماڵی حەمە سەعید ماینەوە چونکە بە هیچ جۆرێك دوای بلاّوکردنەوەی خۆپیشاندانەکە نەمان ئەتوانی بێینە دەرەوە بۆیە پەیوەندیمان لەگەڵ برادەران دا داپچرابوو، بەلاّم بەڕاستی چاك میوانداریان ئەکردین، هەموو نیوەڕۆیەك لە ماڵی حەمە کاکەوە خواردنی تایبەتی دروست ئەکرا. ڕۆژێ گیپەو ڕۆژێ شفتەی مۆخ لەگەڵ برنج دا، ئێوارانیش گۆشتی برژاوو میوەی هەمەڕەنگە، بەغیلیمان بە خۆمان ئەبرد، شەوو ڕۆژ خەریکی دەمەتەقێ و لێکۆڵینەوەو کتێب خوێندنەوە بووین، بەتایبەتی بەیانیان هەرەیکەمان خۆی ئامادەئەکرد بچینە دەرەوەو ئیش راپەڕێنین، یا بەلای کەمەوە چەند برادەرێ ببینێ بۆی هەڵنەئەسوڕا، بۆیە ئەبووە مشت و مڕو بەیەکداهاتن و پیلان دانان بۆ سازکردنی کارەکانمان، کە دواتر توانیمان پەیوەندی بەهەندێ برادەرەوە بکەین و بچین بۆلای یەکتر، جا بۆ پێکەنین و تەواوکردنی ڕۆژو حەسانەوەمان کاك هۆگر ئەکەوتە قسەی خۆش و هەڵبەست خوێندنەوەو باس کردنی شتی زۆر سەیرو ئەنتیکە، یەکێ لەو بۆچوونانەی کە هەردەم ئەیوتەوە کە ئێمە وە هەر لە نێوان خۆمان دا خەریکی چپەچپین بەرامبەر یەکتر زۆرزانین، بەلاّم رووی کۆمەلاّیەتیمان نی‌یەو نازانین بچین بۆ پرسەیەك، لەسیاسەت بەولاوە لەهەمووشت دورین و نازانین لەگەڵ خەڵکیدا شتێ باس بکەین، ئەوە ئەدەب و هونەرو وەرزش و دانیشتنی چایخانەو هاتوچۆکردنی دراوسێ و بەستنی پەیوەندی لەگەڵیان دا هەرباسی مەکە، ئەمانەی چەندجارێك ئەوتەوەو ئەیویست بڵێ ئێمە گۆشەگیرین و دوورین لەجەماوەرو ئەگەر ئەو بیروباوەڕو

ڕەوشتە بەرزەمان نەبوایە لەهەموو شاردا لەچەند کەسێك بەولاوە کەس نەیئەناسین، هەندیٚ جار گوێمان لیٚ ئەگرت و هەندیٚ جاریش ئەبووە پێکەنین و دەنگەدەنگ چونکە خۆی لەهەمووومان زیاتر جێگەی ڕەخنەو سەرزەنشت بوو، زۆرکەڕەتیش سەرمان ئەکردە سەر هاوڕیٚ نائب و پەستمان ئەکرد، هەڵئەچوو ئەکەوتە هێرش بردنە سەرمان و زۆرجار نیازی بەجیٚهێشتنی ماڵەکەی ئەبوو، بەڵام بۆی نەئەکراو ئەبوایە هەر لەگەڵمان بوایە، یەکەم بەیانی زۆر سەرمان کردە سەری چونکە کەسمان دەست نەئەکەوت بچێتە دەرەوە برادەران ببینیٚ، دەستمان ئەخستە سەر هەر برادەرێك کۆمەڵێك تەگەرە بەرەو ڕوومان ئەبۆوە کە ڕیٚی چونە دەرەوەی لیٚئەگرتین، حەمەکاکە ڕووی تیٚکردین و ووتی پێشنیارێکی باشم هەیە ئەگەر بڕیاری لەسەر بدەن! هەموو واقمان وڕما و ڕوومان تیٚکرد و گوێمان بۆ شل کرد چونکە ئەمانزانی شتێکی سەیر ئەڵیٚ، پێشنیاری کرد خول خولۆکەیەکی منالان بێنین و بیدەینە دەست هاوڕیٚ نائب و کراسێکی درێژ لەبەر بکات و جونیٚ کلاش بکات بەسەر پێوەو بەسەری ڕووت بچێتە دەرەوەو خول خولۆکەکە پالٚ پێوە بنیٚ و دەست بکات بەفیکەلێدان و بەناو پۆلیسەکاندا بڕوات کەس لیٚی ناپرسێت وا ئەزانن منالٚ و عەرەبانە لیٚئەخوڕیٚ. بەڕاستی هاوڕیٚ نائب هەرچەند زۆر لە ئێمە منالٚ تربوو، بەلام لەگەلٚ ئەوەشدا لەش ولارێکی لاوازو بچوکی هەبووکە کەس لەتەمەنی نەگەیشت و هەموو پێشنیارەکەمان بەدلٚ بوو، جا وەرە سەیری توڕەبوون و هەڵچوونی هاوڕیٚ نائب بکە، کەوتە هێرش بردن بۆسەر هەموومان و لەگەلٚ حەمەکاکەدا خۆی ئامادەکرد جێمان بهێڵیٚ بەلام بۆی نەکرا، دوایی توانیمان دلٚی بدەینەوەو داوای لێبوردنی لیٚبکەین، پاشان خۆشی دەستی‌کرد بەپێکەنین و ووتی بەڕاستی باشی بۆچوون ئەم لەش ولارەی من هەر بۆ ئەوە باشە، ئەمە زیاتر هاوڕیٚ نائبی بەرزکردەوە لامان، هەرچەندە هاوڕیٚیەکی ئازاو ڕۆح سووك و خۆشەویستمان بوو، دوای ڕۆژێك توانیمان پەیوەندی لەگەلٚ فؤاد مجید و کمال مصطفی‌دا ببەستینەوە بەهۆی مالٚی ئەورەحمانی

صالحی خلەو خوشکەکەیەوە کە پەیوەندیمان هەبوو لەگەڵ هاوڕێ عیمان خۆشناوو عمر دیلان داو هەموولایەك بەتەواوی یەکمان ئەگرتەوە. هەر لەورۆژانەدا هەندێ هاوڕێمان لەنزیك تانجەرۆ جێگیر بوون و چەند پارچەیەك چەکیان لاهەبوو وەکو ئەحمەدی مارف و کەریم پاڵەوان و رەشەی ئەحەشانەو عەزیزی برام و هەندێکی کە کە ئەبوایە هەمیشە پەیوەندیمان پێوە بکەن. ئێمە باش خۆمان ڕێك خستبوو لەگەڵیان و بەڕێك وپێکی ئیشەکانمان ئەرۆیشت بەرێوە لەگەڵیان دا، بەڵام بۆ هەندێ کاری رۆژانەی خۆیان برادەرێکی لاوی رۆح سوکیان لەلابوو ناوی سەیدگوڵ بوو بەراست و چەپ دا هەڵیان ئەسوڕاند، ئەویش لەبەر ئەوەی حزبی زۆر خۆش ئەویست هیچ لەهیلاکی و گرتن و لێدان پاکی نەبوو رۆژی ١٠ - ١٢ جار لەتانجەرۆوە، ئەیان ناردەوە بۆ سلێمانی و کەرەتی دا هەبوو بۆ قالبی سابوون یا چەند لەواشەیەك لە دوکانی احمدی مارف، بەراکردن ئەهاتەوە بۆ سلێمانی هەر لەبەر ئەوەی کاك احمد ئافەرینێکی بکات، ئەوانیش بۆ پێکەنینی خۆیان ئەم هەموو ئیشەیان بەسەردا ئەدا، وای لێهاتبوو بەراستی ئێمەی خستبووە هەڵوێستێکی سەیرەوە، بەکاك احمدمان ووت ئاگای لێی بێت و ئەوەندەی نەنێرێتە سەرمان با توشی شتێ نەبێت، ئەویش وەرامی داینەوە ووتی خۆی خۆشەو ئەیەوێت زوو ببێتە ئەندام، چونکە وایان خستبووە مێشکیەوە کە هەرچوون و گەڕانەوەیك مانگێ پێش ئەکەوێ، ئەم برادەرە ئەمەندە دڵسۆز بوو بەهەموو شتێکی کاك احمد باوەڕی ئەکرد، خۆشی نەختێ ئەیویست خۆی دەرخات و لای هاوڕێکانی خۆی بەشتێ بزانێ، جاری وا هەبوو ئەیان کردە مەرج بەسەریەوە کە ئەبێت ئەو ئیشەی ئەیدەن بەسەریدا بەسەعاتێك یا کەمتر جێبەجێی بکات، جا وەرە سەیدگوڵ بە راکردن لەتانجەرۆوە بێتە سلێمانی بۆ ماڵی عەلی حەباوو کەسی لێنەبێت، بچێت بۆ ماڵی فؤاد مجید، هەروەها خۆت بگەییەنیتە لای ئێمە، کاتێ گەیشتە لامان هەر ئەوەندەبووگیانی دەرچی لەهیلاکیدا ووتمان بۆ هاتووی، ووتی نەختێ کاغەزو قەڵەمم ئەوێ بۆ هاوڕێیان بەراستی ئێمە زۆر توڕەبووین و

نەمانهشێت بگەڕێتەوە لایان، لەم جۆرە برادەرەمان زۆر هەبوو ئەوەندەی نەختێ لەبڕیاری حزب و برادەران دەرنەئەچوون هەرچەندیش گیانی خۆیانیان لەسەردانایە.

## گۆڕانکارییەکی گەورە

دوای ئەو هەموو گێرەوکێشەیەو کوشتن و گرتن و راونان و ترساندنی خەڵکی و ساختەکارییەکی زۆر لەهەڵبژاردن داو دەرچوونی هەموو نوێنەرەکانی میری و بەدەست هێنانی سەرکەوتنی گەورەیان لەلایەك و لەلایەکی کەوە بەهێزبوونی یەکگرتنی هێزەکانی جوڵانەوەی نیشتمانی لەسەرانسەری هەموو عێراق دا کەشێکی بێدەنگ و لەسەرخۆی بۆ نیمچە دیموکراتیەك رەخسان و ئێمەش پشوویەکماندا و کەوتینە رێکخستنی خۆمان و وردەوردە بەهەندێ جوڵانەوە هەستاین، وەکو پێك هێنانی سەیرانی بچوك بچوك و گرتنی چەند کۆبونەوەیەك بۆ قوتابیان و دانانی هەندێ لیژانی هونەری و وەرزشی و دەرکردنی گۆڤاری دیوار لە قوتابخانەکانداو نوسینی ووتارو هۆنراوە بەناوی ئاشکرای برادەرانەوە، کە دەورێکی باشی هەبوو لە کۆکردنەوەی رێك وپێکیەکانمان، هەر لەو کاتەشدا توانرا گەورەترین شانۆگەری پێشکەش بکەین لەقوتابخانەی ئێواران و لیژنەیەکی تایبەتی و بێلایەنی لە قوتابیان و مامۆستایان بۆ دروست بکەین کە کاك عەلی ساماغا سەرۆکایەتی ئەکرد لەگەڵ مامۆستا شەوکەت کە مامۆستایەکی نیشتمان پەروەرو خۆشەویستی قوتابیان بوو، بەهەموو جۆرێ پشتگیری ئێمەی ئەکردو بەئاشکرا رای ئەگەیاندو ئەیووت کە یەکێکە لە ئێمە و زیاتر لەبەرامبەری مدیری قوتابخانەکە- معروف دەلی- ئەوەستا و ئەیووت من یەکێتی قوتابیانم لەپشتە، لەگەڵ هەندێ برادەری خۆمان کە رووی ئاشکرای یەکێتی بوون و لەلایەن برادەرانی پارتیەوە عەبدولی سوران ئەندامی لیژنەکەبوو، ئەم کەشە چەند مانگێکی دەوام کرد تا سەرلەنوێ میری و بەڕێوەبەری قوتابخانەکان دەستیان کردەوە بەهێرش بردنە سەرمان و

تەنگ پێهەڵچنینیمان، بەتەواوەتی بەرەنگاری یەکتربوینەوە، لەسەر موچەی ماموستایانو مانگانەی قوتابییان کەئەیاندا بە قوتابخانە (چونکە بەپارەی خوٚمان ئەمان خوێند) کێشەیەکی گەورە دروست بوو لەسەر ئەوەی ئەیانویست هەندێ قوتابی لە قوتابخانە دوور بخەنەوە، ئێمەش بەرگریمان لێئەکردنو هەندێ ماموٚستاش پشتگیری‌یان ئەکردین، بڕیاری مانگرتنمان دا بوٚ کاتێکی کەم، ئەکرەمی محمودی صالحی رەشەو حسین شەشوٚیی‌مان نارده لای متصرف (عمر علی) تا دەنگی ئێمەی پێبگەیەنیٚو بەڵام زوٚر بە توندی وەرامی دابونەوە کە سورن لەسەر بەرەنگاریمان، ئەوەبوو سەرلەنوێ مانگرتن دەستی پێکردەوە هەموو قوتابخانەکانی گرتەوە، میریش زوٚر شێتانە بەرەنگارمان بوٚوەو کەوتە گرتنو راونانی قوتابییانو داخستنی قوتابخانەی ئێوارانو ناردنی قوتابییان بوٚ تجنیدو گرتنیان بەسەربازو رەوانەکردنیان بوٚ بصرە (شعیبە) کە ئەمجارەش گورزێکی کوشندەبوو درا لە تێکوٚشانی قوتابییان بەگشتی لەسلێمانی.

## گرتنمان و رەوانەکردنمان بوٚ شعیبە

سالی ١٩٥٤ قوتابییانی سلێمانی بەیەکسانیو بێ رەچاوکردنی پەیوەندی حزبایەتی گەوتنە بەر جموجوٚڵێکی ئاشکراو سەرکەوتوو بوٚ هێنانەدی مافە رەواکانیانو بەستنی تێکوٚشانیان بەکێشەی رەوای میللەتەکەیانەوە بەگشتی، کە توانرا مانگرتنێکی سەرانسەری قوتابییان پێك بهێنرێت، کە رژێمی بەتەواوەتی شلەژانو کەوتە بەربەست کردنی، یەکێ لەو بەربەرەکانیە توندو تیژەی بەرەو رووی قوتابییان بوٚوە، داخستنی قوتابخانەی شەو بوو، کە جێگەو مەڵبەندی بەربلاوی هەموولایەك بوو، کە رێكو پێکیەکی توندوتوٚڵی تیا بنیات نرابوو.

داخستنی قوتابخانەی شەو بووە هوٚی رێگە پاك کردنەوە بوٚ رژێم کە

قوتابیانی تێكۆشەر راپێچی سەربازی بكات، لەهەموو لایەك بۆ ئەم مەبەستە یەك دوو معسكر كرایەوە بەپێ‌ی جێگاو پلەی خوێندنی قوتابیان لەهەموو عێراق دا كە سلێمانیشی گرتبۆوە، قوتابیانی دانشگاكان ئەنێردران بۆ معسكر سكرین‌و هەندێكیش بۆ معسكرێكی كە لە بەغدا، قوتابیانی ناوەندی‌و دواناوەندی‌و پەیمانگاكان بۆ معسكری قوتابیان ژمارە (٨) لە شعیبە كە لە بصرەوە چەند كیلۆمەترێ دوور بوو، كاتی خۆی معسكری ئینگلیزەكان بوو.

ئێمە قوتابیانی سلێمانی قوتابخانەی شەو یەكەم پۆستە بووین، دوای گرتنمان‌و ناردنی ناوەكانمان بۆ تجنید بەهۆی پۆلیس‌و تحقیقاتی جنائیەوە راپێچی تجنیدی سلێمانی كراین‌و لیژنەی پزیشكیمان بۆ پێك هات. رۆژی ١٩٥٤/١٠/٢٥ من‌و جەزای میرزا حسین‌و عثمان دەروێش بكرو حسین حاجی امین‌و صلاح شێخ محەمەدو حسین مەلا حكیم‌و خەسرەو رۆستەم‌و یەك دوویەكی‌كە بەرەو رووی لیژنەی پزیشكی بوینەوە لە تەجنید بەپێچەوانەی هەموو نەریتێكی سەربازیەوە ئێمەیان لەژورێكدا بەند كردو نەیانهێشت كەس ببینین‌و لە ژوورەكە بێینە دەرەوەو نانیان لێ‌قەدەغە كردین، زۆر توندوتیژی‌یان بەرامبەرمان نواند. یەك یەك ئەیانبردینە بەردەم لیژنەی پزیشكی‌و نەیانهێشت هیچ بەڵگەیەك بخەینە بەرچاو كە دوانمان معینی دایك‌و باوكیان بوون جەزای میرزا حسین لەدورەی نائب ضابطی وەرگرابوو هەموو ئەوراقەكانی بەدەستەوە بوو لە فایلێكی گەورەدا لەدەستیان سەندو هیچ بایەخیان پێ‌نەدا. دكتۆر كمال ناجی كە پیاوێكی باش‌و رەوشت بەرزو بەهەڵوێست بوو هەموومانی ئەناسی بۆیە تارادەیەك یارمەتی ئەداین، هەرچەندە دكتۆری ئەفسەر عادل عەسكەریش چاودێری ئەكردو ئاگای لە هەڵس‌و كەوتی بوو، یەك بە یەك فحص كراین‌و هەندێكمان (سلاح سن) دەرچووین كە بەكەڵكی سەربازی نایەین‌و نابێ ببینە سەرباز، یا بۆ چەند ساڵێك وازمان لێبێنن‌و دوامان بخەن، بەڵام دەركەوت ئەوانیش نەیانئەزانی ئەبێ وەك یەك سەیر بكرێین‌و بڕیاری سەرەوەی لەسەرە، مدیری تجنید عقید امین بوو زۆر دەورێكی خراپی ئەبینی

بەرامبەرمان‌و هێرشی ئەبردە سەرمان‌و سوكایەتی پێ‌ئەكردین، بۆمان دەرنەكەوت خراپەی خۆی بوو یا لەترسی تحقیقاتی جنائی بوو ئەو دەورە پیسەی ئەبینی، من چوومە بەردەمی دكتۆر كەمال‌و عادل عەسكەر باش ئەیان ناسیم‌و ئەیانویست هەندێ یارمەتیم بدەن، هەردوو دەستم خستە سەرمێزەكەی ئانیشكم بۆ خواركردەوەو ووتم هەردوو دەستم شكاوە، كە بینی سەیری لێهات چونكە ئانیشكم بەچەشنێ ئەم دیو ئەودیو پێكرد جێگەی سەرسوڕمان بوو، هەرچەندە ووتی قادر هەردوو دەستت نەشكاوە بەڵام ئەبێ بۆت بنووسین هەردوو دەستت شكاوەو ناتوانی سەربازی بكەیت، ئەوە چاویشت یەكێكیان نابینێ بەپێی یاسا ئەبێ بچیتەماڵەوە، ئەوەبوو لەسەر دەفتەرەكەم ئەمانەی هەموو تۆمار كرد.برادەرەكانیشم زوربەیان بەم چەشنە بوون، ئەو رۆژە ئیشمان تەواو بوو، ئەفسەری تجنید كە محمد علی اربیلی بوو تازە هاتبوە سلێمانی، دەفتەرەكانی هەموو بەكۆمەڵ بۆ ئیمزا كردین‌و رەوانەی لای پاسەوانەكان كراین بۆ ئەوەی بەرەو بصرەمان بەرن، ئەفسەرەكە رووی كردە جەزای میرزا حسین ووتی سجلەكە هەڵگرە، ئەویش وەرامی دایەوە ووتی خزمەتكاری باوكت نیم، ئەویش گرژبوو بە تورەیی‌یەوە ووتی بەخوا سەربازی چاكن، هێشتا دنیای سەربازیتان نەدیوە باش ئاقڵتان ئەكەن، جەزاش ووتی چی‌ئەكەن بیكەن، ئەو رۆژە فریای هیچ نەكەوتین، بۆ شەو لای پاسەوانەكان ماینەوە، سەرۆكەكەیان نائب عریف خلیفە بوو شارەزوری بوو پیاوێكی باش‌و قسە خۆش بوو، هەندێكیش ساویلكەو گێژ بوو، كوڕەكەی (علی) لەگەڵماندا قوتابی بوو سەر بە ئێمەش بوو، هەندێ یارمەتی داین‌و سەربازێكی ناردە ماڵەكانمان پارەو جلی بۆ هێناین‌و بە كەس‌وكارمانی راگەیاند كە رەوانەی بصرە ئەكرێین، بۆیە هەر بەیانی زوو گەیشتنە لامان، لەبەرچاوی ئەوان سواری لۆری عەسكەریان كردین لەگەڵ چەند سەربازێك داو رەوانەی كەركوك كراین، لەوێشەوە بۆ ئێوارە بردیانینە ئێستگەی شەمەندەفەری بەغداو جێگەیان بۆ دەست نیشان كردین لای كۆمەڵێ لە هونەرمەندانی كەركوكەوە كە

ئەچوون بۆ بەغدا، بەدرێژی ڕێگە کردیانە گۆرانی و هەڵپەڕکێ و زوربەی گۆرانیەکانیان تورکی و عەرەبی بوو، بەیانی زوو گەیشتینە بەغداو ئەوەندەیان نەهێشتینەوە، بۆ ئێوارە گەیاندینیانە ئێستگەی شەمەندەفەری بصرەو لە گۆشەی فارغۆنێکدا دانراین، بۆ ئەوەی کەس بە سەرماندا نەیەو نەچێ جێگەی خۆمان گرت لەگەڵ ئەو سەربازانەی کە لە بەغدا درابووینە دەستیان، ئەم سەربازانە لەگەڵماندا باش ئەجولانەوەو تا ڕادەیەك ڕێزیان لێ ئەگرتین، هەرچەندە ئەمەش ئازایەتی خۆمانی تێدا هەبوو چونکە ئێمە بەنەرمی لەگەڵیاندا ئوجولاینەوەو هەرچیەکمان بخواردایە بۆ ئەوانیش حەڵاڵ بوو، بێجگە لەپارەی نەقدی کە کردمانە دەستیانەوە، هەرچەندە هەموومانیان خستبووە حەوانەوەیەکی باشەوە، لەگەڵ ئەوەشدا حسین حاجی ئەمین زۆر کەڵکی لەو بارە بینی و کەوتبووە هەوای خۆیەوە، هەرئەوەندەمان ئەزانی وون ئەبوو ئەرۆیشت بۆ گەڕان و چاولەوەڕاندن و چاوبڕکێ و خۆی پێ نەئەگیرا دووربێت لەئافرەت و جلی ئاڵ و والاوە، هەردەم ئەوەی ئەدایەوە بەچاومان دا کە کاتی خۆی لەسەر خواردنەوەی قاپێ بیرە لەماڵەکەی خۆیدا تجمید کراوەو دورخراوەتەوە، ئێستاش بەهەوەسی خۆی ئەگەڕێ و کەسیش بۆی نی یە پێی بڵێ سەروی چاوت برۆیە، کاك صلاحی شێخ محەمەدیش لەو کەمتر نەبوو بەلام ئەو نەختێ شەرمن و لەسەرخۆتر بوو، لەهەموو وەستانی شەمەندەفەرەکەدا کچانی رۆبە (ماستاو) فرۆشیان تێ ئەئالاندین و رۆبەو ماست و میوەیان لەپەنجەرەکانەوە ئەدایە دەستمان و ئەوان پارەیان بۆ وەرئەگرتن، هەربەو چەند چرکەیە کاك حسین ناوەکانیان فێربوو، ئەوانیش بەچەشنێ هاواریان لە حسین ئەکرد هەروەکو چەندساڵێك بێت یەکتر بناسن، بێجگە لەوەی کە کاك حسین سعدونی چافرۆشی لێ تورەکردین بە بەکارهێنانی کاسەی ئاوی چایەکەی بۆ دەموچاو شتن و خۆشی لێ گێل کردو لەسەر پەیژەی شەمەندەفەرەکەش خۆی لێ کردە نوستوو، ئەویش بۆ ئێستگەی داهاتوو ئاوی بۆ پەیدا نەکرا لەسایەی سەری حسینەوە چای خەست و تاڵی داینێ.

بەو شەوە دووردودرێژە بەچەشنێ خۆمان خەریك كردبوو، وامان ئەزانی ئەچین بۆ سەیرانو دیدەنی بصرە، بۆیە خەو لەچاومان نەئەكەوت لەبەر شت خواردنو قسەی خۆشو بەتامی كاك جەزای میرزا حسین كە بوو بووە سەرپشكی هەمووان لەگێڕانەوەی بەسەرهاتی هەریەكەمانو هەڵوێستە سەیرەكانی برادەرانو مامۆستاكانمان، بەتایبەتی لەوانە هەمیشە باسی مامۆستا شەوكەت ئەكرا وەك ئەندامێكی یەكێتی قوتابیان رەفتاری ئەكرد، هەردەم ئەیووت من بە پشتی یەكێتی هەموو پیاوەكانی رژێم ئەبەزێنم، هەموو كاتێ نمرەی باشی ئەدا بەبرادەرەكانمان، زۆرجاریش دەرسەكەی ئەكردە باسی سیاسەتو وتووێژ لەسەری، هەر ئەو شەوە بەدوورو درێژی باسی مەجید شەیتان كراو یادمان كردەوە كە چۆن لەكاتی تاقی كردنەوەدا مامۆستا پرسیاری لێكرد (غاری بالدی) كێیە نەیزانی، عەبدولی سوران لەتەنیشتیەوە بوو هانای بۆ برد پێی بڵێتەوە، بەچرپە شتێكی دا بەگوێیدا، ئەویش كردیە هاوار هاوار ووتی ئەیزانم نەختێ رێگام بدە بیرێكی لێبكەمەوە، غاری بالدی اكبر وحش فی العالم، مامۆستا هیچی پێنەكرا كردیە پێكەنینو قوتابیان لەگەڵیدا بەڵام نمرەی باشی بۆ دانا، كاك مەجید هەر زوو زانی عبدول تەشقەڵەی پێكردووە تۆزێ تورەبوو بەڵام ئەوەندەی نەخایاند، كاك مجید لەگەڵ قسە خۆشەكانیو دەوامی قوتابخانە شیدا (برین پێچیش) بوو شرینقەی بەخۆرایی لەهەمووان ئەداو دەرمانی بۆ پەیدائەكردینو بەتەنگمانەوە ئەهات. هەر لەبیرهاتنەوەی یادگارەكانمان دا كاك جەزا ئەوەشی بە بیرهانینەوە كە شەوی تاقیكردنەوەی جەبر مجید هیچی نەئەزانی، هەر ئەملاو ئەولای ئەكرد یەكێك نەبوو شتێكی پێبڵێتەوە، لەبەر پەنجەرەكەوە عەبدولی سوران بەدی ئەكاتو هاواری بۆ ئەهێنێو بەئیشارەت ئەڵێ هیچ نازانم فریام كەوە یارمەتیم بدە، عەبدولو چەند برادەرێك هاتنو پەڕەیەكیان بۆ رەش كردەوە بە مجید شەیتان + مجید شەیتان = بە ٢ مجید شەیتان. لەگەڵ زۆر شتی تر كە لە نوسینی جەبر بكات، بەرێكوپێكی ناوی مجیدو باوكیو

پۆلەکەیان لەسەر نوسیو بۆیان هەڵداو پێیان ووت بەپەلە وەرەقەکەی خۆت هەڵگرەو ئەمە بدەرە دەست مامۆستا هەموو وەرامەکانی تێدایە، کاك مجید چی پێ ووترا بوو بە پەلە جێبەجێی ئەکاتو بەدڵێکی خۆشەوە دێتە دەرێو زۆر سوپاسی هەموویان ئەکاو سەرو چایان بۆ ئەکڕێ لەپاداشتی ئەو یارمەتیە، بەڵام شەوی دوایی کە مامۆستای جەبر مامۆستا (الفرید) هاتە سەرمانو ئەنجامی تاقیکردنەوەکەی بۆ هێنایەنەوە، ناوی زوربەی قوتابیانی خوێندەوە کە یەکی چەندیان وەرگرتووە، تاسەرە هاتەسەر مجید ووتی ٨٥، کاك مجیدیش کەوتە هەوای خۆیو هاواری کرد مامۆستا وام ئەناسی کە هەردەم پێم ئەڵێیت تەمەڵ، ئەو کاتە چەند قوتابییەك مابوو ناویان بخوێنرێتەوە مامۆستا کەوتە خوێندنەوەی وەرامەکانی مجید، بەجارێ پۆلەکە شڵەژاو بووە هەرایەکی وا کە کەس بەسەر کەسەوە نەبوو، مجیدی داماو کەوتە جنێودانو شوشەی پەنجەرەکەی شکاندو یەك دوو کورسی دا بەسەریەکاو رایکردە دەرێو تا چەند رۆژێ نەمان دیەوە، ئەم کاك مجیدە لەگەڵ ئەم هەموو شتانەدا کە تورە ئەبوو، هەر زوو ئەمانهێنایەوە سەرخۆ، چونکە برادەرێکی ئێمە بوو، بەپیر هەموو گیروگرفتێکی برادەرانەوە ئەهات، هەرچەندەش نیوەنیوەچڵ کێشەکەیانی چارەسەربکردایە، پیاوێکی رەوشت بەرزو خۆشەویست بوو، لەبەر خۆشەویستی ئەم شتانەی بۆ دروست ئەبوو، بەڵام ئەوەندە دڵ سافو ساویلکە بوو، دوای چرکەیەك هیچی لەدڵدا نەئەما، جا کاك جەزا بەچەشنێ باسی ئەکردو دەرمانی پێوە ئەکرد هەرکەسێ ئاگای لێبوایەو گوێبیستی بوایە زۆر تامەزۆری بینینی کاك مجیدی ئەبوو، ئەو شەوەمان بەم چەشنە بردەسەر بەگێڕانەوەی هەزارو یەك پەند لەسەر ئەم شتانە تا گەیانمانە بەیانی زوو گەیشتینە بصره.

## دابەزینمان لە بصرە

بەگەیشتنمان بۆ بصرە یەکسەر خۆمان گەیاندە باشترین چێشتخانەو تامەزۆری خواردنێکی باش بووین، هەر لە یەکەم دانیشتنمان دا هاتن بەلامانەوە، کە زانییان کوردین‌و خەڵکی سلێمانین زۆر ڕێزیان لێ‌گرتین، ئێمەش باشترین خواردنمان بانگ کردو خۆمان تێرکردو هەستاین هەندێ بەناو شاردا گەڕاین بەڵام پەلەمان بوو بەرەو معسکر بڕۆین‌و گەڕانی زۆرمان بۆ رۆژانی دوایی دانا، وامان ئەزانی لە معسکر بەدەهۆڵ‌و زوڕناوە دێن بەپیرمانەوەو ئەگەڕێینەوە ئوتێل وەکو هەموو سەربازێکی کە، ململانێ کەوتە بەینمانەوە کە لە چ ئوتێلێ دابەزین‌و کێ لەگەڵ کێدا بێت لە ژوورێکدا، لەو کاتە کەمەی لەبصرەدا ماینەوە هەردەم چاومان ئەگێڕا بۆ کڕینی کەل‌وپەل لەگەڵ خۆمان دا بۆ معسکری بەرینەوە، بڕیارمان داو ئوتومبیلێکمان گرت کە بمانبات بۆ شعیبەو معسکر رقم (٨)، بەقسەی خۆش‌و دەمەتەقێ ئەوەندەی نەبرد لەبەردەرگای سەرەکی ئەفسەرەکاندا دابەزین‌و قاپیەوانەکە وەری‌گرتین‌و پاسەوانەکانمان بەجێ‌یان هێشتین، چەند چرکەیەکی پێ‌چوو کابرایەکی ورگ زلی تێك سمڕاوی رەش بە بۆڵەبۆڵ‌و دەنگەدەنگ هاتە لامان‌و بەخێرهاتنێکی سەیرو بێ‌لەزەتی کردین‌و کەوتە هێرش بردنە سەرمان‌و هاواری کرد یەك یەك ریزبین‌و ناوی نوسین‌و سەربازێکی بانگ کردو ووتی ئەمانە بەرە لای جابر بڵێ عریف رحیم ناردونی سەریان بتاشێ، کابرای سەرباز هەریەکە پاڵێکی پێوەناین‌و داینەپێش خۆی بۆ بەر ژوورێك کە تەنها کورسیەکی بچوکی تیادانرابوو لەگەڵ ئامێری سەرتاشین لەسەر بلۆکێ، گوایە ئەمە سەرتاشخانەیەو یەك یەك چووینە بەردەستی لەسەر کورسیەکەو سەری هەموومانی بەهەوەسی خۆی سفرکرد.

جا چونکە یەکەم جارمان بوو شتێکی سەیر دەرچوین، سەیری یەکترمان ئەکرد پێکەنینمان بەیەك ئەهات، کوڕە سەرتاشەکە زۆر بەزەیی پێماندا هاتەوەو هەندێ قسەی بەچپە بۆ کردین وادیار بوو زۆر ئەترسا. پێ‌ی

ووتین ئێوە سەرباز نین و لێرە چونە دەرەوەتان نی یەو ئێستا ئەتانبەنە ناو قاوشێکەوە چل تا پەنجا کەسی تیایەو هەموو وەك ئێوە قوتابین و کراون بەسەرباز. ئەم شتانە بۆ ئێمە هەندێ باش بوو هەل ومەرجەکە تێ گەیشتین و خستینیە هەلوێستێکەوە کە ئاگاداری خۆمان بین و نەختێ لەسەرخۆ بین. راپێچی لای عەریف رحیم کراینەوە نائب عریفێکی لەگەلدا بوو بەناوی مجیدەوە کە پیاوێکی خراپ نەبوو نەختێ بەئەخلاق بوو نەیئەویست خراپەمان لەگەل بکات و شتمان بۆ دروست بکات بەخۆڕایی. هەرچی جل و بەرگمان هەبوو لێمان وەرگیراو فڕێیان دایە ژوورێکەوە وەکو شەلاقەی بال شکاو بەتوێی فانیلەو دەرپێیەکەوە بەپێی رووتی سەعاتێ ماینەوە. تا هەریەکەمان پانتۆلێك و کراسێکی سەربازی و جۆتێ قۆندەرەو جۆتێ گۆرەویمان خرایە بەردەم بەپێی قیاس لەگەل دوو پەتو، جلەکانی حسین حاجی امین کە لەش ولارێکی زۆر بچوکی هەبوو دووکەسی تیاجێگەئەبۆوە، ئەوەی عثمان بکرو حسینی مەلا حەکیم ئەوەندە بچوك بوون جێگای قاچێکیان نەئەبۆوە، هەرهەموومان شتەکانمان وەرگرت و بەپال پێوەنان بەرەو قاوشەکە براین کە دوو مەتر لە ژێر زەویەوە بوو. لەدەرگاکەوە بۆ ناوەوە سەرەوخوار رێگەیەکی ساف و لوس بووەکو بۆ خلیسکێنەی مندال دروست کرابێ. ئەمبەرو ئەوبەری بەپەنجەرەی گەورە گەورەی بەرز لەسەر زەویدا رێك خرابوو درێژی ١٨٠ مەترێ ئەبوو، پانییەکەشی خۆی ئەدا لە شەش مەترێك، لەمبەرو ئەوبەر سەربازەکان هەریەکە جێگەی خۆی لێ داخستبوو ناوەڕاستەکەی بۆ هاتوچۆ مابۆوە، دوو ژووری بچوك ئەمبەرو ئەوبەری قاوشەکەی کردبوو بەدوو بەشەوە کرابوە ئاودەست خانەو جێگەی ئاوو جل و قاپ و قاچاخ شتن، دوو کوپەی گەورە دانرابوو بۆ ئاوخواردنەوەو چەند دۆلکەیەکی فافۆنی لەسەر بوو بۆ ئاو خواردنەوەو دەست و دەم وچاو شتن و مەسینە پڕکردن، و ئەمە هەردەم توشی کێشەی ئەکدرین لەگەل زوربەی سەربازەکان کە ئاوەکەیان پیس ئەکرد، یا دۆلکەکەیان لەسەر زەوی فڕێ ئەدا، یا لەباتی ئەوەی مەسینەکە بێنن لەوێ

پڕی بکەن، دۆلکە ئاوەکەیان ئەبردە ئاودەست خانەکەو لەوێ بەبەتاڵی بەجێیان ئەهێشت. ئەمەش زوربەی برادەرانی عەرەب پیێ هەڵئەستان، هەرچەندە وەکو ئێمەش قوتابی بوون و لەسەر ئێمە ئەژمێرران.

ئێمە بەچوونە ژوورەوەمان بۆ ناو قاوشەکە، سڵاومان کردو بەخێرهاتنیان کردین و لەسوچێکەوە جێگەمان راخست و قرپوقەپ لێ ی دانیشتین، کەسمان نەئەناسی، ئەوانیش لێمان نزیک نەئەبوونەوە، چونکە وادیار بوو کارەکە وا ئەڕۆیشت، نەئەبوو کەس قسە لەگەڵ کەسدا بکات، عەریف رحیم ساتەناساتێ وەکو سەگ بە خۆی و چەند سەربازێکەوە ئەمسەرو ئەوسەری قاوشەکەی ئەگرت و بەهەڕەشەو گوڕەشەوە قسەی لەگەڵ ئەکردین، پێشەکی هەر چواپێنج کەس و بووینە گروپێک بۆ نان خواردن، هەر کە هاواریان ئەکرد خەفەر بێت ئێمە زوو یەکێکمان ئەنارد (قزعە)ی بۆ ئەهێنان ئەویش برنج و شلە بوو کرابوو بەسەریدا، هەرچۆنێک بوو ئەمانخوارد چونکە هەر ئەوە هەبوو، چا لەدۆلکەی فافۆن دا دابەش ئەکرا بەسەرماندا، هەرکەسە لەجێگەی خۆی لەسەتڵێکی گەورەدا، بۆ ئێوارەش بەهەمان جۆر خواردنمان بۆ ئەهات، چەند رۆژێ بەم چەشنە ماینەوە لەجێگەی خۆمان نەئەجولاین، تا رۆژێ ئەفسەرێ هات، ناوی (داود جنابی) بوو کۆمەڵی کردین و دەستی کرد بەقسە کردن و هەڕەشەوگوڕەشەو باسی توندو تیژی یاسای سەربازی، داوای لێکردین بەهیچ جۆرێ بەلای سیاسەت دا نەچین و مل کەچی یاسابین. هەر لەوکاتەشدا دابەشی کردین لەچەند کۆمەڵك دا کە پیێیان ئەوت (رهط) کە لە دە تا دوانزە سەرباز پێك ئەهات، کۆمەڵی ئێمە هەموو خەڵکی سلێمانی بووین بێجگە لەدوو برای عەرەب کە یەکێکیان ناوی حسین شعاع بوو کابرایەکی مۆن و تەمەڵ و پیس و پۆخڵ بوو هیچ ئیشێکی نەئەکردو هەردەم خۆی ئەدزیەوە لە ئیش و خۆی ئەکردە نوستو، خاکەنازەکەی دەستی ئەخستە ژێرسەری و خەوی لێ ئەکەوت، چونکە بەرۆژ کرێکاریان پیێ ئەکردین، هەموو کاتێ توشی کێشەی ئەکردین و زۆرجاریش ئەهات بەگژمان دا، لەبەر ئەوە

ئێمە نەختێ سەرمان ئەکرد بە سەریداو سەرزەنشتمان ئەکرد. عەبدولی سوران ناوی نابوو (كرك) واتە خاکەناز، خاکەنازەکەی دەستی، وای لێهاتبوو لەباتی ناوی خۆی بانگمان ئەکرد کەرەك بەگورجی وەرامی ئەدایەوەو ئەهات بەپیرمانەوەو تا بڵێیت گێلو ساویلکەش بوو هیچی لەسیاسەت نەئەزانی نازانم چۆنو بۆچی هێنابوویان بۆ لامان. هەر لەکۆمەڵەکەی ئێمەدا کوڕێکی کەی عەرەبی تیادا بوو ناوی محسن علیوی بوو زۆر بێدەنگو سەنگ بوو هەموو کارێکی بۆ ئەکردینو دڵنەوایی ئەکردین، لەسەر هیچ شتێ هەڵی نەئەدایە، هیچ پارەو یارمەتیەکی بۆ نەئەهات، ئێمە لای خۆمانەوە یارمەتیمان ئەداو بەتوندو تۆڵی خۆی بەحزبەوە گرێدابوو دەقاودەق هەموو بڕیارەکانی حزبی جێبەجێ ئەکرد بێ کەموکوڕی، ئەوەی هەبوو قینی لەبرادەرانی پارتی ئەبۆوەو ئەوانیش سەریان ئەکردە سەری، ئەم هەر ئەوەی ئەزانیو بەرەنگاریان ئەبۆوەو ئەیووت ئێوە بۆرجوازین ئەبێ لەناوببرێنو هەندێ تانەو نوتەکی تریشی لێئەدانو ئەبووە پێکەنینو دەست لەمل کردنی، گۆرانیە خۆشەکەی کە هەمیشە لەژێر لێوەوە بەدرێژایی کات ئەیوتەوەو دڵی پێخۆش ئەکرد ئەوەبوو (بحق فاء والهاء والدال نهدم هذه الأسوار) بەحەقی فەهد ئەم دیوارانە ئەروخێنین. هەرئەوەندەشی لێئەزانی، ئەمان ووت تەواوی کە ئەیوت هەرئەوەندەیەو بەس.

## تێکەڵاوبوونی هەموو لایەنەکان

لەگەڵ کۆی سەربازەکاندا چەند قوتابیەکی عەرەبی لێ بوو لە بیروباوەڕی نەتەوەییو بەعسییان هەبوو لە تەنیشت ئێمەوە ئەنوستن، یەکێکیان ناوی (عبدالخالق السامرائي) بوو دوایی بووە سەرۆکی حزبی بەعسو لە سێدارەیان دا لە ململانێی بەینی خۆیاندا، ئێمەی زۆر خۆش ئەویستو هەردەم باسی حزبو کێشەی کوردمان لەگەڵ یەکدی ئەکرد، بەڵام لە مانگێ زیاتر لامان نەمایەوە نەمانزانی چی لێهات، وا دیار بوو گوێزرابۆوە

بۆ معسکرێکی کە، دوانەکەی کە یەکێکیان ناوی زهیر قادری بوو خەڵکی بەغداو گەڕەکی (اعظمية) بوو کوڕێکی بەژن لاواز بوو هەمیشە نەخۆش بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵسوکەوتی باش بوو لەگەڵ ئێمەدا زۆر رێك بوو خۆشی ئەویستین، بیروباوەڕی پێشکەوتنخواز بوو لەگەڵ ئەوەی کە ئەندامێکی بەرزی بەعس بوو کوردی زۆر خۆش ئەویستو هەردەم ئەیویست زیاتر لێمان تێ بگات. کاتێ ئێمە لە سەربازی رامان کرد لە بەغدا بووین هەموو رۆژێ سەرمان لە ماڵەکەی ئەدا کە ئەو بە مۆڵەت لە ماڵ بوو، زۆرجار ئەیویست دەستی یارمەتیمان بۆ درێژ بکات، بەڵام ئێمە پێویستمان نەبوو، یا بڵێین نەمانویست هیچی لێ وەربگرین. دوای شۆڕشی چواردەی تەمموز یەکێ بوو لە سەرکردەکانی حزبی بەعس بەڵام هەڵوێستی باش بوو لەبەر ئەوە ئەوەندە دەستی نەئەڕۆیشت، سەردەمێکی زۆر محافظی کەرکوك بوو لەوێش ئەیانووت پیاوێکی باش بووە، هەرچەندە خۆم دوای دەرچوونم لە شعیبە ئەم کوڕەم نەبینیوەتەوە. سێیەمیان کوڕێکی رەشتاڵەی باڵا بچوکی گورج و گۆڵی زیرەك و رۆشنبیر بوو ناوی معاذ عبدالرحیم بوو زۆر هۆگری ئێمە بووبوو لێمان نزیك ئەکەوتەوە و هەردەم بە سەربەستی لە هەموو کێشەیەك ئەدواین و پرسیارمان ئاراستەی یەکتر ئەکرد بە تایبەتی لەگەڵ من و کاك حسن علی غالبدا زۆر رێك بوو هەمیشە بە یەکەوە کاتمان ئەبردە سەر، لە کێشەی کورد شارەزابوو، بۆچوونەکانی نوێخوازانە بوو، خۆی ئەوسا سەر بە نەتەوەییە عەرەبەکان بوو، من زۆر تووشی کێشە ئەبووم لەگەڵ برادەراندا لەسەر ئەوەی کە نابێت ئەمەندە لەگەڵیدا بگەڕێم و بدوێم و خۆمی پێوە خەریك بکەم، هەر ئەم کوڕە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموز بووە سەرنووسەری رۆژنامەی جمهوری و رێکخەری زۆربەی سەرکردەکانی حزبی بەعس، دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووز چەند کەرەتێك دیم ئێمەی هەر خۆش ئەویست و رێزی لێ ئەگرتین. لە کودەتا شومەکەی ١٩٦٣شدا لێپرسراوی شاری ناصریە ئەبێت زۆر لەو برادەرانەی حزبی شیوعی کە وەختی خۆی لە شعیبە بوون لەگەڵیدا رزگاریان ئەکات و

ڕەوانەی کوردستانیان ئەکاتەوە. سەردەمێکیش لەگەڵ حزبەکەیدا تێکچوو بوو بەڵام هەر بەڕێوەبەری گشتی وکالەتی انبائی عێراقی بوو چەندجارێکی کە بینیمەوەو وتووێژمان کرد هەروەکو جاران بۆچوونی خۆی بێ ترس دەرئەبڕی لە کێشەی کوردو ململانێی حزبەکەیان بە تایبەتی لەگەڵ حزبی شیوعیدا، ئەوەشی لەبیر نەئەگرد کە لە ماڵی حزبی شیوعیدا لەپێش چواردەی تەموزدا فێری چاپ و ئیشی ڕۆژنامەنووسی بووە.

## گۆڕانکاری لە معسکردا

کەش و هەوای معسکر گۆڕراو بەرەو باشی ڕۆیشت، هەندێ دەرفەتی باشمان بۆ هاتەدی ئێمەش نەختێ پشومان داو بیرمان لەوە کردەوە ئەبێت باشتر خۆمان ڕێك خەین چونکە بەو پەرت و بڵاویە ناچین بەڕێوە. بۆ ئەم مەبەستە هاتین پێشەکی چەند هاوڕێیەکی خۆمان دەست نیشان کردو کۆبوونەوەیەکمان ڕێك خست و بڕیاری دروست بوونی لیژنەی معسکرمان دا کە بریتی بووین لە خۆم و حسن علی غالب و عباس طبطبائی و هاوڕێیەکی کە بە ناوی طە، کە ئەبوایە بە شێوەیەکی تاکی هەر یەکەمان لەگەڵ برادەرانی کەدا پەیوەندی ببەستین، بێجگە لە پەیوەندی لەگەڵ حزبدا لە بصرە کە لە هەموو مسألەکان زیاتر بایەخمان پێ ئەدا.

بە هۆی برادەرێکی کارەباییەوە کە سەربازێکی معسکەرەکە بوو ئەهات سەرپەرشتی کارەبای لای ئێمەی ئەکرد لە کاتی ئیشدا خۆی نزیك خستەوە لێمان، ئەهات و چرپەیەکی ئەکردو قسەی بۆ فڕێ ئەدایین بە تایبەتی لە ئێمەی خەڵکی سلێمانی زۆر نزیك ئەبۆوە. گەیشتبووە ئەوەی شتێکمان لێ بزانێ بڕیاری ئەوە بدات قسە لەگەڵ کێدا بکات و چۆن خۆیمان پێ بناسێنێ، ڕۆژی نزیك کۆتایی هاتنی ئیشەکەی لە من و حافظ ڕەسەن نزیك بۆوەو دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵماندا و بەیانێکی داینێ و خۆی پێ ناساندین و سڵاوی هاوڕێیانی حزبی بەصرەی پێ گەیاندین، بەڵام وتی من ئەمە

سەربەخۆ ئەکەم‌و هێشتا حزبم ئاگادار نەکردووە تا رای ئێوە وەرئەگرم، جا حزب‌و لێپرسراوان وا دیار بوو نەیان ئەویست پەیوەندیمان لەگەڵ بکەن یا بۆیان نەئەکرا چونکە هەموو برادەرانی بصرەیان ئەناسی کە لەگەڵماندا بوون‌و هەریەکەیان لە رێکخراوێکی حزبی خۆیدا بوو، هەرچۆنێك بوو ئێمە ئەمەمان بە هەل زانی‌و بڕیارمان دا دوای چەند رۆژێك نامەیەك بدەین بەو برادەرەو ئیشی لەگەڵدا رێك بخەین‌و لە دەنگ‌و باس ئاگادارمان بکات، ئەم شتانەم لای یەك دوو برادەری لیژنە درکان‌و نامەکەمان نووسی‌و دامانە دەست برادەرەکە. لە نامەکەدا بە وردی دەربارەی معسکر دواین لە هەموو روویەکەوە، ژمارەی هاوڕێیان، کێشەی رێك‌و پێکی‌و ئیش‌و کاری داهاتوومان‌و پەیوەندیمان لەگەڵیاندا چەسپان. نامەکەمان ئیمزای هاوڕێ مجیدمان لێ دا کە لێپرسراوی معسکر بێت، ئامادەییمان نیشان دا کە نوێنەریان ببینین‌و سەردانیان بکەین کاتی دابەزینمان بۆ بصرە.

## پێکهێنانی ئاهەنگ و گۆرانی

لە هەموو لایەکی ولاتەوە قوتابیانی دەرکراومان بۆ ئەهات ئێمەش پێشوازیەکی باشمان لێ ئەکردن جارو بار بۆ شەو ئاهەنگمان بۆ ساز ئەکردن کە بریتی بوو لە گۆرانی‌و هەڵپەڕکێ‌و قسەی خۆش‌و هەندێ جاریش شانۆگەری پێشکەش ئەکرا، لە لایەن شێخ صدیقی شێخ محمود پێشەنگی دەنگ خۆشەکان بوو دانیشتنەکانی ئەهێنایە جۆش، بە تایبەتی گۆرانیە نیشتمانیەکانی سۆزو دەروونی هەموو لایەکی ئەهێنایە جۆش‌و ورۆژان، جار جارەش کاك سمکۆ عەزیز بە هۆرەی جافی دەنگی زۆلالی هەڵئەبڕی‌و خەڵکەکەی ئەخستە چەپڵە لێدان، کاك بهاء الدین جلال کابانیش بە دەنگە خۆشەکەی هەموو کەرەتێك گۆرانی کراس زەردێی بۆ ئەووتین، زیاتر لەسەر داوای داود جەنابی کە ئەهاتە لامان چەند جارێك پێی دووبارە ئەکردەوەو زۆر حەزی لەم گۆرانیە بوو، هەندێ جاریش دیاری پێشکەش بهاء الدین

ئەکرد. شەو لیمان ئەبووە پیاوێکی باش‌و نورانی‌و لەسەرخۆ، رۆژیش ئەبووە سەگی هار بەرامبەرمان. عبدالله محمد أمین (عەبە عفریت)یش بە دەنگە زلەکەی هاواری دەست پێ ئەکرد گوایە گۆرانی فارسی ئەڵێت، هەرچەندە هیچ پەیوەندیەکی بە فارسیەوە نەبوو تەنها هاوار هاوار بوو ئەم ئیشەی بۆ چووە سەر تا ٢٠ – ٢٥ قوتابی نەجەف‌و کەربەلایان هێنایە لامان فارسیان ئەزانی، کاک عبداللەیان لێ تەرە کردین، هەرچەندە داوای گۆرانیان لێ بکردایە ئەم نەخۆش بوو، تا مەسەلەکەیان لە برادەران گەیاندو بە زۆری زۆردارەکی‌و پاڕانەوە هەڵیان ئەپێچاو گۆرانیان پێ ئەووت‌و ئەبووە هەراو چەپڵە لێدان‌و سەندنەوەی‌و ئەیانووت فارسی‌یەکەی بەهێزە، ئەم برادەرانە بە تەواوەتی هۆگری عبدالله بووبوون، بە رۆژیش ئەهاتنە لای‌و دەمەتەقێیان لەگەڵ ئەکرد، ئەویش قسەی خۆشی بۆ ئەکردن‌و جارو باریش لە ژێر لێوەوە گۆرانیان پێ ئەووت.

چەند برادەرێکی عەرەب گۆرانی بێژی باش بوون لە مقامات‌و بەستەی خۆیاندا، لە هەموو دانیشتنەکاندا بەشداریەکی تەواویان ئەکردو ئاهەنگەکانیان گەرم ئەکرد، بە تایبەتی برادەرانی بصرە گۆرانی خلیجیان بۆ ئەووتین. بە بۆنەی سەری ساڵی تازەوە ئاهەنگێکی قەشەنگمان گێڕاو شانۆگەریەکیشمان پێشکەش کرد بە ناوی بژی ئاشتی لە جیهاندا، (سمکۆ عەزیز کوڕێکی لاوازو سوکەڵە بوو، جلێکی سپی لەبەر کرا دوو باڵی جوانی بۆ رێك خراو ساتە ناساتێ ئەخرایە سەر دەستی چەند برادەرێك‌و بە قاوشەکەدا ئەیانگێڕاو بۆی ئەدرا لە چەپڵە گوایە ئاشتی‌یە، شیرینی دابەش ئەکراو ئەکەوتینە پێشکەش کردنی گۆرانی، شێخ صدیق دیسان بە دەنگە خۆشەکەی گۆرانی ئەی نائومێدی (خەنەبەندان)ی پێشکەش کرد، کە ئەهاتە سەر ئەوەی بڵێ لە هەر چوار لاوە شاییە بە ریزە خەنەبەندانمان خوێنی ئازیز، ئەبووە چەپڵە لێدان‌و هەڵچوون چونکە باسی شایی هەر چوار لای داگیرکەری کوردستانی ئەکرد لە سەرکوت کردن‌و پارچە پارچە کردنی میللەتی کورد. جا سەرە هاتە سەر بهاء الدین کابان‌و عەبە عفریت‌و هۆرە جافیەکەی سمکۆ عەزیز، برادەرانی عەرەب هەندێ

گۆرانیی و هەڵپەڕکێیان پێشکەش کرد لەگەڵ بەشێ لە یاری دەستو قاچ جوڵاندنو سەمای تاکیو دوو دوو خەڵکەکەی ئەورووژاندو لە هەموو لایەکەوە ئەبووە چەپڵە لێدان، ئاهەنگەکە ئەوەندە گەرمو بەجۆش بوو پاسەوانەکانیشمان بە رادەی ئێمە کەوتبوونە هەوای خۆیان بێ ئەوەی بزانن مەسەلە چیيە! تەنها وایان ئەزانی کە لە خۆمانەوە شەوە ناشەوێ ئەم جۆرە ئاهەنگە ئەگێڕین. برادەرانی عەمارەش چەند کەسێکیان دەستیان کرد بە سەماکردنو خۆبادانو لەسەر قاچ دانشتنو هەڵسانەوە بە توندیو دوو دوو لەیەك ئاڵانو جیابوونەوە کە ئەمە سەمای گۆرانی (هجع)یان پێ ئەووت، وا بزانم یعنی بۆم بکەوە کە ئەمەش گۆرانیەکی بەناوبانگی لای خۆیانەو بە (أجل من) دەست پێ ئەکاو ئەمەش گەورەترین کێشەی بۆ دروست کردینو بووە وتووێژێکی گەرمو هەڵچوونو هێرش بەرامبەر یەکتر، گوایە رێگە بەم سەمایە دراوە کە دلالات لە بێ رەوشتیو سیستەمی بۆرجوازیو دەرەبەگایەتی ئەکاتو ئەبێت ئەو برادەرانە سزا بدرێن کە گۆرانیەکەیان وتووەو ئەوانەش رێگەیان پێ داون، ئێمە زۆرمان لەمە نەئەزانیو نەشمان ئەویست ئەوەندە بایەخی پێ بدەینو تا رادەیەك باوەڕیشمان پێی نەبوو. لەبەر ئەوە ئەمانویست بە شێنەییو لەسەرخۆ چارەسەری بکەین، بەڵام هەندێك کێشەکەیان گەورە کرد، هەرچۆنێ بێت توانیمان چارەسەری بکەین هەرچەندە کێشەکە ئەوەی نەدەهێناو هیچی تیا نەبوو تەنها توندڕەوی هەندێ برادەر نەبێت کە بەلایانەوە زۆر ستەم بوو شتی وا بوترێو سەمای وا بکرێ کە خۆی لە خۆیدا هونەرێکی فۆلکلۆری خۆیان بوو، لە یاری گورجی دەستو مەتەڵو پرسیاری رووبەڕوودا هەموو لایەك دەوری خۆیان بینی، بەڵام دەوری کاك کامل ژیر کە شاعیرو ئەدیبو نوکتەبازو شارەزا بوو لەگەڵ عەبدولی سۆرانو جەزای میرزا حسین جیاوازو شاز بوو هەموو لایەك پێیان خۆش بوو، بێجگە لە برادەرانی عەرەب وەکو عبد علی هادیو ضیاء عگیلیو فرات جواهیری ئەبو شهابو قاسم عثمانو چندینی کە کە ئاهەنگەکەیان خۆشتر

کردبوو ئەو شەوەمان بە خۆشی بردە سەرو بەیانی هەینی بوو درەنگ لە خەو هەڵسایןو هەریەکە کەوتە ریش تاشینو خۆگۆڕینو ئامادەبوون بۆ پێشوازی کردن لەو کەسو کارانەی ئەهاتن بۆ بینینمان.

## هەڵویستێکی پاڵەوانانە

ئەم جارەی بینینی مانگانەمان بە پێچەوانەی جارەکانی کەوە پێشوازی بە سەرپەرشتی ئامر معسکر محجوب أمین عساف بوو کە ئەفسەرێکی کەللەڕەقی کۆنەپەرستی دڵڕەقو چارەگرانو بێ ئەقڵ بوو، بە ئامادەبوونی هەموو ئەفسەرو رئیس عرفاو عەریفەکان، دەستیان گرت بەسەر ئەو شتانەی بۆمان هاتبوو ئەیانویست یەك بە یەك بیپشکننو سەیریان بکەن ئەوسا بماندەنێ، ئەمە لای ئێمە شتێکی ئاسایی بوو، تا برادەرێ هاتە لامان ووتی دایکی حافظ بریدی بۆ هێناوینو وا لە فلان تورەکەدایە لە بەردەم عریف رحیمدا، سەرەی پشکنین بگاتە سەریو بیکاتەوە هەموو شت دەرئەکەوێ کەسو کارەکانیشمان ئەگرن، ئێمە بە تەواوی شڵەژاینو نەمانئەزانی چی بکەین! ئەبوایە بە زوویی هەڵوێست وەرگرینو بکەوینە خۆمان، لەم کاتەدا برادەرێکی ئازاو لەخۆبوردووی خەڵکی بەصرەمان کە ناوی حمید بوو ئامادە کرد شتەکان بفڕێنێ بۆ ناو قاوشە رووخاوەکانی معسکر کە ژمارەیان هەشت نۆ قاوش بوو داروبەردی بەسەر یەکتردا کەوتبوونو کەس سەری لێ دەرنەئەکرد بە چەندان قوژینو سوچی تیابوو کە گەورەترین شتی ئەشاردرایەوە زەویەکی زۆری داگیر کردبوو پڕبوو لە لەتەخشتو بلۆكو پارچەدارو ئاسنو گەچو چیمەنتۆیەکی زۆر، برادەرەکەمان بە غطرەیەك دەموچاوی هەڵبەستو خۆی رێكو پێك خست بە جۆرێك کەس نەیئەناسیەوە، وردەوردە لە شتەکان نزیك کەوتەوەو هەڵمەتی بردە سەریو شتەکانی فڕاند بۆ ناو قاوشە رووخاوەکان بە راکردن، عەریفو سەربازەکان بەدووی کەوتن بەڵام ئەو زۆر ئازایانە بۆی دەرچوو، ئێمەش هەریەکە بەلایەکدا بڵاوبووینەوە

بۆ بەرەنگاری سەربازەکان نەك بۆ شەڕ بەڵکو بۆ ڕێگە لێ گرتنیانو دواخستنیانو نەگەیشتن بە برادەرەکەمان، زۆر لە پێش سەربازەکانەوە گەیشتە قاوشە رووخاوەکانو هەموو شتەکانی لە چەند جێگایەکی جیاجیادا قایم کرد بوو، خۆی بە پشتی معسکرەکەدا دوای خۆگۆڕین هاتەوە ناومانو خۆی حەشاردا بێ ئەوەی بیناسن، هەرچۆنێ بوو پێشوازی تەواو بوو هیچ کەڵکی بۆ ئێمە نەبوو چونکە هەرزوو هاتووەکانیان بە دەنگە دەنگو پاڵ دەرکردو بڵاوەیان لێ کردو ئێمەشیان کردە قاوشەکانو خۆشیان بە هەموو هێزەکانیانەوە بە قاوشە رووخاوەکاندا بڵاوبوونەوە. بە زوویی بڕیارمان دا کەس نەچێت بەو ناوەداو توخنی ئەوێ نەکەوێ، لە لایەکی کەشەوە هەر برادەرێکیان بانگ کرد بڵێت هیچمان نەدیوە، لەمەوە بۆمان دەرکەوت ئەم بڕیارەمان بە دڵی هەندێ برادەر نەبوو، چونکە فێر بووبوون شتی نایابی کارەبایی‌یان لە دیوارە رووخاوەکان ئەکردەوە لە بصرە ئەیانفرۆشت، ئەمانە کۆمەڵێکی کەم بوون، هەندێ برادەری هەڵەبجەیی‌و بەصرەیی‌یان تیادا بوو زۆر بە نهێنی ئیشیان ئەکرد ئێمەش بە هیچ جۆرێك دەرکمان پێ نەکرد بوون، گەر بمانزانیایە بەرهەڵستیمان ئەکردنو سزامان ئەدان، تا دوایی دانیان پیاناو بە هۆی ئەو کێشەیەوە لێی دوورکەوتنەوە، سەرۆکەکەیانو راپەڕێنەری ئیشەکانیان کاك رووف بوو، ئاگاداری کردین ئەمە چەند مانگێکە سوود لەم ئیشە ئەبینن.

بۆ ئێوارەی ئەو رۆژە لێپرسینەوە دەستی پێ کرد بەڵام هیچیان دەست نەکەوت، تەنها توانی‌یان هاوڕێ ضیاء عگیلیو کاظم حبیب کە لە برادەرانی راية الشغيلة بوو بگرن، بۆ چەند رۆژێکی کە دوو برادەری ئازاو زیرەكو شارەزا بوون توانی‌یان خۆیان رزگار بکەنو بەریان بدەن، دوای ئەم کێشەیە پشێویمان تێك چوو، ئەفسەرو پاسەوانەکان بە تەواوەتی کەوتنە گوشار دانان لەسەرمان، لە قاوشەکەدا جێگەی نوستنمان گۆڕرا، بە پێی نەخشەی ئەوان ئەبوایە لە یەك دوور بینو سەرەوژوور جێگە داخەین، مانای

هەریەکەمان سەری لای قاچی ئەویکەوە بێت، بێجگە لەوە هەندێ سەربازی پاسەوانیان لەگەڵ دانایین، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو شەو فیقە لێ ئەدراو ئەبوایە خۆمان بگۆڕین و بچینە دەرەوە ریز بین و هەریەکەی بە دەنگی بەرز ناوی خۆی و ژمارەی سەربازی خۆی بڵێت، ئەمانە و زۆر شتی کە بەرامبەرمان وەرگیرا، بەمەش معسکر زۆر زیاتر بووبووە بەندیخانەیەکی تەواو هەڵسوکەوتمان تێکڕا گوڕاو هەندێ ملکەچی فشاری ئیدارە بووین بۆ خۆپاراستن لێیان، بە تایبەتی وایان سەپاند بە سەرماندا، هەموو بەیانیەك زوو سەعاتێك راکردن بکەین و ریز بین و ئاڵای عێراقیمان بۆ هەڵکەن و سەلامی پاشایەتیمان بۆ لێدەن، ئەمە بووە کێشەیەکی گەورە بۆمان و هەندێ لە برادەران بۆچوونیان وابوو نابێت بەم کارانە هەستین و ئەبێت بەرپەرچی بدەینەوە و مان بگرین، خۆپیشاندان بکەین و بە هەموو چەشنێ بەرهەڵستی بکەین، هەندێکیش وای بۆ ئەچون و ئەیانووت ئێمە سەربازین و ئەبێ بە پێی یاسای سەربازی هەڵسوکەوت بکەین و لەگەڵیاندا بجووڵێینەوە و لەسەرخۆو بە هێمنی چارەسەری کێشەکانمان بکەین، ئەمەش بۆچوونی ئێمە و رێکخستن بوو، پاشان بڕیاری کۆتاییمان حستە بەردەم حزب و نامەیەکی بە پەلەمان نووسی و وەرامەکەیمان بۆ هاتەوە لایەنی بۆچوونی رێکخستنیان ئەگرت کە دەبێت بە وردی بجووڵێنەوە و ئاگاداری خۆمان بکەین و وەکو سەربازێك یاسای سەربازی پەیڕەو بکەین، بەڵام ئەبێت بەرەنگاری هەموو بدعەیەك ببینەوە کە بیانەوێ بەسەرماندا بیسەپێنن و سەرکوتمان بکەن، ئەمە بە ئاشکرا لە نامەکەی حزبدا رەچاو کرابوو، هاتین نامەکەمان بڵاو کردەوە و پیشانی هەموو برادەرانمان داو کردمانە بنچینەیەك بۆ ئیش و کارەکانمان هەندێ خۆمان شل کرد بۆ یاسای سەربازی و نەرمیەکمان نواند لەگەڵیاندا بێ ئەوەی بتوانن شتێکی نائاسایی دوور لە یاسا بچەسپێنن بەسەرماندا.

## هەندێ شتی خۆش و سەیر

لـەم كاتـە ناسـكو نالـەبارەدا نیوەڕۆیـەك فیكـە لێـدراو داوای كۆبوونەوەیان كردن، هەر هەموو بە پەلەو ڕێكو پێك خۆمان گۆڕیو لە خەتا وەسـتاینو سـەرژمێریمان كـراو هەریەكـە ژمـارەی سـەربازی خـۆی وت، ئەمسەركراو ئەوسەركرا یـەكێك دیـار نیـیـە، بۆیـە ئەفسـەرەكان هـەر هـەموو كەوتنـە هەڕەشـەو گوڕەشـەو كەسـە نادیارەكـە! هـەر زوو دەركـەوت حسـینی حاجی امین وونە، لە كوێ بێت كەس نازانێ، قاوشەكانو سوچەكانی معسكر گەڕان بێ سوود بوو تا نیوەڕۆیەكی درەنگ هیچ بە هیچ نەكرا، ئێمە دڵنیا بووین حسین ناتوانێ رابكات، پێویستی بەوە نییەو بۆشی نەئەكرا چونكە معسكر بە چەشنێ بە تەلی دڕكاوی تەنرابوو مەلیشی لێوە دەرنەئەچوو، بێجگە لەوەش تا چاو بڕكا هەردەشتو بیابان بوو، لە دووری چەند كیلۆمەترێكەوە چەند دەوارێك هەڵدرابوو كە زیاتر كەسوكاری پاسەوانەكان بوون، ئەم برادەرە هەروەكو وتمان یەكەم دڵ تەڕو جوان پەرستو دڵدار بوو، كە بینی بووی لە دوورەوە كراسی زەردو سوورو شینو رەنگـاوڕەنگ دیـارە، وا ئـەزانێ بـەرەو كانیباو وەیس ئەچێت یەكسەر تەلبەند ئەشكێنێو دەشتو بیابان ئەبڕێو بۆی ئەكشێ تا ئەگاتە لای ئەو دەوارانە، ئاوو دۆی بۆ ئەهێننو نانی دەرخوارد ئەدەنو هـەندێ ئەحەوێتـەوەو خـۆی لـەبیر ئەچێتـەوە، پاش یەك دوو سـەعات بیری ئەكەوێتەوە بگەڕێتەوە. پاسەوانەكان لە دوورەوە بەدی ئەكەنو ئەچن بە لێدان ئەیگێڕنەوە معسكر، كە ئەیبەنە بەردەم داود جنابی ئەزانێ مەسەلەكە چیەو دەست ئەكات بە پێكەنینو هەڕەشەی لێ ئەكات سزای گەورەی بدات، رێگەیان دا بگەڕێتەوە لامان، هاتو سلاوێكی كرو لە جێگەی خۆی دانیشت هەر وەكو هیچ رووی نەدابێ، بەڵام برادەران وازیان لێ نەهێناو هـەر بۆ سـەیرو خۆشی دادگایەكیان بۆ پێك هێنا كە پێویستە چی لێ بكەنو چۆن سزای بدەن بۆ ئەو كێشەیەی بۆی دروست كردن، بڕیار درا هـەر هـەموو ئەمبـەرو ئەوبـەر بوەستینو كاك حسینیش بە ناوەڕاستا بڕواتو هەریەكـەی شـەقازلەیەك یا

مستەکۆڵەیەکی لێ بدات، کاک حسین ووتی بە راستی ناگەمە ئەوسەر کارم خراپ ئەبێت، بەڵام بڵێم چی ئەمە بڕیارەو ئەبێت بچێتە سەر، چی برادەران هەبوو هەموو ریزبووین و حسین بە راکردن بە ناوەڕاستا بۆی دەرچوو هەرچەندە هەرشتێکی بەرکەوت، لەم کاتەدا داود جەنابی و هەندێ پاسەوان هاتنە ژوورەوە بزانن ئەم دەنگە دەنگە چی یە؟ کە زانییان سزای حسین بەم جۆرە ئەدرێ کەوتنە پێکەنین و دەست خۆشیان لێ کردین.

پەیوەندیمان هەندێك باش بوو لەگەڵ ئەفسەرەکان و لێیان نزیك کەوتبووینەوە، بەڵام جار ناجارێ تێك ئەچووینەوە، بۆ نموونە بەشێك لە برادەران قژیان تەنك بوو یا ئەڕوتایەوە، بە هەلیان زانی ناچنە دەرەوەو خەڵك نایان بینێ بڕیاریان دا هەر هەموو بە گوێزان سەریان سفر بکەن، جا بزانە چ نموونەیەك ئەمە ئامر سریەو ئەفسەرەکانی خستە ئەو باوەڕەوە کە ئەمە مانگرتنەو بەگژاچوونی میری یە، بەم شێوەیە بەرەنگاری کارەکانیان ئەبنەوە، ئەمە بووە گێرمەو کێشەیەکی گەورەو هات و هوت لە بەینی ئێمەو ئەواندا، خەریك بوو هەر هەموو سزا بدرێین، تا هەوڵمان دا پێیان بسەلمێنین ئەم هیچ مەبەستێکی تیادا نی یە تەنها ئەوە نەبێت ئەیانەوێ قژیان بەهێز بێت و ئەمە لە باووباپیرانەوە بۆمان ماوەتەوەو بووەتە پیشەیەکی ئاساییمان و لەسەری رۆیشتوون و ئەنجامیشی هەبووە، لەم کاتەدا زۆربەی کاتمان لەگەڵ ئەم کێشەیەدا ئەبردە سەر، لە دانیشتنێکی بەینی خۆماندا حسینی حاجی امین کە یەکێ لە سەرتاشراوەکان بوو وتی برادەران رێکەم بدەن قسەم هەیە ئەیکەم! وتمان فەرموو ئەمانزانی رێگەیەك و پێشنیارێکی باشی پێیە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە، هەستایە سەرپێ وتی کوڕینە ئەزانن ئێمە هەموو شێتین چونکە کەس نابینین و کەس نایەتە لامان، بۆیە بە خۆمان نازانین هەر خۆمان یەکتر ئەبینین، باشە گەر وانی یە ئەم سەرتاشینە چی یە؟ گریان و هاواری نوری خەفاف و صلاح و هاورێکانی چی یە؟ بە راستی هەندێ برادەرانمان هەبوو رادەی نفسیان زۆر خراپ بوو ساتە ناساتێ کۆڕی گریان و

هاوارو واوەیلایان ئەگێراو ئەپاڕانەوە لە خوا کە ڕزگاریان بێت لەم بەندیو سەربازیە، بۆیە گەر یەکێ بێت بۆ لامانو بەم چەشنە بمانبینێ وا ئەزانێ هەموومان شێتین. هەموو بۆیان دا لە چەپڵەو پیاهەڵدانی کە باش لە مەسەلەکە گەیشتووەو بۆی چووە، بەڵام چار چییە؟ ئەویش هاواری کرد ئەمەش شێتییەکی ترە، بەم جۆرە هەندێك وازیان هێناو قژیان هاتەوە، هەندێکیش هەموو ڕۆژێ گوێزانیان بەکار ئەهێناو سەریان سافو لووس ئەکرد.

یەکێ لەو شتە سەیرانەی بەرنگارمان ئەبۆوە، لە قاوشەکەماندا پاسەوانێکی بێ ئەقڵی قیرسچمەی شێتۆکەی بە تفەنگێکەوە بۆ دانرا بوو، نەی ئەهێشت بچینە دەرەوەو سەردانی یەکتر بکەین، چەند گەرماوێکی هاوینە لە دەرەوەی قاوشەکە هەبوو ئەبوایە لەوێ خۆمان بشتایە، دوو دوو ئەچووین بۆ خۆشتنو ئەبوایە بە زوویی بگەڕاینایەتەوە، نیوەڕۆیەك عەبە عفریت ئەچێ خۆی بشوات پاسەوانەکە ڕێی لێ ئەگرێو نایەڵێ بڕواتە دەرێو قسەشی پێ ئەڵێ، عەبەش ناکاتە نامەردی بە هەموو هێزی بۆکسێکی لێ ئەداو ئەکەوێتە لێدانو ڕائەکاو ئەویش بە دوایدا تا خۆی ئەکات بە ژووری ئەفسەرەکاندا هاوار ئەکا فریام کەون کوژرام، هەموو دەرئەپەڕنە دەرەوە ئەبینن عەبە بە تەختەیەکی قەرەوێڵەوە (هەر قەرەوێڵەیەك سێ تەختە لەسەر بوو) دوای کەوتووە، کە ئەوان ئەبینێ بە بۆڵە بۆڵو جنێو دان ئەگەڕێتەوە قاوشەکە، عەبە هاتە لامان بە هەڵەداوانو پەشۆکاوی وتی هەر ئێستا دێن ئەمبەن دارکاریم ئەکەن قەوماندومە، وام ئەزانی لە ناو شەقامەکانی هەڵەبجە دامو پۆلیس ڕاو ئەنێم ئەوەندە قینم هەڵسابوو نەمئەزانی چی ئەکەم، ئەبێ چارێکم بۆ بدۆزنەوە ڕزگارم کەن بەرگەی تێ هەڵدانی ئەمانە ناگرم، دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر برادەرێکمان وتی شتێك ئەڵێم تووڕە مەبە بەخوا ئەمە فریات ئەکەوێو ڕزگارت ئەکات، ئەم پاسەوانە بێ ئەقڵو شێتە ئەفسەرەکانیش ئەزانن بڕۆ شکاتی لێ بکەو بڵێ دەستی بۆ بردوم، منیش خۆم بە پیاو ئەزانمو ئەم شتانە لای ئێمە

زۆر عەیبەو پیاوی لەسەر ئەکوژرێ، ئەبێ دوعا بکات کە ئەم کوشتووە لە بەردەممدا رای کردووە، ئێمەش چەند کەسێك ئەبین بە شایەت‌و سوێند ئەخۆین، چونکە باش ئەزانین ئامر سریە ئەو قورئانەی داینـاوە لەسەر مێزەکەی هەمووی کاغەزی سپی‌یەو هیچی لەسەر نەنوسراوەو قورئان نی‌یە، ئەم نهێنیەش برادەرێکمان لە پاسەوانەکان ئاگاداری کردووین، عەبە پێشنیارەکەی بە باش زانی‌و خۆی گۆڕی‌و بە پەلە بەرەو لای ژووری ئەفسەرکان چوو شکاتی خۆی کردو چەند شایەتێکی نووسی کە ئاگایان لەم رووداوە هەیەو گەڕایەوە، وتی چیتان پێ وتم بەو چەشنە شکاتم کردو ئیتر نازانم چۆن ئەبێت، ئەوەندەمان زانی ناردیان بە شوێن عەبەو شایەتەکاندا، وەکو بۆیان گێڕاینەوە کە ئەچنە ئەوێ ئامر فصیل ئەکەوێتە هەڕەشەو گوڕەشە لە هەموویان کە گوایە سزای قورسی ئەو کەسە ئەدرێت راست نەڕوات، ئەمە شکاندنی یاسایەو تمردە! کاتێ عەبە دیسان دەست ئەکات بە گێڕانەوەی رووداوەکە بە چەشنێ دروستی ئەکات‌و بە تورەیی روو ئەکاتە ئەفسەرەکان‌و ئەڵێت لە سەربازیش دەرچم واز ناهێنم ئەبێ مەحکەمەی ئەو بکەن نەك من، کابرای پاسەوان واقی وڕئەمێنێ‌و دەست ئەکات بە سوێند خواردن‌و پاڕانەوەو ئەڵێت وا نی‌یەو من هیچم نەکردووەو دەستم بۆ نەبردووە تەنها نەم هێشتووە بچێتە دەرەوەو ئەم کەوتۆتە لێدانم، عەبە ئەڵێت کەواتە من شێتم‌و لە خۆمەوە ئەم کارە ئەکەم‌و ئەم عەیبەیەش ئەهێنمە سەرخۆم، ئەوە شایەت‌و سوێندیان بدەن، جەنابیشتان باش ئەزانن ئەم پاسەوانە شێتە، دوایی شایەتەکان یەك یەك سوێند ئەدەن‌و دەست ئەدەن بە قورئانداو ئەڵێن عەبە چی ئەڵێت راستەو گومانی تیادا نی‌یەو، بە چاوی خۆمان بینیمان دەستی بۆ برد، پاسەوانەکەش دەستێکی ئەکەوێتە ئەملاو دەستێکی ئەکەوێتە ئەولاو هیچی بۆ نامێنێتەوەو لەوێدا دەست ئەکات بە جنێودانی عەبەو شایەتەکان، هەر لەبەر ئەمە بڕیاری بێ گۆناهی عەبە دەرئەکەن‌و

پاسەوانەکە تاوانبار ئەکەن‌و ئەیخەنە بەندیخانەوە بۆ چەند رۆژێك‌و دوایی بەری ئەدەن، بەڵام لای ئێمە گواستیانەوە بۆ ئیشێکی کەو ئێمەش رزگارمان بوو لە دەستی.

رەهتەکەمان نائب عەریفێکی هەبوو ناوی بوو، رەقەڵەیەکی درێژی رەش وەکو قەتران‌و یەك خاڵی سپیت لە هەموو گیانیدا نەئەدی، تەنها دانی نەبێ سپی ئەچۆوە، لچ ئەستوورو چاوزەق، قژلوول لە سەروو ئەمانەشەوە بێ ئەقڵ‌و گێل، زیقەزیقکەر، بە چەشنێ بە سەرماندا ئەینەڕاند هەموو سەربازەکانی معسکر گوێیان لە دەنگی ئەبوو، هەموو کاتێ هاواری لێ ئەکردین کە توند قاچ بدەین بە زەویدا بە چەشنێ نەوتی لێ دەرچێت، معسکەرەکە فرۆکەخانەی ئینگلیزەکان بوو، ساتە ناساتێ چەند فرۆکەیەك هەڵئەستاو ئەنیشتەوە گرمەگرمیان کاسی کردبووین، هەموو جارێکیش ئەینەڕان‌و پێی ئەوتین گەر چاك مەشق نەکەن ئەم فرۆکانە هی نوری پاشان راتان ئەکێشن بۆ ئاسمان‌و فرێتان ئەدەنە خوارەوە، ئەم قسانەی بە هەموو عەقڵیەوە ئەکردو ئەیویست ئێمەش باوەڕی پێ بکەین، نا حەقی نەبوو ئەفسەرەکان بەم چەشنە کەڵکیان لە دواکەتوویی‌و گێلی ئەمانە وەرئەگرت، هەر هەموویان وابوو ئێمەیان بە شتێکی سەیر ئەزانی، بە هەموو بۆچوونیەکیانەوە ئێمەیان بە کافرو زەندیق ئەزانی‌و بە کلکداریان دا ئەنایین، هەر جارێ بۆیان هەڵکەوتایە لە دواوە سەیریان ئەکردین بزانن کلکمان هەیە یا نا؟ تا لە گەرماوێکی بە کۆمەڵدا کە خۆمان ئەشت هەموو رووت بووین سەرەتاتکێیان لێ ئەکردین‌و بە سەرسامیەوە سەیریان ئەکردین، دوایی بۆیان درکاندین گوایە هاتوینە سەیرتان بزانین کلکتان هەیە یا نا! وتیان ئەفسەرەکان وایان خستۆتە مێشکمانەوە بەڵام وا دیارە هەر وەکو ئێمە وان‌و هیچ جیاوازیەکتان نییە.

هەموو بەیانیەك دوای کۆبوونەوەمان لە ریزەکاندا، هەر جارە عەریفێ محاضرەی بۆ ئەدایین، باسی سەرانی وڵات‌و یاسای سەربازی بۆ ئەکردین

لەگەڵ توندو تیژیو هەندێ جاریش پاكو تەمیزیو قەڵافەتمان لەگەڵ باسی سەربازیو شەڕەكانی جیهانو نێوخۆ، لەم باسەدا نائب عریف فیروز هێرشێكی زۆری كردە سەر مەلا مصطفی بارزانیو شۆڕشی كوردو بە خائنی گەلو وڵاتی دانا، كاتێكی باش لەسەر قسەكانی بەردەوام بوو، وای لێهات هەموومانی خستە هەڵوێستێكی ئەوتۆ كە ئەبێت سەرشۆڕی ئەم كابرا نەفامو گێلە نەبین، كەوتینە چرپە چرپو خۆجولاندنو خۆخەریككردن بە نیازی ئەوەی بڵاوەی لێ بكەینو گوێی لێ نەگرین، لەم كاتەدا برادەرێكمان هاواری كرد نائب عریفی عگالك، ئاگات لە خۆت بێ، كە ئەوە ئەگرێتەوە خێزانەكەت خراپە لە بۆچوونی برا عەرەبەكانەوە، فیروز تێكچوو هێرشی بردە سەر هەمووومانو هەڵی كوتایە سەر برادەرێ بە نیازی لێدان، گوایە لای وابوو ئەو هاوارەكەی كردووە! لەم كاتەدا كاك حسینی مەلا حكیم كە كوڕێكی كوردپەروەری خوێن گەرمی خەڵكی سلێمانی بوو نطاقەكەی كردەوەو بە هەموو هێزی سرەوانیە لەشو دەموچاوی، برینداری كردو بووە هەرا، یەك دوویەكی كەش هەڵیان كوتایە سەریو هەندێ شەقو مستەكوڵەیان لێدا، ئەوەندەی بۆ كرا رای كردو ئێمەش لە جێگەی خۆمان نەجولاینو ریزمان تێك نەدا هەروەكو هیچ رووی نەدابێ، تا ئەفسەرو رئیس عرفای هێناو كەوتە جنێودانو هەڕەشەكردن لێمان، لە رووی هەڵنەهات بڵێت لێیان داومو سوكایەتیان پێ كردووم، بەڵكو وتی زۆر قسە ئەكەنو گوێم لێ ناگرن، ئێمەش هەموو بە یەك دەنگ وتمان راست ناكات ئێمە پەیرەوەكەری یاسا ئەبین، بەڵام ئەم كابرایە شێتەو جنێومان پێ ئەداتو قسەی ناشیرین ئەكات، لەبەر ئەوەی كاتەكە نەختێ باشتر بوو لە جارانو هەندێ دڵنەواییان ئەكردین، ئەوەندە كێشەكەیان گەورە نەكرد، ئەفسەرەكە وتی ئێوە كەللە رەقو گەرمن بۆیە بەم چەشنە هەڵچوون گوێ لە قسەتان ناگرم، سێ برادەری عەرەبمان لەگەڵدا بوو قسەیان لەوان وەرگرت، ئەوانیش هەموو بەرگریان لە ئێمە كرد، بە باشیو بەرژەوەندی ئێمە رایان دەربڕیو كێشەكە كۆتایی هاتو هێمنی پەیدا بووەو

کەوتینەوە پیاچوونەوەی محاضرەکە وەکو فیرۆز نە بای دیبێ نە باران کەوتەوە قسەکردن و دەست جوڵاندن، بەڵام بە چەشنێکی تر کە بە لای باسەکەی پێشوویدا نەچوو، ئێمەش هەروەکو هیچ نەبووبێ دەستمان کرد بە پرسیارکردن و لێدوانی باسەکەی، بەڵام بۆ دوایی کە دەنگ بڵاوبۆوەو باس لەسەر کێشەکە کرا مەسەلەی بەرزان و شۆڕش بووە باسێکی رۆشنبیری بەربڵاو لە ناو هەمواندا و هەڵوێستی ئێمە لەو رووداوانە.

هەموو رۆژ کێشەیەکی نوێ دروست ئەبوو بۆمان کە ئەبوایە بەرەنگاری ببوینایەتەوەو نەمان هێشتایە گەورە ببێ، ئەم کەرەتەیان ئامر سریەکەمان (محجوب أمين عساف) کە چەند رۆژێك بوو لە مۆڵەت گەڕابۆوە، زۆر لە جاران زیاتر گرژو مۆن و قین لە دڵ بوو، وەکو بۆی دانرابێ کێشەیەك دروست بکات و ئاگر هەڵگیرسێنێ، هەر بە گەیشتنەوەی ئەو ئێوارەیە فیکەیان لێداو کەوتنە بانگ کردنمان بۆ کۆبوونەوەو گوێ گرتن لە ئامر سریە، هەموو بە پەلەو دڵەڕاوکێوە چووین بازنەیەکمان پێك هێناو بۆ ئەویش کورسی و مێزێکیان دانا بەرامبەرمان، هەروەکو گورگێکی هار دانیشتبوو نقەی لە خۆی بڕیبوو هەر زمانی خۆی ئەکرۆشت و پێنوسەکەی ئەم دەست و ئەو دەست پێ ئەکردو چەند پارچە کاغەزێکی لە بەردەمدا بوو جێگە گۆڕکێی پێ ئەکردن و نەیئەزانی چۆنیان دانێ چونکە پەلەی بوو بیان خوێنێتەوە، هاتە قسەو بۆڵەبۆڵ و هەندێ هەڕەشەو گوڕەشەی ئاراستە کردین، گوایە ئێمە ئەمە چەند مانگێکە نەمان ویستووە یاسای سەربازی فێر بین و دەستمان داوەتە بەرەڵایی و کەمتەرخەمی قسەی درۆو هەڵبەستراو ئەگەیەننە دەرەوەی معسكر تا رۆژنامە جاسوسیەکان بڵاوی بکەنەوە، دەستی دایە کاغەزێکی بەردەمی و بە بێ دەنگ خوێندیەوە بۆ خۆی و دوایی دەنگی هەڵبڕی وتی ئەمەوێ پێم بڵێن ئێمە کوا سزامان داون؟ کەی خواردنمان نەداونەتێ؟ کوا ئاوی پیس ئەخۆنەوە؟ کەی بێ دەرمانمان کردوون؟ و زۆر شتی تر کە لە رۆژنامەکەی بەردەستیا هەبوو، لەگەڵ بەیانێك کە لە قاوشە رووخاوەکاندا دۆزیبویانەوە لە

کاتی گەرانیانا بە شوێن ئەو شتانەی کە هاوڕێکەمان کاتی خۆی فڕاندیە ئەویی و خوێندنەوەی زۆری تورە کردبوون، بە مەرجێ نەیان توانی کەس گوناهبار بکەن، زۆر باش ئەمانزانی ئەو ریپۆرتاجە ئەخوێنێتەوە کە لە رۆژنامەیەکی حزبدا دەرچووبوو بە ناوی سەربازێکی گیراوی شعیبەوە کە ئێمە ناردبوومان بۆ حزب ئێمە رۆژنامەکەمان لابوو، هەموو هاوڕێیان و دۆستانمان خوێندبوویانەوەو راست و دروست هیچ درۆیەکی تیادا نەبوو، هەمووی کێشەی ئێمە بوو لەگەڵ کاربەدەستانی معسکر بە تایبەتی و بە گشتی لەگەڵ رژێم. بۆ نموونە چەند مانگێك بوو لە شعیبە بووین چوونە دەرەوەمان نەبوو کۆبەندیەك سەیر ئەکراین و هەر رۆژەی چوار پێنج سەعات کاریان پێ ئەکردین (ئەم دیوارە تێك بدەو دارو بەردەکەی لە معسکر دوور بخەرەوەو بڵاوی بکەرەوە) ئەمە زۆری هیلاك ئەکردین، خواردنێکی پیس، پڕ لە مێشوولەو مێش بۆ خواردنەوەو ئاودەست و دەست و دەموچاو شتن بەکار ئەهێنرا، رادەی پیس و پۆخڵی گەیشتبووە رادەیەك نە ئەتوانرا لێی بێ دەنگ بین، هەرچەندە خەستەخانەیەك و هەندێ دەرمانی لێ بوو بەڵام بە هیچ جۆرێك کەڵکی نەبوو، رۆژێك کاك کامل ژیر پێی راگەیاندین چاوی لێ بووە نائب عریف جبر (لە چێشتخانەکە ئیشی ئەکرد، میزەکەی خوێنی پێوە بووو خۆی دوایی چووە بۆ سەیری و پیشانی چەند برادەرێکی داوە، ئەمە وای لە ئێمە کرد نیوەرۆیەك خۆراك وەرنەگرین و شکات بکەین، ئەوانیش بڕیاریان دا پزیشکێك بێنن بۆ فحصی سەربازەکان و ئەنجام دەرکەوت هەشت نۆیەکیان ئەو نەخۆشیەیان هەیەو دووریان خستنەوە لە چێشتخانە، بەڵام ئێمەشیان هەموو فەحص کرد لە کۆی ۲۵۰ - ۳۰۰ کەس یەك نەخۆشی تیا بوو، ئەمەش سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ ئێمەو بایەخدان بە تەندروستیمان، ئەوە بوو چەند برادەرێکی ئێمەیان برد بۆ سەرپەرشتی چێشتخانە، لە پێشێلکردنی هەموو نەریتێ نموونەیەکی ئاشکراو زەقمان بەدەستەوە بوو، هاوڕێیەکمان بە ناوی فەرەیدون أمین کە خەڵکی سلێمانی بوو تووشی ریخۆڵەکوێرە بوو، بە بێ

بەنج و داوو دەرمان لە ژوورێکی رەق و تەقدا نەشتەرکاریان بۆ کرد، کە تووشی ئازارو ئەندێشەیەکی گەورە بوو، هەر خۆشی بۆ راگیرا، ئەویش لەبەر ئەوەی کە هاوڕێیەکی تێکۆشەرو ئازاو لەخۆبوردوو بوو نەیئەویست بە ترسنۆك و بێ ورە بیدەنە قەڵەم، ئەمانە هەمووی لە رۆژنامەکەدا نووسرابوو بووبووە جێگەی توڕەبوونی جەنابی ئامر سریەو سزادانی هاوڕێ فەرەیدون و هەندێ برادەری دیکەمان.

شتێکی گرنگ کە بووە هۆی پێکەنینێکی زۆرو چرپەچرپ و مقۆمقۆی ناو سەربازەکان، کە ئامر سریە بە دەنگێکی بەرزو توڕەیی یەوە رووی تێکردین و وتی ئەم بوقیەی لێرە بەیانیان لێ ئەدرێت شتێکی ئاسایی یەو ئەمە هی معسکرە خۆمان لێی ئەدەین، ئەی بە چی خەبەرتان کەینەوە؟ بە چی پێتان راگەیەنین کاتی نان خواردن هاتووە، ئەمە هی من نیەو هی معسکرە، زۆر عەیبە ئێوە ئەڵێن بوقی ئیستعمارە، ئەمە هەمووی لەوەوە هاتبوو کە لە رۆژنامەکەدا هاتبوو محجوب أمین عساف بۆتە بۆقی استعمارو پرۆپاگەندە بۆ ئەوان ئەکات و ئەم هەموو ئیشە خراپانەی پێی هەڵئەستێ لە خزمەتی استعماردایە! ئەم گێلە وای ئەزانی ئەم شتانە بە بوقەکەی معسکر ئەوترێ، باش بوو وا تێگەیشتبوو، گەر نەختێ زیرەك بوایە هەر هەموومان سزا ئەدراین، بەو شێوەیە قسە بەو بوترێ، دوایی کەوتە ئاگادار کردنمان کە رێگەمان ئەدات نامە بۆ کەسوکارمان بنووسین و ئاگادارین لێرە زۆر باش ئەژین و لە هیچمان کەم نی یەو لەگەڵ پاسەوانەکاندا رێکین و وەکو برا ئەژین، لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا خراینە قاوشەکە، بەڵام بە پێچەوانەی قسەکانی ئەوو رۆژانی کەوە دەرگامان لێ داهراو چوونە دەرەوەمان لێ قەدەغە کرا تەنها شەو نەبێت رێگامان پێ درا لە دەرەوەی قاوشەکە بنوین ئەویش پاسەوانێکی زۆریان تێکەڵ کردین.

ئێمە بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەم کارە خۆمان نەشڵەژان و هیچمان نەکرد تەنها ئەوە نەبێت کە کردمانە بڕیارێك و ئەبێ ئاگاداری خۆمان بین شتێکمان بۆ

دروست نەکەن و بکەونە سزادانمان و نابێت هیچ برادەرێك نووسراوی قەدەغەکراو لای خۆی دابنێت یا بەیان و رۆژنامەی حزبی لە کاتێکی دیاریکراو بەولاوە لای خۆی گل بداتەوە، تەنها نامیلکەی (ئاسایش) خوێندنەوەی کەم بکرێتەوە، جێگەی تایبەتیمان بۆ هەموو شتێ دەست نیشان کرد، بێجگە لەمانە هەوڵ بدرێ هاوڕێیانی رێکخستن لە یەکتر دوور بکەونەوە و رێگەی دروست بوونی دانیشتنی ئاشکرا بگیرێ و هەریەکە بە ئیشی تایبەتی خۆیەوە خەریك بێت، نەك پیاوەکانی ئامر کەڵك وەرگرن چونکە هەندێك سیخوڕی دروست کردبوو لە سەربازەکانی خۆیان و یەك دوو کەسی نەفس نزمی سەربەخۆمان، یەکسەر پەیوەندیان بە خۆی و عەریف رەحیمەوە هەبوو.

## هەڵمەتی پشکنین

یەك دوو رۆژ ئەم کارەمان بردە سەر، پاسەوانەکان زۆریان پی ناخۆش بوو چونکە رێگەمان لێ گرتبوون و هیچ بەڵگەیەکمان نەئەدا بەدەستەوە تا بەکا رێ هەڵسن یا شتێکمان لێ بدۆزنەوە رێگەیان بۆ خۆش کات هێرشمان بکەنە سەر، ئەم چاوەڕێ کردنە زۆر قینی هەڵساندن و دانیان لێ ئەکرۆشتین، هەر بۆیە بەیانیەکی زوو بە دەنگە دەنگ و جنێودانی ئەوان خەبەرمان بۆوە، هاواریان ئەکرد کەس نەجوڵێ و نەچێتە ژوورەوە و هەرکەس لە بەر جێگەکەی خۆیدا بوەستێ و قسە لەگەڵ یەکتری نەکەن، هەریەکەی پاسەوانێکی لە ژوور سەرەوە وەستابوو بە چەکەوە، جوڵەیان لێ قەدەغە کردین، ئەفسەرو چەند پاسەوانێك لە قاوشەکەدا بۆ پشکنینی جێگەکانمان لە ژوورەوە لەگەڵ جل و بەرگ و کەلوپەلەکانمان، پاش سەعاتێ هاتنە دەرەوە بە دەنگە دەنگ وادیار بوو هیچیان چنگ نەکەوتبوو جگە لە هەندێ کتێبی ئەدەبی و نامەی کەسوکارمان کە لەوەوبەر لە کاتی هاتنیاندا خوێندبوویانەوە، چونکە هەموو نامەیەکیان هەڵئەپچڕی پێش ئەوەی بگاتە دەستمان دواتر کەوتنە پشکنینی خۆمان و جێگاکانمان، ئەم هەڵمەتە بە سەرۆکایەتی ئەفسەری دوو ئەستێرە

جمیل بەیاتی سازکرا، ئەم کابرایە تا رادەیەك محترمو دڵسافو نەرم بوو لەگەڵمان بە پێچەوانەی ئەوانی ترەوە، وا دیار بوو یان خۆی یا هەندێ لە دۆستو خزمانی سیاسی بوو بن چونکە هەندێ جار ئەکەوتەو وتووێژی سیاسی‌یەوە لەگەڵمان بە شێنەیی‌و لەسەرخۆ، دوای سالانی ١٩٦٣و هاتنی بەعسیەکان‌و عبدالرحمن عارف بۆ سەر حوکم بوو بە مدیری ئەمنی گشتی بۆ ماوەی چەند ساڵێك‌ودوای خانەنشینی بوو بە مدیری مفوضی جمعیەی رافدین بۆ بەرهەم هێنانی پەلەوەر. کاتێ پەیوەندیم بەو کۆمەڵەوە هەبوو بۆ کڕینی مریشك‌و جوجەڵە کە ئەو کاتە دوکانی (مریشکی برژاو) بە تەندورم هەبوو لە سلێمانی چەند جارێك یەکترمان بینی‌و زۆر بە ئاسانی یەکترمان ناسیەوەو کەوتینە گێڕانەوە باسی کۆن‌و دەردو ئەندێشەی سەربازی زۆر کەڵکم لێ وەرگرت لە ئیشەکەمدا، چونکە بێ بەرامبەر ئیشی بۆ ئەکردین، کابرایەکی راست‌و باش بوو لەو ئیش‌و کارەشیدا، وەکو خۆی ئەیووت سیاسەتی تەلاق دابوو قێزی لە زۆربەی ئیش‌و کاری رژێم ئەکردەوەو رەخنەی لێ ئەگرتن، جا ئەو هەڵمەتەی بە سەرۆکایەتی ئەم کرایە سەرمان نەختێ نەرمی لەگەڵماندا نواندو دەستی لێ پاراستین‌و زۆر بە شوێن شتا نەئەڕۆیشت تا بەرۆکی نەگرتایەو چاوپۆشی لە هەندێ شت کرد، بەلام بێ ئاگای خۆی پاسەوانێك دوو برادەری ئێمەیان بینی بوو خەریکی کاغەز دڕاندن‌و جوینی بوون لە دەمیاندا، لەپڕ هەڵی کوتایە سەریان‌و کاغەزەکانی بە وردکراوی‌و پارچەپارەچەیی کۆ ئەکاتەوەو ئەیهێنێ بۆ بەردەم جمیل بەیاتی، هەرچەندە دوو برادەرەکە وتیان هی ئێمە نی‌یەو نازانین چی تیایەو چی لێ نووسراوە، بەلام چەند پاسەوانێکی کە شایەتیان دا کە هی ئەمانە، دەستیان کرد بە لێکدانی پارچەکان‌و خوێندنەوەیان کە بریتی بوو لە چەند نەشیدێکی شۆڕشگێڕی، هەر لە یەکەم دێڕەوە کە بۆ جمیل بەیاتیان خوێندەوە ئەو هەمووی بۆ تەواو کردن، چونکە هەمووی لەبەر بوو بە ئاوازەوە لە ئێمە باشتر بە دەنگی بەرزەوە ئەیووت.

لەم رەفتارەی ئەو دوو برادەرە زۆر پەست بوون کە بە خۆڕایی و بێ گوێدان بە ئامۆژگاریەکانی ئێمە خۆیان خستە ئەم کێشەیەوە، هەر لە بەردەمی ئێمەدا دەستیان بەستن و بردنیان بۆ بەندیخانە، یەکێ لەوانە هاوڕێ مصطفی عبدالرحمن بوو خەڵکی سلێمانی و قوتابی بوو لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان، هاوڕێیەکی تێکۆشەرو ئازاو خۆڕاگربوو، ئەو گۆرانیە شۆڕشگێڕانەیەی نوسیبوو تا بە چەند هاوڕێیەکی لەبەر کاو بیڵێ بە دەنگە خۆشەکەی و ئەوان بیڵێنەوە، ئەوان لە کۆڕەکاندا رۆڵێکی باشی لەم بوارەدا ئەبینی و بووبووە پێشەنگی هونەرمەندانی معسکەرەکە، دووەمیان کوڕێکی عەرەبی خەڵکی دەوروبەری بغداد بوو بە ناوی سید نور، ئەویش دەستی هونەری هەبوو، هەندێکیش دەنگی خۆش بوو ئەیویست ئەو گۆرانیە شۆڕشگێڕیانە بە دەنگی خۆی بڵێت، بەڵام یەك وەرەقەی لا گیراو هی ئەویان لە گیرفانی بە وردکراوی دەرهێنا.

ئەم دو.نە چەند هەفتەیەك لە بەندیخانەی معسکر مانەوەو دران بە دادگاو هەریەکە چوار ساڵ حوکم دران و رەوانەی نوگرە سلمان کران، هەتا لای ئێمە بوون زۆر خزمەتمان کردن و ئاگامان لێیان بوو، چەند جارێکیش پیلانمان دانا بۆ راکردنیان بەڵام تیا سەرکەوتوو نەبوون، دوا جار بە پەلە لە ئێمەیان دوور خستنەوەو رەوانەی نوگرە سەلمانیان کردن، وا بزانم لە شۆڕشی ١٤ی تەمووزدا هەردووکیان بەربوون، چەند کەرەتێك سید نورم ئەبینی لە بغداد هەر خەریکی کاری هونەری بوو، کاك (مصطفی عبدالرحمن)یش هەموو کات لە سلێمانی پێکەوە بووین و تێکۆشەرێکی باشی حزبی شیوعی بوو، هەر لەو پشکنینەدا بەشێکی زۆری وێنە دەستکردەکانی خالد سعیدیش گیرا کە لەگەڵماندا سەرباز بوو، ئەویش قوتابی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بغدا بوو بە راستی هەندێ وێنەی شعبیەی دروست کردبوو، وەکو قاوشەکان و ئیش کردنمان و نان خواردنمان و مەشق کردنمان کە وێنەی کەم بوو لە رووی هەنەریەوە، بێجگە لە رووبەری معسکرو چاڵو

چۆڵو بیابانەکەی لەگەڵ وێنەی زۆربەی برادەران لە کاتی ئیش و نان خواردنو قسەکردندا، هەروەها لەگەڵ وێنەی ئەفسەرو پاسەوانەکانیشدا، زۆر بایەخیان پێ داو هەموویان لێ داگیرکردو بردیان بۆ خۆیان بێ ئەوەی ئازاری خالد بدەن.

دوای گرتنی ئەو دوو برادەرەو پشکنینی قاوشەکەمان کەوتینە خۆمان بۆ زیاتر بایەخدان بە نهێنی ئیشەکانمان، هەرچەندە ئەوان هەر وازیان نەئەهێناو زیاتر ئێمەیان ئەخستە ژێر چاودێرییەوە بە تایبەتی پاکانەمان پێ بکەن، بە ناوی ئەوەوە هەر کەس پاکانە بکات بەری بدەن.

## پاکانە وەرگرتن

ئەم پیلانەی پاکانە وەرگرتن داود جەنابی خستیە سەرشانی خۆی بە یارمەتی عریف رحیم کە دڕندەترین کەس بوو لە معسکر لە هیچ نەئەگەڕایەوە بەرامبەرمانی بکات، بۆ ئەم مەبەستە کەوتنە بەستنی پەیوەندی بە برادەرانمانەوە بە تایبەتی ئەوانەی لێیان رائەبینین بە دەم داواکانیانەوە ئەچنو بێ وەرەن بە تایبەتی توانیان هەندێك هەڵ بخەڵەتێنن بە تایبەتی برادەرانی عەرەبو شەش حەوتێکیش لە برادەرانی کورد، بە راستی ئەمانە هیچیان حزبی نەبوون، نە شیوعی، نە پارتیو نە نەتەوەیی عەرەب، هەر یەکەی بە چەشنێ گیرابوونو لەگەڵماندا بوون، جا کە زانیان هیچیان بۆ نەکراوەو سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە هەموو لایەك بەربەرەکانیان ئەکات، رۆڵی خۆیان گۆڕیو زیاتر گوشاریان خستە سەرمان چونکە باش ئەیانزانی ئەوانەی بەربەرەکانی ئەم پاکانەیە ئەکەن تەنها شیوعیەکان نین، بەڵکو هەموو برادەران بەرەنگاریان ئەکردو زۆر باش هەموو لایەکیان ئەناسیو جیایان ئەکردینەوە بە پێی بیروباوەڕمان ئەمەش زۆر رقی هەڵساندبوونو شێت گیر بووبوون، ئەیانویست بە هەر جۆرێك بێ سەرکەوتن بەدەست بێنن، بۆیە ئەمە

وای کرد بە گورجی رووبەڕوومان ببنەوەو بە کۆمەڵ لەگەڵماندا کۆببنەوەو قسەمان بۆ بکەن، بڕیاریان دا ئێوارەیەك کۆبوونەوەکە ساز بکرێت و هەموو ئامادەبین، داود جنابی بە خۆی و کۆمەڵێ کاغەزەوە لە بەردەمماندا قیت بۆوە، عەریف رحیم لە تەنیشتییەوە بە دەموچاوێکی ترشاوی گرژو مۆنەوە، بە رق و قینێکی بێ هاوتاوە، بە خۆ ئامادەکردنێکی تەواوەوە کە کۆتایی بە کێشەکە بێنێ کەوتە قسەکردن، هەروەکو پیشەی خۆی پێشەکی هێرشێکی گەورەی کردە سەر حزبی شیوعی بەوەی کە حزبێکی بە کرێ گیراو کافرە، هەرکەس لەو حزبەدا بێت خائنی خاکەکەیەتی پێویستە لە سێدارە بدرێ یا وڵات بەجێ بهێڵێ و زۆر شتی تری لە دەم بەربۆوەو تا ئەهات توندوتیژتر ئەبوو، دوایی هاتە سەر کامل جادرچی کە چەند پیاوێکی خراپ و سەر لێ شێواوە تاوانە خەڵکی دوای بکەوێ و خۆی بە کوشت بدات و ئەویش وەك پاشا بژی و لە دوورەوە سەیریان بکات، ئەوەندە رقی لە کامل جادرچی ئەبۆوە نەیئەزانی چۆنی دەربڕێ و بە چ جۆرێ هەڵی بڕێژێ، بێجگە لەمانە نەتەوەیی‌یەکان و جمال عبدالناصریشی خستە بەرهێرشی دڕندانەی، دوایی هاتە سەر ئێمە کە چۆن بە قسەی کەسوکارمان ناکەین و ئەوانمان خستوەتە کێشەیەکی گەورەوە لە جیاتی ئەوەی یاریدەیان بدەین و بیان حەسێنینەوە، هێرشێکی زۆریشی کردە سەر مصطفی بارزانی و خۆ دوورخستنەوەی بۆ یەکێتی شورەوی و هەڵخەڵەتاندنی ئێمە، هەرچیەك بەسەر دەمیدا هات وتی و کەسی نەپاراست و زۆر لەسەری رۆی تا هەڵسایە سەر پێ و نەڕانی و وتی ئێستا پێم بڵێن کێ پاکانە ئەکات با بێتە ئەملاوە، ئەوەی رەتی دەکاتەوە لە جێی خۆی بمێنێتەوە، هەر هەموو لە جێی خۆی بێ چرکە مایەوەو ورتەی لە دەم دەر نەهات و نەجووڵا بەوانەشەوە کە چەند رۆژێ لەوەوبەر پاکانەیان بە نهێنی لە بەردەمی خۆیدا کردبوو، دیسان کەوتەوە هێرش بردن و نەڕەنەڕو وتی هەرکەسێك پەشیمان بێتەوە لە بەڵێنی خۆی لەوانە خراپترە کە پاکانە ناکەن خۆیان بۆ سزا ئامادەکەن، لەمەدا چەند کەسێك چوونە ئەولاوەو ئامادەیی خۆیان

دووباره کردەوه به ئاشکرا، جا به ناو رووی کرده چەند برادەرێکی عەرەب‌و کەوته وتووێژی رووبەڕوو لەگەڵیانداو وتی ئێوه ئیسلام‌و عەرەبن لەم کارەدا بۆ خۆتان ئەدۆڕێنن پێویسته رێگەی راست بگرن‌و زۆر شتی تری وت، هەر هەموویان بەرپەرچیان دایەوه‌و داکۆکیان له خۆیان کرد لەوانه أحمد عبدالحمیدو ضیاء عگیلی‌و کاظم حبیب‌و هەندێکی که، دوایی نۆره هاته سەر ئێمه‌و یەکەمجار عەبه عفریتی هەڵسان‌و وتی باشه تۆ بەم لەش‌و لارەوه، بەم بێ حەوسەڵەییەتەوه ئیشت چی‌یه لێره! بەرگەی ئەم ئێش‌و ئازارو هیلاکیه بۆ ئەگری، بۆ خۆت رزگار ناکەیت، ئەویش له وەرامدا وتی من کوڕێکی هەژارم له سیاسەت هەر نازانم ئێرەم باشتره تا سەربازی تەواو ئەکەم هەرچۆنێ بێت ئەژیم، پۆلیسی هەڵەبجه قینی لێم بووه‌و هێناومی بۆ ئێره‌و پەیوەندیم به هیچ حزبێکەوه نی‌یه بۆ به خۆڕایی خۆم بکەم به خاوەنی شتێ که هی من نەبێت‌و ناوم بخەمه ناوناوانەوه، ئەیویست پێی بسەلمێنێ که هیچ نی‌یه! داود پێی وت باشه تۆ لای ئێمه ناوت عبدالله محمده ئەی ئەم عفریتە چی‌یه که ئەهلی هەڵەبجه ناویان لێناوی؟ وتی باوکم لەبەر قەڵەوی ئەمەی پێ ئەوتم، وتی ئەی کێ بوو له خۆپیشاندانەکاندا نیازی کوشتنی یەك دوو پۆلیسی هەبوو به کوتەکێکەوه له پێشەوه ئەڕۆیشتی؟ ئەی کێ بوو له بەغدا له پیمانگای هونەره‌جوانەکان بووبووه پێشڕەوی قوتابیان‌و زۆر شتی کەش، ئەمه چەند رۆژێکه فایلەکەت گەیشتووه، ئێسته هەموو شتێ له تۆ ئەزانین، ئەمه چەند مانگێکه ئێمەت بەم هەژاری‌و بێ دەنگیه هەڵخەڵەتاندووه، تۆ پیاوێکی ترسناك‌و خراپی بۆ ئەم رژێمه ئەبێ سزای قورس بدرێیت تا بچیته پاڵ یاساو پاکانه بکەیت، عەبه به تەواوەتی دەستی کەوته روو بۆیه نەختێ لەسەر خۆ قسەی کردو دەستی راوەشان، بەڵام کەڵکی نەبوو، که زانی گوێی لێ ناگرن هاواری کردو وتی بەڵێ هەر ئەوەم چی ئەکەن بیکەن من شەرەفی خۆم‌و میللەتەکەم له هەموو شتێ خۆشتر ئەوێ، داود جەنابی بەمه تێك چوو دەستی دا به مێزەکەداو وتی بەسه بەس لەوه زیاتر قسه مەکه چارت ئەکەین، عەبدولی

سورانی هەڵسان‌و وتی شێخ تۆ چی ئەڵێیت، چونکە هەردەم عەبدولمان لە ناوەڕاستی خۆماندا دائەناو قسەی بۆ ئەکردین پێیان ئەوت سید یعنی گەورەو شێخی ئێمە عەبدول بە عەرەبیە شەق‌و شڕەکەی خۆی تێ‌ی گەیاند کە ئەم پەیوەندی بەم شتانەوە نی‌یە، کردیە پێکەنین‌و وتی من خواردن‌و ئیسراحەتم هەبێت گوێ نادەمە ئەم شتانە، ئێستاش ئێرەم پێ خۆش‌و باشترە لە دەرەوە، بۆیە نامەوێ دەرچم، ئەمە نەختێ دانیشتنەکەی گۆڕی‌و بووە پێکەنین‌و جموجوڵ‌و بە خۆدا هاتنەوە، هەندێ برادەری کەی هەستان هەڕەشەی لێ کردن‌و هەر هەموویان بەرەنگاری بوونەوەو نەیتوانی هیچ سوودێك وەرگرێ چەند کەسێکی کەی هەستان‌و هەڕەشەی لێ کردن‌و هاواری کردە عەریف رحیم‌و جمعەی کاتب ناویان بنوسێ‌و بەیانی بیانبات بۆ لای خۆی، نۆرە هاتە سەر من وتی عبدالقادر (لە دەفتەر خدمەدا ناوم وا هاتووە) هەستە تۆ ئەڵێیت چی؟ منیش بە شێنەیی‌و لەسەرخۆ کەوتمە قسەکردن‌و وتم من هیچ نیم‌و پەیوەندیم بەم چەشنە شتانەوە نی‌یەو یەکێکیش کە بوو بە سەرباز بە وردی/رەچاو بکات‌و لێی دەر نەچێت، چونکە کاتێکی دیاری کراوەو تەواو ئەبێت، داود کەوتە پێکەنینێکی سەیرو بە دەست راوەشاندنەوە وتی بەخوا چاك تێگەیشتووی، باشە هەژارێکی وەك تۆیان بۆ هێناوە؟ هیچ شتێ لەم دنیایە نازانی گوناهیان کردووە تۆیان گرتووە، دیارە لێیان تێکچووە، منیش هەرچەندە باوەڕم بەو قسانە نەبوو بەڵام نەختێ دڵخۆشی کردم وا بە نەرمی لەگەڵمدا ئەدوا، لەپڕ پرسیارێکی سەیری لێ کردم‌و وتی باشە تۆ ناوێکی کەت هەیە! نازناوت چی‌یە؟ وتم نەخێر جەناب ئەوە دەفتەری خدمەکەم، هەستایە سەر پێ‌و بە دەنگێکی بەرز وتی کەواتە یەکێکی کەیان بۆ ئێمە ناردووە؟ قادری میرزا کەریم لە دەرەوە هەر خەریکی سیاسەتی خۆیەتی‌و کاکە تۆ ئێمە هەڵئەخەڵەتێنی ئەوە فایلەکەتە لە ژێر دەستما تۆ لە ساڵی ١٩٤٨ەوە شیوعیت، خۆتو براو کەسوکارت ئاسایشی وڵاتتان تێك داوە، بە دەیان جار گیراوی، ئاسایش لە سلێمانی بەرکەماڵە کە تۆ لەوێ نیت، ئەمانە

نوسراوە قسەی من نی‌یە، ئیتر خۆت بۆ حەشارداوە، راستە لێرە هیچ ناکەیت‌و دەنگت نی‌یە، بەڵام ئەمە سیاسەتی حزبەکەتانە، ئێستا ئەلێی چی؟ فایلەکەت ئەدرێنم‌و بێ دەنگ ئەبین لێت ئیمزامان بۆ بکە، بە راستی کەوتمە هەڵوێستێکی سەیرەوە، تازە ئاشکرا بووم‌و لە دەستیان دەرناچم، هەموو برادەران واقیان ورمابوو کە بەو چەشنە لەسەرم نووسرابوو، هەرچەندە زیاتریان لێم ئەزانی بۆیە زۆر بە وردی پارێزگاری‌یان ئەکردم، بەڵام وا هەمووی بە پوختی هاتە بەردەمی دوژمن هەموان بە چاویان‌و سەیرکردنیان داوای هەڵوێستیان لێ ئەکردم‌و ئەیانویست شتێ دەربڕم‌و خۆم رزگار بکەم‌و ببێتە شانازی بۆ هەموو لایەك، منیش هەندێك وەستام‌و بە زوویی بە خۆمدا چوومەوە، نەزانینی عەرەبیش بە تەواوی بووە سەنگەرم کە نەکەوتمە ململانێیەکی قووڵەوە لەگەڵیان، زۆر بە شێنەیی وتم ئەمانە هەمووی درۆن‌و بۆم هەڵبەستراون‌و داوای پارەمان لێ ئەکەن، بۆیە هەرچەندە گیرابم هیچم لەسەر نەبووە، وەکو لێرەش خۆتان ئاگادارن کابرایەکەم هیچتان لەسەرم نی‌یە، بە ئیشی خۆم بە پێی یاسا هەڵئەستم، بۆ پاکانەش وەکو لە مەلەفەکەمدا ئەمانەم لەسەر نووسراوە بۆم دروست کراوە، ئیمکان نی‌یە بتوانن بە هیچ جۆرێ شتێکم بەسەردا بسەپێنن کە خۆم باوەڕم پێی نەبێت‌و ببێتە عار بەسەرمەوە، داود جەنابی هەستایە سەر پێ‌و دەستی کردە هەڕەشەکردن‌و توڕە بوون‌و وتی ئێرە بەندیخانەکانی سلێمانی نی‌یە لە ژێر دارا ئەتان رزێنین‌و دەرەوە نابیننەوە، جا بە رێکەوت دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ لە سلێمانی برادەرانی ئێمەیان کە ئەوسا پارتی بووین لە مقاومە شعبی وەرنەگرت‌و زۆر ئازاریان ئەدایین‌و بە چەندان شتیان بۆ دروست ئەکردین لە لایەن برادەرانی حزبی شیوعی‌یەوە کە ئەیان ویست تەنها خۆیان بەو ئیشە هەستن‌و قورخی خۆیان بێت، ئێمەش لەباتی ئەوەی بکەوینە شەڕو ئاژاوە لەگەڵیان، هەستاین وەفدێکمان دروست کرد بۆ بەغدا بۆ بینینی طه بامرنی کە ئامر هێزی مقاومەی شەعبی بوو، وەفدەکە بریتی بوو لە من‌و حلمی علی

شریف و صالح دیلان، لەوێ چووین بۆ بینینی طه بامرنی کە چووینە ژوورەوە ئەم داود جەنابیە لە پشتیەوە وەستا بوو مرافقی تایبەتی بوو، یەکسەر بەرەو رووم هات دەستی کردە ملم و ماچی کردم و بە دەنگێکی بەرز وتی ئەم برادەرە ئەناسم سەرباز بوو لە لام لە شعیبە، کوڕێکی ئازاو لێهاتوو بوو سەری بۆ هیچ شتێ نزم نە ئەکرد، منیش بێ گوێدانە ئیشەکەی خۆمان کە بۆی هاتبووین، وتم بەڵێ بێ گوێدانە هەڕەشەکانی تۆو سزاکانتان، زور لەسەر مەسەلەکە نەڕۆیشتم چونکە جێگەی ئەوە نەبوو، بەڵام وتم هەموو برادەرانی شعیبە کۆبووینەتەوە شکاتمان لە محجوب کردووە، ئیتر ئەو هیچی نەوت و قسەمان دایە دەست کاک حلمی و پێی وتن بردارانمان لەو ئیشە پیرۆزەدا وەرناگرن و ئەبێت هەوڵ بدرێت ئێمەو خەڵککانی وەکو ئێمە لە مقاوەمەی شعبی دوور نەخرێتەوەو رۆژانی پێشوومان لەبیر خۆیان نەبەنەوە، زۆر لەگەڵ طه بامرنی وتووێژمان کرد لەم بارەیەوەو بەسەرسامیەوە هەواڵی ئێمەو برادەرانمانی وەرگرت و نامەیەکی داینێ بۆ سلێمانی کە پێویستە ئەندامانی (پ.د.ك) بە شانازیەوە لەم کارە نیشتمانیەدا وەربگیرێن، چونکە ئەمانە خاوەن رابوردوویەکی پاکن و بەرگری لە کۆمارو عبدالکریم قاسم ئەکەن و پاش چەند مانگێك داود جنابی هات بۆ سلێمانی لەگەڵ ئەفسەرکانی کلیەی أرکان، ئێمە لەگەڵ عەبە عفریت و عەبدولی سۆران و حسینی مەلا حەکیم و مصطفی عبدالرحمن و جەزای میرزا حسین و بهاء الدین کابان و زۆر برادەری کە پێشوازیەکی ئاساییمان کردو لەگەڵ برادەرەکانیدا بە یەکتری ناساندین زۆر ستایشی رابوردوومانی کرد لە شعیبە، هەر ئەم داود جنابیە بوو کە لە کودەتاکەی ١٩٦٣ی بەعسی بە خۆی و چەند دەبابەیەکەوە بەرەو بەغدا هاتووو کەوتە کوشتن و بڕینی خەڵکی و بووە بەرزترین ئەفسەر لە ناو بەعسیەکاندا، هەر ئەمیش بوو لە کودەتاکەی عبدالسلام عارفدا دژی بەعسیەکان هەڵمەتی بردە سەر قیادەی قطری و بۆردومانی کردن و کەوتە کوشتن و بڕینیان، ئیتر نازانم چی تری کردووە دوای ئەمانە؟.. لەو

کۆبوونەوەیەدا هیچی تازەیان دەست نەکەوت و ئەوانەی ئیمزاشیان کردبوو هەر لەگەڵ ئێمەدا مانەوە، هەرچەندی بەشێك لە هاوڕێیان ئەیانویست هەڵوێستێکی توندو تیژمان هەبێت بەرامبەریان، بەڵام بڕیاری ئێمە ئەوە بوو کە ئەبێت هەروەکو جاران ڕێزیان لێ بگرین و بە کەم سەیریان نەکەین بۆ ئەوەی لەوە زیاتر نەڕوخێن، هەر چەندە هیچ کەسێك لەوانە لامان ئەندام یا پاڵێوراو نەبوو، هەموو لایەنگرمان بوون ،ئێمەش بە راستی توانیمان سەرکەوتوو بین و ئیشەکانمان بە باشی ڕێك بخەین و برادەرانمان لە کیس نەچێت و ئەوانەی کەش بگەڕێنەوە لامان.

## چاك بوونی گوزەرانمان

داوای ئەم ڕرووداوانە وردەوردە گوزەرانمان چاك بوو، دەنگ و باس ئەوەی ئەگەیان کە خەریکە دەرچین و ڕژێم نیازێکی وای هەبوو، کاریان بەرامبەرمان چاك بوو، هەندێ جلی تازەی ئەمریکیمان بۆ هات و خواردنەکەمان چاك بوو، یەك دوو حانوتی دەوڵەمەندو پڕ لە کەلوپەلمان بۆ کرایەوە، لەگەڵ ئەمانەشدا ڕێگەمان پێ درا ڕۆژانی هەینی دابەزین بۆ بصرەو بە دڵی خۆمان شت و مەك بکڕین و بیهێنینەوە بۆ معسکر، سەرەڕای ئەم شتە باشانە ئامر سریە چەپەڵەکەمان گوێزرایەوە ڕزگارمان بوو لە دەستی، داود سمعان هاتە جێگای کە پیاوێکی باش و لەسەرخۆو نوکتەباز بوو هەردەم لە ناوماندا بوو، قسەی خۆشی بۆ ئەکردین و چەند جارێك داوای بەربوونی بۆ کردین، هەرچەندە ئەمە خەتی ڕژێم بوو ئەبوایە وای بکردایە، بەڵکو خۆشی دەورێکی باشی هەبوو لەمەسەلەکەداو بەرهەڵستی ئەم هەڵوێستەی نە ئەکردو تەگەرەی لە بەردەمدا دانەئەناو زیاتر ڕێگەی بۆ ساز ئەکرد، ئێمەش نەختێ خۆمان بۆ ئامادە کردو زیاتر پەلەقاژێمان ئەکرد بۆ چاککردنی ژیانمان و نزیك بوونەوەی دەرچوونمان، هەندێ جار بیرخستنەوەمان ئەدانێ و وتووێژمان لەم بارەیەوە لەگەڵیان ئەکرد، تا کەرەتێك ئامر سریە پێی ڕاگەیاندین کە رئیس

ئەركان غازی داغستانی و رفیق عارف دێن بۆ سەردانتان چیتان هەیە لەگەڵیاندا باسی بكەن، بە یەك یەكو وەك سەربازێكی ئاسایی و راست خۆتان پیشان بدەن، معسكر پاكو تەمیز راگرن، یەك دەنك پیسایی نەمێنێ و قیافەتتان رێكو پێك، تەدریبو رێكخستننتان چاك بێت، چەند جارێك ئەم ئامۆژگاریانەی بۆ دووبارەو سێ بارە كردینەوەو زۆر بایەخی پێ ئەدا، چەند رۆژێ پێش هاتنیان پەتۆی نوێو جلی رێكو پێكو صابونی زۆرو پۆلیشی باشیان دابەش كرد بەسەرماندا بۆ خۆ ئامادەكردنو پێشوازی غازی داغستانو رفیق عارف، رۆژێك سەرلەبەیانی زوو بۆقی لێدراو داوای كۆبوونەوەیان كرد لێمان، هەموو كۆبووینەوە لە ژێر فەرماندەی رئیس عرفا وەحدە كە ناوی بدع حجع بوو، كابرایەكی زلەی تێك سمڕاوی بێ سمێڵی هەمیشە ریش تاشراو بوو خۆی بە منداڵی چواردە ساڵان ئەزانی و هەردەم دەستی بە خۆیدا ئەهێناو خۆپەرست بوو، ئەو كاتەی لەگەڵ سەربازەكاندا ئەكەوتە گفتوگۆ جەڕنی بوو، دەستی بە سنگو مەچەكی خۆیدا ئەهێناو وەكو ئافرەت ئەجوڵایەوە، هەندێ لە سەربازەكان بووبوونە برادەری و پێیان رائەبوارد، گوایە پیاوێكی قۆزەو شان لە شانی هەموو كوڕە قۆزەكانی معسكر ئەدات، ئەمیش ئەمەی زۆر پێ خۆش بوو شانازی پێوە ئەكردو سەیرێكی بالای خۆی ئەكردو بزەیەكی لێوە ئەهات، هەرچەندە هەندێ توندو تیژی ئەنواندو سزای ئەدایەو ئەیكردە هاوار هاوارو دەنگە دەنگو ئەو رۆژەی لێ ئەكردینە جەهەننەم، بەڵام كە برادەرەكانی خزمیمان ئەناردە لای وەكو جواد شوربا و خزعل الالوسی و رووف حاجی و یەك دوو برادەری كە بە زوویی پەشیمان ئەبۆوەو ئەیوت برۆن خاتری ئێوە بێت لێتان خۆش ئەبم، هەرچەندە ئەو برادەرانە باشترین تێكۆشەرو خاوەن رەوشتێكی بەرز بوون، بەڵام بۆ پێكەنین ختوكەی هەستی بدع حجع ئەم كارەیان ئەكرد.

ئەم جارە كە هەموومانیان كۆ كردەوە زۆر بە دڵیان بووین، تەنها كە سەیری عەبدولی سۆرانیان كرد لەگەڵ حسینی حاجی ئەمین ئاگریان تێ چوو،

کەوتنە هاوار هاوار کە هەر ئێستە وەفدەکە ئەگەنە جێ و ئەمانیش نە جلیان جلەو نە ریشیان تاشیوەو نە قۆپچەو نطاقەکانیان پۆلش کردووە، قۆندەرەکانیان بێ بەستن کردووە بە سەرپێیانەوە بۆیە کەوتنە هەڵوێستێکی خراپەوە، بەم پەلە پەلە چیان لێ بکەن، هیچیان بۆ ناکرێ و ئەمانە خۆیان بۆ ئامادە ناکرێ ئەبێ چارەیەکیان بۆ بدۆزرێتەوە، هەر یەکەی چارەیەکی دان و بووە دەنگە دەنگ، کە ئامر هات زانی مەسەلەکە چی یەو بەم کاتە کەمە هیچیان بۆ ناکرێ، وتی بیان بەن لە قاوشێکی رووخاودا بیان شارنەوە ئەگەر بینیانن پێیان بڵێن ئەمانە کەناسن، سەیر لەوەدابوو ئەگەر ئەمە چەند مانگێك لەمەوبەر رووی بدایە هەردووکیان دارکاری ئەکردن، بەلام ئەمجارەیان بەم چەشنە شکایەوە، خۆیان زۆر باشیان ئەزانی ناتوانن عەبدولی سۆران و عەبە عفریت و حسینی حاجی ئەمین و هەندێکی کەش راهێنن و فێری گوێ رایەڵیان بکەن و بیانکەنە سەربازێکی تەواو، لەبەر ئەوە وازیان لێ هێنابوون چی ئەکەن بیکەن، بەلام ئەم جارەیان تووشی سزا ئەبوون گەر وەفدەکە بەم چەشنە رووبەڕوویان ببوونایەتەوە، کاتێ وەفدەکە گەیشتە ئێمە هەر هەمووومان بە رێك و پێکی بە پێی رەهط و فصیل بە ریز وەستابووین، ئەوانیش بە بەردەمماندا تێ ئەپەرین بێ ئەوەی یەکێکمان بپەرێنن، وتووێژیان لەگەڵدا کردین، سەرەتا خەڵکی کوێی، ناوت چی یە، چۆن گیراوی؟ چەند مانگە لێرەی؟ بۆچی تا ئێستا دەرنەچووی؟ دەرچووی چ قوتابخانەیەکی؟ ئەمەو زۆر پرسیاری کە تا هاتە سەر پرسیار لە گوزەرانمان و هەڵسوکەوتی ئەفسەرەکان لەگەڵماندا، ئەم هەموو شتانەیان لێ پرسین بێ ئەوەی بە لای پرسیارێکی سیاسیدا بچن، هەروەکو ئەیانەوێ بمان هەروژێنن ئەم دەرگایەمان بۆ نەکرێتەوە، بەلام ئێمە هەر هەمووومان داوای دەرچوونمان ئەکرد کە زۆرمان بەدەلمان دابوو تێمان گەیاندن خوێندنمان لەکیس چووە، ئەبێت بگەڕێینەوە سەر ئیشوکارو خوێندنی خۆمان، ئەوانیش بڕیاریان دا شتێکمان بۆ بکەن هەرچەندە کاتی ئیمزاکردنی پەیمانی بەغدا بوو، خۆپیشاندان و مانگرتن لە

دەرەوە زۆر بوو، ئەفسەرو سەربازەكان كۆمەڵی تایبەتی خۆیانیان پێك هێنابوو، بەڵام لەگەڵ ئێمەدا بەم چەشنە ئەجوڵانەوە، وا دیار بوو ئەیانویست كێشەیەك كەم كەنەوە باشترە بۆ خۆیان و رژێم.

ئەو رۆژەمان بەم چەشنە بردە سەر، ئەفسەرەكان زۆریان پێ خۆش بوو بەم كۆتاییە، چونكە هیچ شكاتێكمان لێ نەكردن، كە ئەمە بۆچوونی خۆمان بوو گەیشتبووینە ئەو ئاكامەی ئەمانە هەر هەموویان موچە خۆری رژێمن و وەكو یەك وان و ئەمەیە یاسای سەربازی، بۆیە پێویستە ئێمە جەخت بخەینە سەر ئەوەی كە دەرچین و خۆمان لە كێشەی لاوەكی دوور خەینەوە.

## ئاهەنگی رۆژی سوپا

دوای چەند رۆژێك پێمان راگەیەنرا هەر چیەكمان وتوە گەیەنراوەتە جێگەی خۆی و شتێكمان بۆ ئەكەن، هەر لەبەر ئەوە هەلێكی باش خوڵقا بۆمان و كەوتنینە پشویەكی باشەوە تا لەو كاتەدا رۆژێ پێمان راگەیەنرا بە بۆنەی جەژنی سوپاوە ئاهەنگێكی گەورە ساز ئەكرێت و كاولی ئەهێنن گۆرانیمان بۆ بڵێن و سەمامان بۆ بكەن و مافی ئەوەشمان هەیە دەست بازیان لەگەڵ بكەین، كاولی كۆمەڵێ ژن و كچ و منالی پیاوی بە تەمەنن بە یەكەوە ئەژیان وا دیار بوو بنەماڵەیەكیش بن ئیشوكاریان سازكردنی ئاهەنگ و كۆبوونەوەی سەما و گۆرانی بوو لە جێنشینی خۆیان، یان بانگیان ئەكردن بۆ جێكەیەكی كە، هەر هەموویان ئەبوایە ئیشیان بكردایە، پیاوەكانیان سەرپەرشتی ماڵ و نان و ئوتومبیل و ژیانی كۆمەڵەكەی ئەكرد، ژنە پیرەكانیان هەرچەندەش خۆیان ئەگۆڕی و دەموچاویان ئارایشت ئەكرد، بەڵام بە زۆری خەریكی چێشت لێنان و خزمەتی منالان ئەبوون، ژن و كچەكانیان هەر هەموویان خۆیان جوان ئەكردو جلی رەنگاورەنگیان لەبەر ئەكردو دەموچاویان ئارایشت ئەكردو بە چەشنێكی سەیر سەماو گۆرانی و هەڵپەركێ ئیشی ئەوان بوو، بێجگە خۆ لە باوەشكردنی سەیركەران و رابواردن لەگەڵیان،

کوڕە لاوەکانیشیان هەر بەم چەشنە قژیان درێژ ئەکردو دەموچاویان ئارایشت ئەکردو بەشداری هەموو سەماو گۆرانیەکانیان ئەکرد، زۆربەی عەرەبەکان ئەمەیان لا شەرم نەبوو هەردەم تێکەڵوویان ئەبوون‌و ئەکەوتنە سەماو هەڵپەڕکێ‌و گۆرانی وتن لەگەڵیانا، بێجگە لە توێژێکی خەڵك کە لایان ستەم بوو توخنیان بکەون، ئەوە لای ئێمە هەر شتێکی سەیرو سەمەرە بوو، ئێمە ئەم هەموو شتانەمان ئەزانی بۆیە بە هیچ جۆرێك نەمان ئەویست ئەو ئیشە سەر بگرێ‌و برادەرانمان تووشی ئەو جۆرە شتانە نەبێت‌و پارێزگاری خۆیان بکەن، هەرچەندە هەندێ برادەریش/بۆ ئەم شتانە لێی ئەدا، بەڵام دانیان بە خۆیاندا گرت‌و پەیڕەوی بۆچوونەکانی ئێمەیان کرد، هەر لەگەڵ ئەوەشدا تووشی کێشەیەکی گەورەی کردین کە بە هیچ جۆرێ نەئەبوو بچینە ژێر ئەو بڕیارەوەو ئەبێت بەرەنگاری بکەین بە شێوەیەك نەبێتە هۆی شکاندمان‌و سزادانمان، بۆیە بڕیارمان دا کۆمەڵێ نوێنەر بچێتە لای ئامر کە پێك هاتبوون لە برادەرانی کوردو ئەو برادەرە عەرەبانەی کە بە نوێژکەرو ڕۆژوگر ناویان دەرکرد بوو لای ئامرو ئەفسەرەکان، بە تایبەتی برادەرانی نەجەف‌و کەربەلا تا بتوانن دەورێکی باش ببینن‌و لەم ئاهەنگە دوورمان بخەنەوەو تووشی گێرمەو کێشە نەبین، سەرلەنوێ کۆبوونەوەیەکی نهێنیمان لەگەڵ ئەو برادەرانەدا ساز کردو بە کۆمەڵێ بۆچوونەوە بەرەو لای ئامرو ئەفسەرەکان ڕۆیشتن‌و کەوتنە گفتوگۆ لەگەڵیان‌و وتبوویان ئێمە بەم چەشنە حەز ناکەین یادی ڕۆژی سوپا بکەینەوە، چونکە سەربازەکان ئەمە چەند مانگە لە کەسوکارو ژن‌و منداڵیانەوە دوورن، هەروەها ئێمە وەکو ئیسلام بە شتێکی گوناهی ئەزانین‌و لای کورد شتی وەها نی‌یە شەرمەزاریەو زۆر شتی تر کە تا ڕادەیەك توندو تیژی ئەفسەرەکانی کەم کردەوە کە بە زۆری زۆرداری ئەیانویست ئەم ئاهەنگە داسەپێنن بەسەرماندا زۆر بە جوانی‌و ڕێك‌و پێکی مەسەلەکەمان لە سیاسەت دوور خستەوە، پێشنیاریان کرد ئەو پارەیەی ئەیدەن بەوان بۆ هەژارەکانی خۆمانی تەرخان بکەن، ئێمەش ئەو میوەو شیرینیەی بۆمان هاتووە لای

خۆمان لە ئاهەنگێکی سەماو گۆرانیدا دابەشی ئەکەین و ئەم ڕۆژە بە خۆشیەوە یاد ئەکەینەوە و ئەیکەینە جەژنێکی ڕاستەقینە، ئەمەیان تا ڕادەیەك پێ خۆش بوو چونکە لە بنچینەدا ئەو ڕۆژەو یادەکەی وەلا نەخرا، کە وەکو بیروباوەڕو بۆچوونی ئێمە بە جەژنێکی خۆمان ئەزانی و سوپای عێراقمان بە ڕۆڵەی میللەت ئەزانی و ئەو ڕۆژەمان لەبەر چاو بوو کە ئەبێت ببنە پشتیوان و پشتگیری لە مافەکانی میللەت بکەن، سەرجەم سەربازو پلەکانی ژوورو تریشمان بە ڕۆڵەی چەوساوەی گەل ئەزانی و ڕێزو خۆشەویستیمان بۆیان هەبوو، ئەمە بیروباوەڕی حزب بوو بەرامبەر سوپا و سەربازەکان، هەر لەبەر ئەوە بڕیارمان دا ئێمە خۆمان ئاهەنگ بگێڕین، جا بۆ شەو زۆر بە وردی و لەسەرخۆ یادی ئەو ڕۆژەمان کردەوە بە گێڕانی ئاهەنگێکی قەشەنگ کە برادەران بە دەوری خۆیان هەستان لە سەماو گۆرانی و قسەی خۆش و میوەو شیرینی دابەش کردن، بەڵام هەموو گۆرانی و سەماکردنەکان تەعبیری لە بیری سیاسی و کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی شۆڕشگێڕی خۆمان ئەکردەوە بێ ئەوەی ئەفسەرە گێلەکان هیچمان لێ تێ بگەن.

ئەم کێشەیەشمان بەم چەشنە تێپەڕاندو هیچ ئازارێکمان بە دەستیەوە نەچێشت، بە پێچەوانەی بۆچوونی هەندێ برادەرەوە کە دەیانووت دەبێ مان بگرین و بیکەینە هەراو کۆنترۆڵی قاوشەکان بکەین و نەچینە دەرەوە بۆ دەرخستنی ناڕەزایی خۆمان لەم ڕۆژە، ئەمەش زۆر ئەکەوت لەسەرمان و لە بۆچوونی ئێمەشەوە دوور بوو.

## ڕێزگرتنی ئەهلی بصرە لێمان

ئەهلی بصرە ئێمەیان زۆر خۆش ئەویست، لە هەر لایەك بیانزانیایە قوتابیە سەربازەکانی شعیبەین ئەهاتن بە دەنگمانەوەو ململانێی ڕەگەز پەرستیان نە ئەزانی و سیاسەت و حزبایەتی نەشێوێنرابوو، کوردیان خۆش ئەویست و ڕێزی تایبەتیان لێ ئەگرتین، بە ڕاستی شیوعی یەکان ئەم دەورەیان

ئەبینی و میللەتیش چاوی لەوان ئەکردو بە بیرو بۆچوونەکانیان قایل بوون، لە هەر چێشتخانەیەك و چایخانەیەکدا دانیشتینایە ئەبووە کۆڕ بۆمان و دەورەیان ئەدایین و زۆر حەزیان ئەکرد لەگەڵمان بدوێن و بمان ناسن، زۆر سەیر بوو لەم کەشە خۆش و سەربەستیەدا جارێکیان من و چەند هاوڕێیەکم لە ناو بازاڕدا ئەگەڕاین بە جلی سەربازیەوە ئەبوایە کۆڵانێکی بچوکمان ببڕیایە بۆ بازاڕێکی کە، لە ناکاو دەوروبەرمان گیرا بە چەند سەربازێکی چەکدار، بووە هاوارو دەنگە دەنگ و پەلامارمان بە شێوەیەکی ناشیرین هەموومانیان دەست گیر کردو پێش خۆیانیان داین بۆ انضباط خانەو ئێمە زۆر ترساین وتمان شتێك روویداوەو گیراین، کەوتینە دانانی پلان و رێگەیەك بۆ رزگار بوونمان لەم کێشەیە، بەڵام هەر چەندمان کرد نەمان توانی بە خۆمانی بسەلمێنین و بتوانین بێ سزادانێکی قورس دەرچین، چونکە بە چەشنێ لەم لاولاوە سەیریان ئەکردین کە شتێکی گەورەمان لێ قەوماوە، بەم رەنگە گیراین و مامەڵەمان لەگەڵ ئەکەن، هەرچۆنێ بوو گەیشتینە جێگەی دیاری کراو بۆمان، براینە بەردەم ئەفسەرێکی گەورە، لێمان راپەڕی و وتی ئێوە یاسای سەربازیتان شکاندووەو نەوی کردووە، بەم جۆرە ئەسوڕێنەوە بە شوێن ئافرەت و خراپەدا، هیچ نەبێ بە هێمنی ئەم لاو ئەولا بکەن، ئەم جێگەیەی ئێوەی لێ گیراون قەدەغەیە بۆ هەموو لایەك بە تایبەتی سەرباز، ئێستا ئەتانکەمە بەندیخانەوەو سزای قورس ئەدرێن، ئێمە هەموو واقمان وڕما! ئەم کابرایە ئەڵێت چی و باسی چی ئەکات؟ جێگەی خراپی چی و ئافرەتی خراپی چی؟ ئێمە هەردەم بیرمان لەمە نەکردۆتەوە! بۆیە وتمان قوربان تۆ ئەڵێی چی؟ ئێمە ئەم شتانە نازانین بۆشی ناگەڕێین، ئێمە قوتابیە سەربازەکانی شعیبەین و شارەزا نین، هاتووین نەختێ دنیا بگەڕێین و بصرە ببینین، وامان زانی لەسەر کێشەی سەربازی گیراوین و هێناویانین بۆ ئێرە، ئێمە لەو شتانەوە دوورین، کابرا نەختێ شلەژاو بە خۆیدا چووەوەو وتی باسی هیچم بۆ مەکەن، دیارە سەربازەکانی ئێمە خەتایان کردووەو نەیان ناسیون ئەبێت لێمان ببورن کە بەم جۆرە لەگەڵتان جولاینەوە،

ئێمە بە هیچ جۆرێك ناهێڵین سەربازەکانمان لەو جێگەیە نزیك ببنەوە، هەموو بصراوێك ئەزانێ ئەوێ کوێیەو ناوی چییە؟ بڕۆن خواتان لەگەڵ و لێمان ببورن و ئاگاداری خۆتان، جا ئێمەش بە خۆشی خۆشی گەڕاینەوە بازاڕو چووینە چایخانەکەی بەرامبەر چێشتخانەکەی زەینەڵ دانیشتین کە شوێنی کۆبوونەوەمان بوو بۆ یەکتر بینین و خۆ ئامادەکردنمان و گەڕانەوەمان بۆ معسکر.

ڕۆژێکی دابەزینی هەینیمان چووینە سینەما فلیمێکی خۆش بوو ئیشی ئەکرد، بیست سەربازێ ئەبووین لە پێشەوە جێگەمان گرتبوو، نیو سەعاتێکی مابوو فیلم ئیش بکات، لە بەرچاوی خەڵکەکە هەرچی شتێ بهاتایە لە خواردن و خواردنەوە لە ئێمە دەرنەئەچوو، ئەبوایە هیچمان نەپەڕاندایەو بمانگرپایە، کە ئەمەش شتێکی سروشتی نەبوو سەربازی ئەو کاتە بەم شێوەیە بژی، لەبەر کەم پارەیی و بێ دەرامەتی سەرنجی دانیشتوانی ڕاکێشابوو بۆمان، پێش فیلمەکە سەلامی مەلەکی لێ ئەدرا، ئەبوایە هەموو کەس هەستایەتە سەرپێ لە کاتی پیشاندانی وێنەی مەلیك و ئاڵای عێراقدا، ئەمە بووە یاسایەکی گشتی لەو ساڵانەدا، جا ئێمە کە ئەو چەند ریزەمان داگیر کردبوو کەس نەجوڵا و چرکەی نەکرد هەروەکو هیچمان نەدیبێ، ئەمەش بووە هۆی سەرسوڕمانی دانیشتوانی سینەماکەو سنگ دەرپەڕاندنی ئێمەش لەو کارەی بەجێمان هێنا، هەرچەندە ئەوە شتێکی باش نەبوو لە لایەن ئێمەوە، بەڵام لە خۆبایی بوون و خۆ بەزل زانینی و ڕۆحی بەربەرەکانی ئەو هەڵوێستەی پێ وەرگرتین.

باوکم هەموو سەری مانگێ ئەهات بۆ لای من و جەلالی برام و هەموو برادەرانی خەڵکی سلێمانی بەسەر ئەکردەوە، هەموو جارێ لەگەڵ خۆیدا گوێزو هەنگوین و بادام و قاورمەی بۆ ئەهێنایین و بەشی چەند ڕۆژێکی ئەکردین (قاورمە.. کاتێ مجمدەو سەلاجە نەبوو زۆر ماڵ ئەهات گۆشتێکی نەرمەی مەڕ یا گاو مانگایان ورد ئەکرو لە ناو ڕۆنێکی زۆرو دوگەکەی خۆیدا سووریان ئەکردەوەو خوێیان پێوە ئەکردو هەر بە ڕۆنەکەوە ئەمەیی و هەڵیان ئەگرت و بە

هیچ جۆرێ خراپ نە ئەبوو بە درێژی زستان لێیان ئەخواردو زۆر جار لە ناو کوپەو دیزەدا یا لە مەنجەڵدا ئەیان پاراست، ئەمە بۆ هەموو خواردنێ بەکاریان ئەهێنا، بەڵام ئەوەی کە بەناوبانگ بێت ئەوە بوو لەگەڵ هێلکەو پیازو نەختێ سیردا دیسان سووریان ئەکردەوەو خواردنێکی نایابی لێ دروست ئەکرا، زۆربەی ماڵەکانی سلێمانی ئەمەیان ئەکرد، ئەو رۆژەی ئاژەڵەکانیان سەر ئەبڕی بۆ ئەم مەبەستە شەو ئەکرایە ئاهەنگ و گۆرانی و وتووێژو قسەی خۆش تا بەیانی و ژنان ئیشیان ئەکردو پیاوان و لاوان خەریکی ئەم بەزمە بوون، لەگەڵ قسەو گۆرانی وتندا ئێسقان و وردە گۆشتەکەی ئەکرا بە تشریب و هەندێکیش لەسەر پشکۆی ئاگر ئەبرژێنرا، هەندێکیشی ئەنێردرا بۆ ماڵە هەژارو دراوسێکان، ماڵانی دووری ناسیاویش، لە خزم بێ بەش نەئەکرا، ورگ و سەروپێکەشی بۆ بەیانی ئەکرایە گیپەو سەروپێ و بە کۆمەڵ دوای ئەو هیلاك بوون و شەونخونیە ئەخورا، پێستەکەشی ئەگەر توکن و جوان بوایە بە تایبەتی هی مەڕ ئەوە پاك و خاوێن ئەکرایەوەو خۆش نەکراو ئەکرایە راخەر یا بە دیواری ماڵەکەدا هەڵئەواسرا، لای ئێمە لە گەڕەکی سەرشەقام حەمە صالحی عەزەی مەمەند بەم کارە هەڵئەستا، سەربڕینی ئاژەڵەکەش لەگەڵ کوت کوت کردنی گۆشتەکە هەموو جار عەبە قوەت ئەیخستە سەر شانی خۆی کە وەستایەکی زاناو لێهاتووی گەڕەکەکەمان بوو، باجی خانمی خێزانی حاجی فتاح راوێژکەرو قسەخۆش و حیکایەت خوانی دانیشتنەکان بوو کە بە خزمایەتی ئەگەیشت بە ئێمەو هیچ شتێ نە ئەکرا بێ ئەو).

جارێ لە جارەکان کە باوکم هات بۆ لامان من و جەلالی برام و چەند برادەرێکی برد بۆ بصرە کە لەگەڵیا بین، ئێمەش کەوتینە دوای بۆ ئەم چێشتخانەو ئەو چایخانەو باخی گشتی و جێگە ناسراوەکانی و دانیشتن بە کۆمەڵ و نان خواردن و میوە خواردن هەروەکو لە سەیرانێك بین رۆژێکی خۆشمان بردە سەر، بەڵام کاتێ باوکم چوو بۆ نوێژ لە مزگەوت چاکەتەکەی هەڵئەواسێ چی پارەو پولی پێ ئەبێت هەمووی لە گیرفانی دەرئەهێنن هەر لە

دوورەوە وتی چی پارەم پێ بوو هەموویان لێ دزیم لەم غەریبییە چی بکەم‌و ئێوەش چۆن ئەبێت بێ پارە بن، ئێمە ئەوەندەمان لە دەست هات چووین بۆ پۆلیس خانە شکاتمان کرد، معاونێکی کوردی لێ بوو زۆر بە تەنگمانەوە هات، لەگەڵ ئەوەشدا پۆلیسەکانی بەر دەستیشی پێ بە پێی ئەو هەڵسوکەوتیان ئەکرد، بە پەلە کەوتە لێکۆڵینەوەی دزیەکە، هەر بە زوویی کەوتنە هەڵمەت بردن چی دزی ئەو ناوچەیە هەبوو گیران، گرتوخانەکە پڕ کرا، کەوتنە لێدان‌و توێژینەوە لەگەڵیان، بە لێدان‌و گوشار خستنە سەریان هیچ سوودێکی نەبوو، کەسیان نەئەچوونە ژێری‌و دانیان پیادا نەئەنا کە دزیان کرد بێت، کات درەنگ بوو ئەبوایە ئێمە بڕۆینەوە بۆ معسکر، لە لایەکی کەوە نەئەبوایە باوکم بەو چەشنە بەجێ بهێڵین، هەموو برادەران خۆیان ئامادە کرد لەگەڵ باوکمدا بمێننەوەو نەچنەوە بۆ معسکر، بەڵام ئێمە ڕێگەمان پێ نەدان، تەنها من‌و جەلابی برام‌و کوڕێکی بصراوی کە ناوی غازی معارج بووماینەوەو چووینە ماڵی ئەوان، شەو خزمەتێکی باشیان کردین داوایان کرد یارمەتیمان بدەن، بەڵام ئێمە قبوڵمان نەکرد چونکە هەندێ پارەمان پێ بوو کە ئیشی باوکمی جێبەجێ کرد، بەیانی زوو گەیشتینە لای معاونەکە دەرکەوت هیچیان بۆ نەکراوە هەر لێکۆڵینەوە بەردەوامە بۆیە باوکم داوای کرد هەموو بەندیەکان ئازاد کرێن‌و ئێمە هیچمان لەسەریان نی‌یە، زۆر سوپاسی معاون‌و ئەفسەرەکانمان کردو ئەوێمان بەجێ هێشت، هاتین بۆ ناو بازاڕ باوکم ڕەوانە بکەینەوە پارەیەکی کەممان بۆ جێبەجێ کرد تا بگاتە بەغداد، لەبەر پارەکەی نا، زیاتر لەبەر ئەوەی پارەی نی‌یە بیدات بە ئێمە، هەرچەندە دڵمان ئەدایەوە کەڵکی نەبوو، جا لەبەر ئەوەی غازی لەگەڵماندا بوو هەندێ قسەمان بە عەرەبی کرد، وا ڕێکەوت لەبەر دوکانێکدا بووین‌و هەڵوێستەیەکمان کرد، کابرای دوکاندار لێمان دەرپەڕیە دەرەوە بێ ئەوەی بزانین کێ‌یە یا ئەو ئێمە بناسێ بە زۆر ئێمەی بردە ژوورەوە، ساردی بۆ بانگ کردین‌و ڕێزێکی تایبەتی لێ گرتین‌و وتی کێشەتان چی‌یە؟ لە کێشەکەمان گەیشت‌و زۆر بە پیاوانەو ئینسانانە

هاتە دەستو وتی ئێوە میوانی ئێمەنو لە ناو میللەتی خۆتانا ئەژین، لێرە لە کوردو خەڵکی سلێمانی زۆرمان لێ بیستون لە ئازایەتیو پیاوەتیو نیشتمان پەروەریتی، ئێستاش شانازی بە ئێوەو کوڕەکانتانەوە ئەکەم کە لێرە سەربازن جێگەی ڕێزی ئێمەن، لەبەرئەوە دڵ لە دڵ نەدەن چیتان ئەوێت من ئامادەم، بۆ ئەوەی بارمتەیەك هەبێت لە بەیندا پارەیەکی زۆری دا بە باوکمو وتی ئەمە هانەوەی نییەو نایەتەوە بە ماڵمدا، زۆر بە دڵ سوپاسمان کردو هاتینە دەرێ، باوکم هەروەکو جاران کەوتە دابەشکردنی پارە بەسەرماندا و خەرج کردنی، ئێمەش تا ئیستگەی شەمەندەفەر بەڕێمان کردو گەڕاینەوە بۆ معسکر بە خۆمانو خواردنێکی زۆرەوە بۆ برادەران باسی ئەم خاڵەیەشمان لەگەڵ برادەرانی بصرەدا کرد، وتیان ڕاستە ئەم خاڵەیە ناوی حاجی حامدەو خەڵکی بەصرەیەو پیاوێکی باشی نیشتمان پەروەرەو کوردی زۆر خۆش ئەوێت بە تایبەتی ئەگەر نیشتمان پەروەرو خەڵکی سلێمانی بێت، چونکە کاتی خۆی باوکی لەگەڵ شێخ محمودو برادەرەکانیا کە لە بصرە بوون دژی ئینگلیزەکان شەڕیان ئەکرد، هەر بەم شێوەیە لەگەڵیانا ئەجولانەوە، ئەمیش ئەو کاتە منداڵ بووە بەڵام هەر ئەو دەمەی لەبیرەو جێگەی باوکی گرتووەتەوە، ئێمە لە هەموو دابەزینێکدا سەرمان لێ ئەداو بووبووینە دۆستێکی باشیو زۆر بە تەنگمانەوە ئەهات، هەڵسوکەوتیمان ئەبینی زۆر پێ خۆشحاڵ ئەبووین، بۆ مانگی داهاتوو باوکم هاتەوە لە ماڵی ئەوان دابەزیبوو، پارەکەی بۆ هێنا بۆوەو زۆر سوپاسی کرد بوو، لەگەڵ خۆشیدا هەنگوینێکی زۆرو گوێزو شتی کەی بە دیاری بۆ هێنا بووین، کە ئەچێتە ماڵیان هەندێك کرژ ئەبێت لە گێڕانەوەی پارەکە، بەڵام ئەڵێت دیاری شتێکی باشەو پیاوانەیە نابێ وەرنەگیرێ، هەردەم سەرمان لە ماڵی حاجی ئەدا تا لە بصرە بووین، بەڵام لە دەرچوونمان نەمان دیوە، تا ساڵی ١٩٦٤ کە باوکمو خوشکمو ماڵەوەمان لە سلێمانی دوور خرابوونەوەو ڕووناکی خوشکم مامۆستا بوو لە قرنە منیش لەگەڵیاندا بووم، چووین حاجی بەسەر بکەینەوە دیمان ڕیزە دوکانەکەی ئەوی لێ بوو کرابووە شەقامو

جێگەکەی تێك چووە، چووینە ماڵەکەشی لەوێ نەمابوو، ئێمەش ئەوەندە کێشەمان هەبوو بە راستی لەوە زیاتر بە شوێنیدا نەگەڕاین، شتێکی خراپمان کرد ئەبوایە بماندۆزیایەتەوەو سەردانمان بکردایە.

گوزەرانی معسکرمان هەروەکو خۆی مابۆوەو بگرە باشتریش بووبوو چونکە هیوای دەرچوونمان پەیدا کردبوو، بە دوو هەفتە جارێك چەند کەسێکیان بۆ ئەهێناین ژمارەمان زۆر زۆر زیادی کردبوو، لە هەموو کون و قوژبنێکی عێراقەوە برادەرمان ناسی، رەهتەکەی ئێمە کوڕێکی خەڵکی بەعقوبە (گوندی بەهرۆزی) تێ هات ناوی شاکر بوو وابزانم برای عبداللطیف الرحبي بوو کە لە ساڵی ١٩٥٩دا بووە فەرمانبەر لە دائیرەی کتشوکاڵی سلێمانی لای ئێمە، کاتی خۆشی یەکێك بوو لە سەرکردەکانی حزبی شیوعی و ١٩٥٨ لە بەندیخانە دەرچوو، هەر بەو رەنگە مابۆوە لە سلێمانی و ئیشی ئەکرد کوڕێکی رۆشنبیرو ئازاو لێهاتوو بوو، لای ئێمە لە سلێمانی بە نەخۆشی دڵ وەفاتی کرد، تەرمەکەیمان بە کۆمەڵ و خۆپیشاندانێکی گەورە بردەوە بۆ بعقوبە، شاکری برای هەرچەندە کوڕێکی ئازاو باش بوو بەڵام تا بڵێیت گێل و هیچ نەزان بوو، لە هەموو شتێکدا هەر سەری ئەلەقاند، رۆژێ برادەرێکی بصراوی (رۆبیان)ی هێنا بوو بۆمان، وشکیان کردەوەو خوێیان کردو برژاندیان، هەموو وەکو دەنکە کولەکە ئەیانخوارد یا سووریان ئەکردەوەو تێکەڵاوی چێشتیان ئەکرد ئێمەی خەڵکی سلێمانی زۆر قێزمان لەم خواردنە ئەکردەوە، بەڵام هەندێ برادەر لە سەروو هەموویانەوە جلالی برام وەکو ئەوان ئەیخواردو لەزەتی لێ ئەبینی، ئەم شاکرە زۆر سەیری لێ ئەهات و هاواری ئەکردو ئەیووت سەیرکەن سەیرکەن کاك جلال چۆنی ئەخوات ئەی ئێوە بۆ نایخۆن، ئێمەش ئەمانووت ئەو دیانە (مسیحی)، لەمە هێجگار سەری سوڕماو ئەیووت ئەی چۆن برای کاك قادرە، من وتم هیچی تیا نی‌یە من ئیسلام و ئەو دیان، لای ئێمە ئەم شتانە ئەبێت، پیاوی وا هەیە سێ ژنی هەیە ئیسلام و دیان و جولەکە مناڵەکانیشی هەروا، ئەم هەژارە باوەڕی کرد کە دایکی جلال دیانەو هی من

ئیسلام، بە تایبەتی کە جلال رەنگی سوورو سپیو قژی خورمایی بوو، ئەمە خۆیو هاورێکانی زۆربەیان نەیان ئەزانی کورد چییە بە تایبەتی سلێمانی لە کوێوەیە، ئەم برادەرە لەگەڵ ئەوەی دەرامەتی باش نەبوو پارەی بۆ نەئەهات دڵو دەروونێکی باشی هەبوو، هەموو بەیانیەك بووبوو بە پیشەی بسکیتێکی ئەکڕی یەك یەك پێی ئەوتین (تفضل) فەرموو، هەر هەموومان پێمان ئەووت سوپاس تا ئەگەیشتە لای عبدولی سۆران بە شێنەیی بسکیتی لێ وەرئەگرتو لەبەر چاوی ئەکەوتە خواردنیو ئەویش سەیری ئەکردو خۆی بێ بەش ئەبوو، ئەمە هەموو بەیانیەك رووی ئەداو تازە ئەبۆوە بێ ئەوەی ئەم برادەرە هەڵوێستی خۆی بگۆڕێو ئەم فەرمووە نەکات، سەرمان کردە سەر عبدولو وتمان وازی لێ بێنە، وتی من چی بکەم خۆی پێی خۆشە وازم لێ بێنن نانم مەبڕن، تا رۆژێ بە شاکرمان وت وازبێنێتو بچێتە پەنایەکەوە بسکیتەکەی بە تەنها بخوات ئەیووت قەیناکە کاکە عبدول یستاهل، یەعنی کاکە عبدول ئەوە هەڵ ئەگرێ، جا زۆرمان لێ کردو وتمان بڕیاری حزبە، ئینجا وازی هێنا، ئێمەش بۆ دڵنەوایی ئەو هەموو کەرەتێك چیمان بۆ بهاتایە بەزیادەوە ئەمان دایەو ئەمانووت کاکە شاکر یستاهل، ئەم بردادەرەم ساڵی ١٩٦٣ لە نوگرە سەلمان لەگەڵ کۆمەڵێ برادەری کەدا بینیەوە هەندێ گۆڕابوو شتێ فێر بووبوو، بەڵام هەر زۆری مابوو فێر ببێت بە پێی ئەو جێگایەی لە حزبدا هەیبوو، پاش چەند جارێك بینینی دوور بە دوور لێی نزیك بوومەوەو کەوتمە پێکەنین لەگەڵیو وتم ئەڵێی ژنێکی دیانت هێناوەو کوڕێکی دیانت هەیە، چکلێتێکم دایەدەستیو پێم ووت تفضل شاکر یستاهل، ئینجا منی بیر کەوتەوەو دەستی کردە ملمو ماچی کردمو نەختێ یادی رابوردوومان کردەوەو کاتێکی زۆرمان بە یەکەوە بردەسەر، وا بزانم حوکمیان داو رەوانەی جێگەیەکی کەیان کرد، هەر لەگەڵ ئەم برادەرەدا کۆمەڵێ برادەری کۆنی شعبیەمان لەگەڵ بوو.

## یادکردنەوەی جەژنی نەورۆز

چەند رۆژێک پێش هاتنی جەژنی نەورۆز کەوتینە خۆمان بۆ یادکردنەوەی، چونکە زۆر مەبەستمان بوو لەو بارودۆخەو جۆری ژیانماندا ببێتە هاندەرێکی باش بۆمان و بۆ زیاتر خۆڕاگرتن و ورە بەرز بوونەوەمان و بەهێزکردنی گیانی نیشتمان پەروەری و کوردایەتی لە نێوانماندا، توانیمان لیژنەیەکی سەرپەرشتی دروست بکەین، کەوتینە خۆ ئامادەکردن بۆ یادکردنەوەی ئەم رۆژە پیرۆزە، پێش هەموو شتێ دەقی چیرۆکێکی شانۆگەری لەباریان دانا، وا بزانم کاک کامل ژیر کە ئەندامی لیژنەکە بوو بە داڕشتنی هەستا بوو، ئەکتەرو بەڕێوەبەریان دەست نیشان کرد بە سەرپەرشتی سمکۆ عەزیز، جل و بەرگی تایبەتی گونجاویان ئامادە کردو جێگەو دانیشتن و پێشکەشکردنی شانۆگەریەکەیان دەست نیشان کرد، پێش رۆژێ خواردن و بیبسی کۆلا و شیرینی و چەرەسیان ئامادە کرد، بۆ ئێوارەی رۆژی نەورۆز لەسەر گردۆڵکەیەکی بچوک لە دەشتێکی دوور لە قاوشەکان جێگە داخرا بە پەتۆو هەندێ دۆشەکی تەنک و سەرین رازێنرایەوە، بەرامبەریشی هەر بە پەتۆی رەنگاوڕەنگ شانۆیەکی خنجیلانە دروست کرا لەگەڵ جێگەیەک لە پشتەوە بۆ خۆگۆڕین و هاتوچۆی ئەکتەرەکان کە خالد سعیدو چەند برادەرێک ئەم ئیشەیان راپەڕان، سەرەتا دانیشتنەکە بە گۆرانی نەورۆز کرایەوە، هەندێ لە برادەران هەڵپەڕکێی کوردیان پێشکەش کردو برایانی عەرەب سەمای خۆیان لەگەڵ گۆرانیدا پێشکەش کرد تا پێشکەشکردنی شانۆگەریەکە ساردی و شیرینی دابەش کرا، خەڵکەکە بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی شانۆگەریەکەیان ئەکردو هەموو چاویان بڕیبوە شانۆکە، تا لە کاتی خۆیداو بە پێی نەخشەیەکی دانراو دەست پێ کردنی شانۆگەریەکە راگەیەنراو پەردەی شانۆ هەڵدرایەوەو برادەرێ بەخێرهاتنی دانیشتوانی کردو نەختێ لەسەر جەژنی نەورۆز دواو یادکردنەوەی ئەم رۆژەی بەم چەشنەو لەو بارودۆخەدا بە ئیشێکی سەرشانی هەمووان داناو داوای کرد کە کاتێکی

خۆشی لەگەڵ شانۆگەریەکەدا ببەنە سەر، وتی هەر ئەوەندە لە تواناداا هەبوو جێبەجێ بکرێ لە جێگەیەکی وەهادا، پاش دادانەوەی پەردەو هەڵدانەوەی بینیمان کورسی یەکی بچوك لە ناوەڕاستدا دانراوەو هاوڕێیەکی قەڵەوی دەستو بازوو ئەستوری پەنجە درێژی سەر زلی بە جلی پاشایەتی کە بە خاولی رەنگاوڕەنگ دروست کرابوو لەسەر کورسیەکە دانیشتووە کە بەڕێز کاك عبدالله محمد امین بوو (عەبە عفریت)ی هەڵەبجەیی بوو کە بە راستی لێی ئەهات ببێتە ئەژدەهاك، چەند پاسەوانێك لە پیاوەکانی لە دەوری وەستا بوون بە خۆیانو چەکەکانیانەوە کە لە دار دروست کرابوو، ئەمانە هەموو لە برادەرانی عەرەب بوون چونکە دەورێکی بێ دەنگ بوو، لە بەردەم بارەگاکەیدا لاوێکی جوانی ئێسك سووکی جلو بەرگ دڕاو هەردوو دەستی لە دواوە بەستراو بە دەست چەند پاسەوانێکەوە بەرەو رووی ئەژدەهاك بەڕێ کرا، ئەم لاوە کاك فەرەیدونی حاجی أمین بوو کە دەوری کوڕی کاوەی ئەبینی راپێچ کرابوو ببێتە قوربانی بۆ پاشا، بەشی دووەم دوکانی ئاسنگەرێك ئەبینراو کاوەی ئاسنگەر بە بەرگی کارەوە وتووێژی لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا ئەکرد، مقۆمقۆیان ئەگەیشتە دەرەوەی شانۆکە کە ئایانووت ئەبێ ئەم خوێنڕێژە لەناوبەرینو ئێمەی هەژارو زەحمەتکێش رزگارمان نابێت تا ئەم خوێنخۆرە لەناونەبەین بۆ ئەوەی هەموو بە یەکسانی بژینو زۆر شتی تر، گفتوگۆ زۆری خایاند تا برادەرانی کەیان بەرەو روو هاتو هەریەکەی بە دەنگی بەرز ئەیووت منیش لەگەڵتانم، پەردەی سێیەم دیسان ئەبینرا ئەژدەهاك دانیشتووە بە هەر چوار لادا ئەجولێو شت ئەخواتو ئەم بانگ ئەکاو ئەو بەڕێ ئەکات، دوو لاو ئەملاو ئەولایان گرتووە باوەشێنی ئەکەن، گۆرانی بێژێکیش لەم لایەوە گۆرانی بۆ ئەڵێت، کوڕی کاوەش بە دەست بەستراوی لە بەردەمیدا وەستاوەو ملی کەچ کردووە ئامادەیە سەری بپەڕێننو دەرخواردی مارەکانی سەرشانی ئەژدەهاکی بدەن، لەم کاتەدا دەنگە دەنگ پەیدا ئەبێت، کاوەو هاوڕێکانی بە بڕوخێ بڕوخێ خۆیان ئەکەن بە ژووردا و ئەژدەهاك ئەنێنە ژێر خۆو

پاسەوانەکان هەڵدێن و یەك دوویەکیان ئەکوژن بۆ ئەوەی بەرگری بکەن، جا لەبەر ئەوەی ئەو هێرش بەرانە هەردەم لە ژیانێکی پڕ لە کوێرەوەری و دەردەسەری و ناخۆشیدا بوون، هەموو کاتێکیان هەر ئەندێشەو باس و خواسی تێکۆشان و ئازایەتی و خۆبەخت کردن بوو بە چەشنێ چووبوونە دەورەکانیانەوە لە ناو شانۆگەریەکەدا، وایان ئەزانی بە راستی هەڵمەت ئەبەنە سەر دوژمن، بۆیە زۆر بە توندی هەڵیان کوتایە سەر عبداللە (ئەژدەهاك) نایانە ژێرو کەوتنە لێدانی، ئەوەندەمان زانی عبداللە هاواری لێ هەڵساو نەڕانی وتی ئەی هاوار کوژرام کوڕینە فریام کەون بە راستی کوژرام، ئەمە شانۆگەری نی‌یە فریام کەون، جا هەموو برادەران کەوتنە چەپڵە لێدان و هاوار هاوار بیکوژن، تەختی کەن خوێن مژ مەهێڵن، هەروەکو لە هەڵمەت و تێکۆشاندا بن و دوژمنی راستەقینەیان لە بەردەستا بێت، ئێمە نەبێت کە لە هاوارەکەی عبداللە ئەگەیشتین و ئەمانزانی لە چ کارەساتێکدایە بۆ ئەوەی ئیشەکەمان لێ نەشێوێ و عبداللە رزگار کەین، بێ گوێدانە بڕیاری لێپرسراوی شانۆکە، چەند هاوڕێیەکمان هەڵی کوتایە سەرەوەو پەردەیان دادایەوەو عبداللەیان لە ژێر چنگی هێرش بەران دەرهێنا، بەڵام بە نیوە مردوویی و بوڵەبۆڵ و نرکەی ناڕەزایی لەو کارەی بەسەریان هێنا.

بەم شێوەیە کۆتایی بە شانۆگەریەکە هات بە سروودی ئەی رەقیب، دانیشتوان لە جێگەی خۆیان دانیشتنەوەو دەست کرا بە شیرینی و چەرەس دابەش کردن و هەندێ گۆرانی لە لایەن شێخ صدیقی شێخ محمودو بهاء الدین کابان و هەندێ برادەری عەرەبەوە وترا، دوای کۆتایی ئاهەنگەکە بەرەو قاوشەکان گەڕاینەوە، ئەو چەند برادەرە ئازاو لێهاتووەی کە لە دوورەوە بۆ بەرگری دامان نابوون هاتن بە پیرمانەوەو دەست خۆشیان لێ کردین و هێمنی معسکریان پێ راگەیاندین، بۆ شەویش هەمووان لە قاوشەکەدا دانیشتین و دەست کرا بە گۆرانی و سەماو قسەی خۆش و دابەشکردنی کولیچەو چەرەس و ئەو شتانەی لە بەردەستابوون و ئامادە کرابوون، تا شەوێکی درەنگ

دانشتنەکە بەردەوام بوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو لایەکەوە بوو بە دەمە تەقێیەکی زۆر دەربارەی کێشەی کوردو جەژنی نەورۆزو تێکۆشانی ئەوسامان، بە درێژایی کات گوێت لە گۆرانیو قسەی خۆش ئەبوو، لەگەڵ ئەم هەموو شتە کە روویدا سەربازەکانی دەورووپشت نەیان ئەزانی چییەو چی ئەکەین، تا بەیانی هەندێ کولیچەو شیرینیمان بۆ بردنو تێمان گەیاندن کە دوێنێو ئەمشەو یادی جەژنی نەورۆزی میللەتی کورد بوو ئێمەش بەم چەشنە یادمان کردوەتەوە، ئەم جموجوڵانەمان بەڵگەیەك بوو بۆ ئەوەی کە تێکۆشەران هەموو کاتێ گیانی یەکێتیو برایەتیو خۆشەویستی تیادا هەیەو بە هەموو توانایەکیانەوە هەوڵیان داوە بەندیخانەکانو ئێشو ئازارەکانی بکەنە جێگەی فێربوونو حەوانەو پەرەپێدانی رادەی تێگەیشتنو زانستیانو خۆ ئامادەکردنیان بۆ گەڕانەوەیان بۆ باوەشی میللەتەکەیانو تازەکردنەوەی تێکۆشانیان بە هیمەتێکی تازەو گوڕوتینێکی بە جۆشترەوە لە جاران، بە تاتیکردنەوەیەکی بێ هاوتاو دەوڵەمەندکردنی ریزەکانی جوڵانەوەکەمانو کردنەوەی ئاگری نەورۆزو گێڕانی ئاهەنگ بەو بۆنەیەوەو ویستی برادەرانو باسو خواستی چۆنایەتی تێکۆشانی کوردو قوربانی دانی رۆڵەکانی لە پێناو چەسپاندنی مافە رەواکانی میللەتەکەماندا بایەخێکی گەورەی هەبوو بۆ ناسینی کوردو کێشەکەی لای هەموو برادەرانی معسکەرەکەو ئەفسەرو پاسەوانەکانیش.

## خۆ ئامادەکردنمان بۆ راکردن

وەکو باسم کرد دوای ماوەیەك بە گەیشتنمان بۆ شعیبە توانیمان خۆمان رێك خەینو چەند شانەیەك دابمەزرێنینو پەیوەندی لەگەڵ دەرەوەدا پێك بهێنن لە بصرە، ئەمەش بووە جێگیرکردنی زۆر شت بە تایبەتی لە رووی رێکوپێکیو سەرکردایەتی ناوەندییەوە بووینە جێگەی باوەڕی هەموو برادەرانو حزبیش لە دەرەوە کە من سەرپەرشتی ئەم رێکوپێکیەم ئەکرد،

بوومە لێپرسراوی پەیوەندی لەگەڵ سەرکردایەتی حزب لە جنوب کە هاوڕێ (حنا ماربین) ئەو دەمە ڕێبەرایەتی ئەکرد، هەموو ڕۆژی هەینیەك لە دابەزینماندا من خۆم لە برادەران جیا ئەکردەوەو هاوڕێ حەناو یەك دوویەکی کەم ئەبینی و زۆربەی کاتم لەگەڵیاندا ئەبردە سەر، هەموو شتێکمان باس ئەکردو لێی ئەکۆڵینەوە دەربارەی هاوڕێیانمان و ئیش کردنمان و چۆنیەتی ژیانمان لە معسکرداو پەیوەندیمان لەگەڵ ئەفسەرو سەربازەکاندا، بۆ نیوەڕۆ ئەگەڕامەوە ماڵی هاوڕێ فاروق معراج کە هەموو بنەماڵەکەیان لە دایك و باوك و براو خوشکەکانیەوە لەگە ئێمەدا بوون لەوێ هەندێ برادەری خۆمان ئەهاتن بۆ نان خواردن و حەوانەوە یا هەندێ جار ئەچووین بۆ ماڵی هاوڕێ حافظ رەسەن یا فرج بطرس، ئەمانیش بە خۆیان و کەسوکاریانەوە لەگەڵماندا بوون، تا ئێوارە بۆ گەڕانەوەمان بۆ معسکر خۆمان ئامادە ئەکرد، زۆربەی دانیشتنەکانم لەگەڵ هاوڕێیانی حزبیدا لە بێستانە چڕەکانی ئەو ناوەدا پێك ئەهات کە تا چاو بڕکات داری خورما بووو برادەران لەوێ خۆیان حەشار ئەدا زیاتر باخەوانەکان سەر بە ئێمە بوون، هەر کاتێك لەوێ بووینایە، چەند کەسێك دەورەوبەریان ئەگرتین و ئاگایان لێمان ئەبوو، زۆر جاریش میوەو خورمای نایابیان بۆ ئەهێناین، جا ئەبوایە هەموو جارێك ڕێگەیەکی دوورودرێژمان ببڕیایە تا ئەگەیشتینە جێگەی دانیشتن، کەڕەتێك ئەبوایە ئاوێکی خوڕو پان ببڕین، من مانم گرت و وتم ناتوانم بەسەر ئەو پردەدا تێپەڕم کە لە داری خورما دروست کرابوو، باریك و درێژ هەریەکێکی بەسەردا بڕۆیشتایە وەکو جۆلانێ ئەجولا، من ئێستاو ئەوسا نەمتوانی لێی بدەم، ئەوانیش وەك ئاسك بە قەڵەمباز بەسەریدا ئەڕۆیشتن، ناچار بوون لەمبەرەوە دانیشتنەکە بکەین، بەڵام بۆ جاری دووەم هەر چۆنێکی بوو بە دەست گرتنی ئەوان پەڕیمەوە، بەڵام بە چ حاڵێك کە بووە دەمەتەقێی سەر زمانی برادەران و هەردەم ئەیاندایەوە بە روومدا، لە چوونی هاوڕێ حەنا بۆ بغداد کێشەی ئێمە ئەخاتە بەردەم سەرکردایەتی حزب و رادەی ئیشکردنمان و چۆنیەتی ژیان و هەڵوێستی

سیاسی و پلەی حزبایەتیمان و چۆن پێویستە کەڵکمان لێ وەربگرن لە هەموو لایەکەوە پێویستیان پێمان هەیە و بە ناو یەك یەك کەوتبوونە سەر باس و لێکۆڵینەوە لەسەرمان، بۆیە بڕیار ئەدەن کە پێویستە ئەم هاوڕێیانە دەرچن و رزگار بکرێن و بگەینەوە بۆ ناو رێکخراوەکانی حزب و ئەمەش ئەبێت بە زووترین کات جێبەجێ بکرێت و بکەوینە ئیشکردن بۆی، لە یەکەم دانیشتنماندا بڕیاری خزبمان پێ راگەیەنراو رەزامەندی ئێمەشیان وەرگرت و کەوتینە خۆ ئامادەکردن بۆ ئەم مەبەستە کە من و هاوڕێیان حسن علی غالب و عباس طبطبائی و طە و أحمد عبدالحمید بووین.

هەر لەم کاتەشدا بڕیار دەرچوو هەموان بۆیان هەیە بە مۆڵەت بڕۆنەوە بۆ شارەکانی خۆیان، هەر جارەی کۆمەڵێك و ئەوانەی مۆڵەتیشیان پێ نادرێ ئەتوانن هەموو رۆژ دابەزن بۆ بصرە، ئەمەش وای لە ئێمە کرد لە کۆبوونەوەیەکی فراوانی هاوڕێیاندا بڕیارێکمان وەرگرت کە هەر کەسێ بۆی ئەکرێ نەگەڕێتەوە و برادەرانی کەش بۆیان هەیە رابکەن چونکە بە بۆنەی جەژنەوە مۆڵەتێکی زۆر دراوە و هەلێکی باش رەخساوە، ئەو چەند برادەرە کەوتینە خۆ بۆ ئامادەکردن و جل و بەرگی گونجاو پەیداکردن هەموویمان بۆ سازکرا، هەر یەکەی وێنەیەکی رێکوپێکمان دا بە برادەران و پێناسەی تایبەتیمان بۆ دروست کرا بە ناوێکی تازەوە بێجگە لە هاوڕێ احمد کە لە بصرە ئەمایەوە.

هاوڕێیانمان بۆ دواجار بینی و لەگەڵیان دانیشتین لە ماڵی حافظ، خۆمان گۆڕی و جلە سەربازیەکانمان لەوێ داناو هەریەکە پێناسە نوێکەی خۆی وەرگرت و جێگە نهێنیەکەی کە بۆی ئەچین بۆیان خستینە سەر نامەیەکی بچوك لەگەڵ خۆماندا هەڵمان گرت و هاتینە سەر رێگەی رۆیشتن، هاوڕێیان رایان وابوو هەوڵ بدەین مادام پێناسەی وامان پێیە بە رێگەیەکی ئەمیندا بڕۆین کە فڕۆکەیە یەکسەر ئەمانگەیەنێتە بەغداد بە بێ هیچ گیروگرفتێ و لە کاتی خۆیدا هاوڕێیان ئەدۆزینەوە، بەڵام کە سەیرمان کرد

ئەمە درێژە ئەکێشێ چونکە هەفتەی رۆژێك فرۆکە بۆ بەغداد دەرئەچێت و کێ ئەڵێ جێگەش ماوە، بۆیە بیرمان لەوە کردەوەو ئوتومبیلێکی تایبەتی بگرین و حافظ بەم ئیشە هەستێ بۆمان، ئێوارەیەکی درەنگ هەر چوارمان من و حسن علی غالب و عباس و طە لەگەڵ حافظدا بەرەو گەراج بووینەوەو رێکەوتین لەگەڵ ئەو شۆفێرەی کە پێشەکی دەست نیشان کرابوو کە بە رێگەی عەمارەدا بمان گەیەنێتە بەغدادو ئەویش دۆستی حزب بوو بەڵام لە ئێمەی هیچ نەئەزانی چین و چی ئەکەین هەرچەندە پێشی راگەیەنرابوو کە ئەبێت ئاگای لێمان بێت و بە سەلامەتی بگەینە جێگەی خۆمان، جا سەیر ئەوە بوو لەگەڵ ئەوەی هەر یەکەی ناوێکی تازەی هەبوو کە لەسەر پێناسەکەی تۆمار کرابوو لەگەڵ پیشەکەیدا، کە ئەگەیشتینە هەر بازنەیەکی پۆلیس هاورێ عباس یەکسەر ناوە راستیەکەی خۆی ئەوت و ناوە تازەکەی لە بیر ئەچۆوە، زۆر جار پۆلیسی ئەخستە هەڵوێستێکی وا کە گومانیان هەبێت بەرامبەرمان، تا بە زوویی ئوتومبیل چیەکە یا یەکێ لە ئێمە فریای ئەکەوت و بە دەنگی بەرز پێی ئەووت ناوی خۆت داوا ئەکەن نە هی باپیرت تا پۆلیسەکان بزانن نەختێ گوێی قورسە، ئەویش ئەهاتەوە سەر خۆی ئەیووت وەکو لە پێناسەکەیدا تۆمار کرابوو، ئەم هاورێیە هەمیشە تووشی سەر ئێشەی ئەکردین تا وامان لێ هات پێناسەکەیمان دایە دەست برادەرێك و جێگەکەیمان گۆری بۆ لای راستی خۆمانەوە کە دوا کەس پرسیاری لێ ئەکرا، جاری وا هەبوو ئەو پرخەی خەوی ئەهات ئێمە پێناسەکەیمان ئەدا بە پۆلیسەکان، بەڵام بۆ دەمەتەقێی خۆمان و رێگا تەواوکردن خۆش بەختانە زۆربەی کات سەرمان ئەکردە سەری و ئەکەوتینە پیا هەڵدان، گوایە ئەم برادەرە هێندە زیرەك و لێهاتووە ئیشوکاری هەموو نەجەف و کەربەلا بە سەر کەوتویی ئەبات بەرێوە بە مەرجێ ناوی لێ نەپرسی و پرسیاری لێ نەکرێ.

بەم چەشنە بە چەند سەعاتێك بەرە بەیانیەکی زوو گەیشتینە بەغداد، دوکان و بازار هێشتا نەکرابۆوە شەقامەکان کەسی پێوە نەبوو، ئێمەش ئوتێل

(شمال الكبير)مان هەڵبژارد كە لێی دابەزین، دوعا خوازیمان لە شۆفێرەكە كردو پێمان وت لە گەڕانەوەدا بچێت بۆ ماڵی حافظو بڵێت برادەرەكانت بە ساغو سەلامەتی گیشتنە بەغداد، كاتێ سەركەوتین بۆ ئوتێلو سڵاومان كرد دیمان جێگەی دانیشتنمان نی‌یە لەبەر قەرەباڵغی بەو بەیانیە، هەندێك ئەیانویست دەرچنو هەندێكیش وەكو ئێمە ئەو كاتەو پێشتر گەیشتبوون، زۆربەیان خەڵكی سلێمانی بوون، بەخێرهاتنێكی گەرمی ئێمەیان كردو دەنگو باسی شعیبەیان لێ پرسینو یەك دوانێكیان كوڕو خزمیان لای ئێمە بوون، كە پێمان راگەیاندن هەموو مۆڵەت وەرئەگرنو ئەگەڕێنەوە بە بۆنەی جەژنەوە، ئەوەتا ئێمەش پێش ئەوان كەوتووین، ئەمەش زیاتر بۆ ئەوەبوو نەزانن رامان كردووە، هەرچەندە كاك حلمی علی شریفو ئەورەحمانی عارف بڕنوتی هەردووكیان تێ گەیشتنو منیش شتێكم بۆ باس كردن كە نە ئەكرا راستیان پێ نەڵێم، دوای نەختێ حەسانەوەو نان خواردن هاتینە خوارێو چووین بۆ عنوانەكەمان كە دوكانێك بوو لە شەقامی كفاح دۆزیمانەوە برادەرێكی لێ بوو نهێنیەكەمان پێ وت بەخێرهاتنی كردینو نامەكەی لێ وەرگرتینو وتی جارێ هاوڕێیان لێرە نین نیوەڕۆ سەر بدەنەوە، دوایی خۆم بە تەنها چووم بۆ دوكانەكە كە دیم هاوڕێ فاضل فرجو محمد عزیز لەوێ دانیشتبوون بەخێرهاتنیان كردمو نەختێ یەكتریمان ماچ كردو دەست لەملان بووین چونكە دەمێك بوو یەكترمان نەدیبوو، هەر ئەو كاتە داوای برادەرانی كەیان كرد كە بە زوویی هەموو گردبووینەوەو بەرەو شیمالی بەغدا بەرێ كەوتین، لەوێ لە یەكێ لە ماڵە صدائقەكاندا جێگیر بووین ماڵێكی حزبی بوو تەنها دوو خوشكی لێ بوو هەر خەریكی ئیشوكارو نان ئامادەكردن بوون بۆ نیوەڕۆ، ئیتر بێ ئەوەی چرەكە لە دەمیان بێتە دەرێ وەكو خۆیانمان لێ بپارێزن، وا بزانم هەردووكیان كورد بوونو خەڵكی هەولێرو سلێمانی بوون.

بۆ ئێوارە هاوڕێیەك هات بۆ لامان كە دوایی زانیمان (هادی هاشم)ە، پاش بەخێرهاتنمانو هەندێ گفتوگۆ سڵاوی سكرتێری حزبی پێ گەیاندین

کە ئەوسا حمید عوسمان بوو، جا چەندە بە راگردنەکەمان دڵخۆش بووین ئەوەندە زیاتر بەو سڵاوە گەشاینەوەو ورەمان بەرزبۆوە، کە وتی ئەبوایە خۆی بهاتایە بۆ لاتان و لە نزیکەوە لەگەڵتان بدوایە، بە راستی ئەوسا گەیشتن بۆ لای سکرتێری حزب ئەوپەڕی سەرکەوتن بوو بۆ هاوڕێیەك، بە تایبەتی لەو کاتەوەو هەلومەرجەدا کە حمید عوسمان بووبووە سەر قافڵەی بێ هاوتای تێکۆشەران و شیوعیەکان بەسەر دەمی دۆستو دوژمنەوە بوو، بە تایبەتی بەیانی بە ناوی ئاشکرای خۆیەوە دەرئەکرد.

دوو رۆژ لەوماڵە ماینەوە، چەند جارێك ئەو هاوڕێیە ئەهات کۆبوونەوەی لەگەڵ ئەکردین و هەر جارەی هاوڕێیەکی کەی لەگەڵ خۆیدا ئەهێناو ئەبووە دەمە تەقێ و تووێژ لە بەینماندا لەسەر چۆنێتی ئیشی داهاتوومان، تا جارێك هاوڕێ (جورج تلو)ی لەگەڵ بوو وا دیار بوو ئەیانویست بە تێروپڕی باس لەسەر موصل و کەرکوك بکەن، چونکە ئەو شارەزایی‌یەکی زۆری لەسەر ئەم دوو ناوچەیە هەبوو، دوایی بۆمان دەرکەوت هەرخۆی لێپرسراوی ئەم ناوچەیەیەو ناوەکەیمان زانی، یەك دوو جاریش فاضل فرج و حەمەی عزیزی هێنایە لامان کە وەختی خۆی لە کەرکوك بە یەکەوە ئیشمان ئەکرد هەردووکیان خەڵکی سلێمانی بوون و برادەرم بوون و هەموو شتێکم لەگەڵدا باس کردن، ئەوان ئەیانویست لە بەغدا لای ئەوان بمێنمەوەو ئیشوکار بکەم، بەلام کەرکوکم پێ خۆش بوو لەبەر هەندێ ئیشوکاری قوتابیان کە ئەبوایە جێبەجێ بکرایەو پێویستی بە ئامادەبوون من هەبوو، برادەرانیشم ئەناسی و ئیشەکان بە باشی و بە پێی ئارەزووی ئێمە ئەڕۆیشت بەڕێوە، بە تایبەتی کاك کەریم بەگ لە بغداد بوو لە لیژنەی باڵای یەکێتی قوتابیانی عێراق ئەندام و نوێنەری قوتابیانی کورد بوو، داواکردنی راکردنمان و بەو پەلەیە دەستی هاوڕێ فاضل و حەمەی عزیزی تیادا هەبوو، چونکە نزیکی ئەو دوو هاوڕێیە لە سەرکردایەتی حزبەوە وا دیار بوو کاریگەریەکی زۆری هەبوو بۆ هەڵبژاردنی ئێمە بۆ ئەم راکردنە بە تایبەتی

هاوڕێ حمید عوسمانیش منی باش ئەناسی، چونکە هەر وەکو لە پێشەوە باسم کرد لە سلێمانی چەند مانگێك بە هۆی کاك غفوری برامەوە لە ماڵی ئێمەدا بوو.

هەر لەو چەند ڕۆژەدا هاوڕێ عباس و طەیان لێ جیا کردینەوەو بەرەو نجف و عەمارەیان ڕەوانە کردن و بڕیاری ئەوەیان دا کاك حسن بۆ موصل و منیش بو کەرکوك دەست نیشان بکەن، ئێوارەیەك پێیان ڕاگەیاندین هاوڕێیەك دێت بۆ یەك دوو ڕۆژ ئەتانبات بۆ ماڵی خۆیان و جێگەی باوەڕی ئێمەیەو هاوڕێیەکی لێهاتووە لەگەڵیان بن تا بەڕێ ئەکەون، ئێمەش زۆر پێ خۆش حاڵ بووین، چونکە بە ڕاستی چەند ڕۆژێك بوو لە ماڵ نەهاتبوینە دەرێ و کەسمان نەبینی بوو، هاوڕێیەك هات و من و کاك حسنی لەگەڵ خۆی برد بۆ ماڵێك لە بەری کەرخ لە نزیك (علاوی حلە)وە لە ناوەڕاست بازاڕو دوکانەکاندا هەر یەك دوو ماڵی لێ بوو، ئەوی تری تەنرابوو بە چایخانەو دوکان، هەر لە بەیانیەوە بە سەدان خەڵکی لەسەر کورسی چایخانەکان و شۆستەکاندا دائەنیشتن گوێیان لە گۆرانی و عەتابەو مەقاماتی عێراقی ئەگرت، کە ئاخر دەنگیان ئەدایەو ئەو ناوەیان ئەهەژان، بێجگە لە دەنگە دەنگی دۆمینەو تاوڵەو دوکەڵی جگەرەو نێرگەلە کە هەموو چایخانەیەك جمەی ئەهات لەمانەدا، ئێمە ئەو یەك دوو ڕۆژە لە بەیانیەوە تا شەوێکی درەنگ بە ناو ئەو قەرەباڵغیەدا ئەگەڕاین لەم چایخانە بۆ ئەو چایخانەو بە شەقامەکاندا ئەسوڕاینەوە لەگەڵ ئەو برادەرەدا بێ ترس، نیوەڕۆیەك لەسەر خوانی ئەو نانمان ئەخوارد هەندێ شت باس کرا کە پێویستە ئاگاداری خۆمان بین و نهێنی جێگامان بپارێزین و دوژمن پێمان نەزانێ، برادەرەکەمان هەڵی دایەو وتی ئێوە ئەڵێن چی، هەرچی ئەمنی ئەو ناوە هەیە هەر هەمووی عائدی خۆمەو کەس ناوێرێ لە بەردەممدا چرکە بکات، هەر بۆ سەلماندنی قسەکەشی دەمانچەیەکی دەرهێناو دەستی کرد بە تەقەکردنێکی زۆر، ڕاستی کرد کەس هەر لێی نەپرسین و تا نەشهاتنە بەردەرگای ماڵەکەش بزانن ئەم تەقەیە چی‌یە؟ جا بە شانازیەکەوە وتی دیتان کەس لە من ناپرسێت هەرچیەك بکەم ئەیکەم،

بەڵێ لەو کاتەدا حزب زۆر برادەری لەو بابەتانەی هەبوو کە بە راستی دەستیان گرتبوو بەسەر هەموو شتێکداو بووبوونە پشتێکی گەورە بۆ برادەران‌و هەموو ئیشێکیان بۆ هەڵئەسوڕان، وەکو خلیل ابو هوب‌و جبار فیلی‌و ابراهیم قصاب‌و هەندێکی کە، ئەم برادەرەی ئێمەش یەکێك بوو لەو دۆستانەی حزب، من ئەوەم لا شتێکی سەیر بوو بە هیچ جۆرێك ئەو هەڵوێستەم بەدڵ نەبوو بەڵام قسەم نەکرد چونکە میوان بووم‌و نەختێکیش لە دەروونی ئەم بابەتانەم ئەزانی، هەرچەندە بە هاوڕێیانم راگەیاند کە ئاگاداری ئەو جۆرە برادەرانە بن‌و چاودێریان بکەن.

بۆ ئێوارە هەر لەو ناوچەیە نزیك ئەوماڵەی لێی بووین هەندێ برادەری خۆمان دی کە لە شعیبە لەگەڵماندا سەرباز بوون‌و خەڵکی سلێمانی بوون‌و خۆیان لە ئوتێلێکی بچوك دابەزی بوون‌و خۆیان خەشاردابوو، چەند رۆژێك بوو رایان کردبوو لە سەربازی‌و ناویان بە فرار دەرچووبوو، وەکو جەلالی مەلا کەریم● پاشماوەی ئەو برادەرانە بوون کە بۆ جەژن ئەچنەوە بۆ سلێمانی، لەوێ برادەران زۆرو بە گشتی ئەچن بە پیریانەوەو پێشوازی‌یەکی گەرم‌و گوڕیان لێ ئەکەن‌و ئەو رۆژانەی ئەوان لە سلێمانی ئەبن لە ماڵان کۆبوونەوەی گەورە گەورە ساز ئەکەن بۆیان‌و ئەیکەنە فیستڤاڵێکی گەورە بە بۆنەی هاتنەوەیانەوە، لەگەڵ رێکخستنەکانی حزب‌و یەکێتی قوتابیان وتووێژێکی تێروتەسەل رێك ئەخەن هەموو برادەرانی تیا بەشدار ئەبێت‌و لە کۆبوونەوەیەکی گەورەدا هەموو بڕیار ئەدەن نەگەڕێنەوە بۆ شعیبەو خۆیان بشارنەوە، بەڵام سەرکەوتن بە دەست ناهێنن‌و یەك یەك‌و دوو دوو ئەگەڕێنەوە، چونکە بۆیان دەرئەکەوێ کە بە گەیشتنەوەیان بەدەلیان لێ قبوڵ ئەکەن، هەرچەندە زۆربەشیان کاتی خۆی بەدەلیان دابوو، ئەم برادەرانەمان بڕیاری تەواوەتیان دابوو هەرچۆنێك بێت نەگەڕێنەوە، لە بغداد خۆیان بگرنەوەو برادەرانی حزب بدۆزنەوەو لەوێ ئیش بکەن، بەڵام بە گەیشتنی ئەوێ هیچیان بۆ نەکرابوو، هەرچی پارەو پولیان هەبوو هەمووی تەواو ئەبێت،

ئەو نان و ناوساجی و کولیچەیەی کە لەگەڵ خۆیان هێنابوویان ئەویش تەواو ئەبێت و هیچ ئیشێکیان دەستگیر نابێت، ژیانێکی خراپ ئەبەنە سەر، ئێمەیان بینی بە راستی دڵیان کرایەوەو بە دووروودرێژی باسی سلێمانیان بۆ کردین و بڕیاری برادەرانیان پێ راگەیاندین کە هەرچەندە سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە بەڵام معسکر زۆر چۆڵ بووەو زۆربەی برادەران نەگەڕاونەتەوە، ئەوەی گەڕاویشەتەوە دیسان رای کردۆتەوە، ئێمە بڕیارمان دا بیان گەیەنین بە حزب و رێگەو شوێنێکیان بۆ دابنێین، پێشەکی هەندێ پارەمان دانێ، یەکەم جار بوو لە چێشتخانەیەکی باشدا خۆیان ببیننەوەو نەختێ گوزەرانیان باش بێت، ئێمە ئەبوایە بگەڕێینەوە لای هاوڕێیان لەبەر ئەوە بەجێمان هێشتن و عنوانی تەواومان لێ وەرگرتن و دامان بە حزب، دوای ئەوە بڕیاری ئەوەیان دابوو بگەڕێنەوە بۆ معسکرو کاتێکی زۆر ئەمێننەوەو دوایی دەرەچن، دوای گەڕانەوەمان بۆ لای هاوڕێیان، پێیان راگەیاندین ئەبێ دوای رۆژێك خۆمان ئامادەکەین بەرەو موصل بەڕێ کەوین، وەکو وتم کاك حسن دانرابوو بۆ موصل و ئەیانویست لەوێ کەڵکی لێ وەرگرن چونکە عەرەبییەکی باشی ئەزانی و رۆشنبیرێکی چاك و نووسەرێکی باش بوو، بێجگە لەوەی تێکۆشەرێکی ئازاو نەترس بوو حزب لێی رائەبینی لە موصل جێ دەستی دیار بێت و هەر خۆی ببێتە هەڵسوڕێنەری زۆربەی رێك و پێکیەکانی حزب، ئێمەش ئەم بڕیارو باوەڕەمان لا پەسەند بوو کە بەم چەشنە لەگەڵمان ئەجوڵێنەوەو پشتگیریمان ئەکەن، لە دوا دانیشتنماندا دوای دەست گوشینی هاوڕێیان ئێوارەیەکی زوو بەڕێ کەوتین بەرەو ئیستگەی شەمەندەفەری موصل و لە علاوی حلە بە کۆمەڵێ بەیاننامەی پێچراوەوە بەوپەڕی خۆشی و وره بەرزیەوە جێگەی خۆمان گرت و کەوتینە هەلسوکەوتێکی ئاسایی لەگەڵ خەڵکی و تێکەڵاوبوونیان بۆ دوورکەوتنەوە لە رووی پیاوانی ئاسایش و دەربازبوون لێیان، هەرچەندە زۆر ئاسایی بوو هیچ پشکنین و لێ پرسینەوەیەك نەبوو، بە پێچەوانەی ئەوەی ئێمە تێی گەیشتبووین، بەڵام هەر پێویست بوو

ئاگاداری خۆمان بین، ئەو شەوەمان هەرچۆنێك بوو بردە سەر تا بەیانی گەیشتینە موصل‌و هەردووکمان یەکەم جارمان بوو بچینە ئەو شارەو هیچ جێگەیەکمان نەئەزانی، لەگەڵ ئەوەشدا کەوتینە گەڕان بە شەقام‌و چایخانەکاندا تا نەختێ کاتمان بردە سەر جا بە پرسکردن بەرەو ئەو شەقامە بووینەوە کە بۆمان دیاری کرابوو، پاش گەڕانێکی کەم چووینە بەر دوکانێك کە عنوانەکەمان بوو، پیاوێکی بەتەمەنی ریش ماش‌و برنجی لێدانیشتبوو هەر خەریکی ئەم دیو ئەودیو کردنی کەل‌وپەلی دوکانەکەی بوو منالانی بەڕێ ئەکرد (چونکە شتی منالانی ئەفرۆشت). چوینە بەردەمی‌و سلاومان لێکردو وتەی نهێنیمان پێڕاگەیاند، هەرزوو وەرامی داینەوەو بەخێرهاتنی کردین. هەموو شتەکانمان پێگەیاندو کاتێکی لەگەڵ دانایین بۆ ئێوارە بچینە لای‌و بمان گەیەنێتە لای هاوڕێیانی حزب. ئەو رۆژەمان بە دورو درێژی لە موصل بردەسەر تا ئێوارە یەکترمان بینیەوەو بردینیە نوسینگەی محامیەك ناوی (حمید حمدی) بوو دەرکەوت لێپرسراوی یەکەمی حزب بوو لە موصل، یەك دوو سەعات کاتمان بردەسەر بە گفتوگۆ کردن لەسەر چۆنیەتی گەیشتنمان‌و رێکخستنی ئیش‌وکارمان، تا شەوێکی درەنگ ماینەوە لەگەڵیا و جا هەستاین بردینیە ماڵی هاوڕێ (هاشم حسین) کە دەرکەوت لێپرسراوی دووەمی حزب بوو. ئەم هاوڕێیە هەر بەمنداڵی شتێ چووبوو بە چاوێکیدا پوچەڵی کردبوو، لەش‌و لارێکی لاوازی هەبوو بە چەشنێ یەك یەك ئێسقانەکانی لەشی بژمێری، لەگەڵ ئەوەی هاوڕێیەکی ئازاو نەترس بوو بەڵام ڕادەی تێگەیشتنی نزم بوو. توشی مل ملانێیەکی ئەوتۆ هاتبوو کە زۆرجار خۆی لە بیر ئەچۆوەو توشی تورەیی‌و گرژی ئەبوو. هەروەك زۆربەی برادەران نەبوونی‌و هەژاری‌و کێشەی خێزانی‌و نەخۆشی خۆی‌و براکەی‌و ئیفلیجی دایکی ئەوەندەی کە لایەنی شەرم‌و خۆبەکەم زانینی لا بەرجەستە بووبوو، هەرچەند لەگەڵ ئێمەدا نەرم‌و نیان‌و لەسەرخۆ بوو بە هەستێکی بەرزی هاوڕێیانەوە لەگەڵمان ئەجولایەوە.

لە ماڵەکەیاندا ژێرزەمینێکی بچوك (ژێرخان)ی تەسك‌و نسرمیان

هەبوو کردبویانە جێگەی کۆنەو بەخێوکردنی هەردوو ئاسکەکەیان کە بە زنجیرێکی کورت بە پەنجەرەکەیانەوە بەستبۆوە بەردەمیان هەمیشە ئاوی ڕژاو و سەوزەو نانە وردەی لێبڵاوبوبۆوەو بۆنێکی هێجگا ناخۆشی بە ژورەکەدا بڵاو کردبۆوە کە دانیشتن و حەوانەوەی تیادا ستەم بوو. هاشم زۆر ڕێزی لە دایکی ئەگرت و بە هیچ جۆرێك دڵی نەئەیەشان و لە زوری سەرەوە دایناببوو خۆی و براکەی هەموو شتێکیان بۆ دابین ئەکرد. جگە لە بەخێوکردنی ئاسکەکان و هەندێ پەلەوەڕ کە براکەی پێوەی خەریك بوو، پەیوەندی سیاسی و هاتوچۆی برادەرانیان لێ ئەشاردەوە، هەر لەبەر ئەوە بوو جێگەی ئێمەیان لای ئاسکەکان داخست کە تەنها پەتویەك و دوو سەرین بوو. بەبێ چرپە نانی ئێوارەمان خواردو لەگەڵ دەمەتەقێیەکی شێنەیی چەند سەعاتێکمان بردەسەرو لێی ڕاکشاین. بەڵام چۆن ڕاکشانێ کە هەر جوڵانەوەیەکی ئاسکەکان ئێمەی بەئاگا ئەهێناو ڕای ئەچڵەکاندین، دەستێکت ئەجوڵان یان قاچێکت درێژ ئەکرد بەر ئاسك ئەکەوت و ئەبووە مرەو هەڵبەزین و دابەزینیان. بۆ چونەدەرەوە ئەبوایە گڵۆپ دانەگیرسایە نەك بمان بینن. هەرچۆنێك بوو ڕۆژمان لێبۆوەو بەیانی زۆر زوو براکەی هاشم هاتە لامان و خواردنی بۆ هێناین. دووهەمین شەویش هەر بەم ڕەنگە ماینەوە بە برایەتی ئاسکەکان، چەند کەرەتێ هاشم هاتە لامان تێمان گەیاند جێگەکەمان باش نییەو زۆر ناڕەجەتین، بەشەرمەوە ووتی جارێ هەر ئەوەندەمان پێهەڵئەسوڕێ، بەڵام چارەسەرێك ئەدۆزینەوە. بۆ بەیانی هاوڕێیەك هات بۆ لامان لەوێ بمانگوازێتەوە، بەڵام بەتەنها منی ئەویست و ئەبوایە کاك حسن لەوێ بمێنێتەوە. بەمە کاك حسن نەختێ گرژبوو و بۆڵەیەکی کرد بە واتای ناتوانێ شەوێکی کە بەم جۆرە بمێنێتەوەو ژیان بەرێتەسەرو ئەبێ چارەسەرێکی بە پەلەی بۆ بکرێ. ناهەقی نەبوو زۆر هیلاك بوو لەوە زیاتر نەئەبوو خۆی ئازار بدات. هاوڕێ هاشم پێی ڕاگەیاند هەر ئەمڕۆش دێن بە شوێن تۆداو جێگەیەکت بۆ دەست نیشان کراوە، بەڵام وەکو زانیم شەوێکی

کەش بەم شێوەیە ماوەتەوە بەتەنها، وادیار بوو لە هەموو شەوەکان خراپتر توشی ئازارو کێشەی دەروونی بووبوو. پاشان گوێزرابۆوە شوێنێکی کەو ئیشی حزبی بۆ دابین کرابوو، بوو بوو بە لێپرسراوی لیژنەی یەکێتی قوتابیانی گشتی عێراق لە موصلو ئەندامی لیژنەی ناوچەو لەمەش دا توشی مل ملانێیەکی زۆر ئەبێت لەگەڵ ئەقلیەتی هاوڕێکانی دەوروپشتی، کە لە یەك دوو مانگ زیاتر خۆی پێناگیرێو دوایی ئەگەڕێتەوە بۆ شعیبەو لە سەربازی دەرئەچێت.

ئەو برادەرەی کە هات بۆ لامانو منی لەگەڵ خۆی هەڵگرتو گەیاندمیە ماڵی هاوڕێیەك ناوی (پۆلص) بوو نزیك پردی یەکەمی سەرئاوەکەو بەسەر غاباتەکەی موصل دا ئەیڕوانی. ماڵێکی تابڵێیت باشو ڕۆشنبیربون هەر هەموو بەیەکەوە دائەنیشتینو نانمان ئەخواردو وتووێژمان ئەکرد بە پێچەوانەی ماڵەکەی کەوە کە ئەم ئەو جێگە گرنگەشی نەبوو لە حزب دا. هەر بەگەیشتنم بۆ ماڵەکە پاش حەسانەوەیەکی کەم جلەکانیان هەموو بۆ شتمو گەرماویان بۆ ئامادەکردم، هاوڕێ پۆلص برایەکی هەبوو قوتابی دواناوەندی بوو کە زانی من قوتابیمو هەڵاتومو ئێستاش ئیش بۆ حزبو قوتابیان ئەکەم زۆر هۆگرم بوو بوو، هەردەم پرسیاری هەمەچەشنەی لێ ئەکردم. منیش بە شێنەییو تێرو پڕی وەرامم ئەدایەوە، ئەویش پێی خۆش بوو ئەو شتانە بزانێو بۆ برادەرەکانی بگێڕێتەوە. ئەو چەند ڕۆژەی لەوێ بووم بێجگە لە چوونە دەرەوەم لەگەڵ پۆلص دا بۆ بینینی هاوڕێیان، هەموو ئێوارانێ ئەبوایە لەگەڵ براکەیدا بەیەکەوە بچوینایەتە دەرێ بۆ سەرئاوەکە کە ئەمبەرو ئەوبەری چایخانەی گەورە گەورە بوو تا چاوت بڕی بکردایە خەڵکی دانیشتبوون، هەریەکە خەریکی تاوڵەو دۆمینەو وتووێژو هاتو چۆ بوون. ئەمە بوو بووە پیشەیەکی هەمیشەیی ئەهلی موصل بەتایبەتی لە ئێواران دا کە تا شەوێکی درەنگ لەوێ ژیانیان ئەبردەسەرو بووبووە شتێکی چەسپاوو فۆلکلۆر لایانو موصل بەوە ناوی دەرکردبوو. زوربەی لاوەکانیش بەرەو

چایخانەکانی غابات ئەبوتەوەو لەوێ کاتیان ئەبردەسەر یا زوربەیماڵەکان لەبن دارو بەرجۆگەلەی ئاوەکاندا راخەریان دائەخستو لەوێ بەکۆمەڵ نانی ئێوارەیان دەخوارد. وەکو ئەیانوت خەڵکی موصل چەند جێگەیەکی کەیان هەبوو پشویان تێدا ئەدا وەکو شلالاتو مەرقەدی نەبی یونسو هەندێکی کە. ئێمە زیاتر لە چایخانەیەك دائەنیشتین. جاری واهەبوو ئەبووینە کۆمەڵێکی زۆر لە برادەران کە ئێمەیان ئەبینی هەرهەموو ئەهاتن بۆلامان، وادیار بوو برادەرەکەم (براکەی پۆڵص) هەموو شتێکی لادرکاندبوون دەربارەی من، زۆر بەخۆشیەوە گوێیان شل ئەکرد بۆ قسەکانم هەرچەندە هەموو شتێکم تێگەیاندن. ئەم برادەرانە زۆریان پێخۆش بوو لەگەڵ قوتابیەکی سیاسی هەڵاتوو دانیشنو گفتوگۆی لەگەڵ بکەن، هەندێکیشیان هەر پەیوەندی بە یەکێتییەوە نەبوو، بەڵام سەرەتای هاتنەپێشەوەیان بوو بۆ ناو ریزەکانی کە ئەو دانیشتنانە رێگەی بۆسازئەکردن، باسەکەمان هەمووی دەربارەی قوتابییانو تێکۆشانیان بوو بۆ هێنانەدی ژیانێکی خۆش بۆیانو مسۆگەرکردنی دوارۆژیانو هەندێ جاریش باسی شعیبەو کێشەی قوتابیان لەو معسکەرەدا. دوای ئەم دانیشتنە دورودرێژەمان ئەوان هەریەکەی ئەگەڕایەوە بۆ شوێنی خۆیو ئێمەش بۆ غابات بۆسەر سفرەی ماڵی پۆڵص بۆ نان خواردنو دانیشتنێکی لەگەڵیاندا بە کۆمەڵ.

ئەم هەڵسو کەوتەم ئەوەندەی نەخایاند، کە هیواداربووم کاتێکی زۆرتر بەردەوام بوایەو بتوانم هەندێ ئیش جێبەجێ بکەمو رۆڵێکی تایبەتیم هەبێت بۆ پێشکەوتنی رێكو پێکیەکانی یەکێتی قوتابیانو حزب، پێیان راگەیاندم خۆم ئامادە بکەم بەیانی زوو دێن بە شوێنماو ئەکەوینە رێگە بۆ کەرکوك. ئەوەبوو دوای نان خواردنی بەیانی چاوەڕێی رابەرم ئەکرد، تەنکەرێکی گەورەی نەوت لە بەردەرگای ماڵەکەدا وەستاو برادەرێك هاتە ژورەوەو هەواڵی منی پرسیو پێی راگەیاندم کە هاتووە بە شوێنم دا، جا یەك یەك دوعاخوازیم لە ماڵی پۆڵص کردو زۆر سوپاسیانم کرد بۆ ئەو

میوانداریەم و لەگەڵ برادەرەکەمدا سواری ئوتومبیلەکە بووین و کەوتینە ڕێ، کە تەنها هەر خۆم و ئەو برادەرە بووین و هەرخۆشی شۆفێربوو بە شێنەیی و لەسەرخۆ بەقسەی خۆش هاتین بەڕێوە، لەهەولێر لامان دا لە چایخانەیەك و پاشان کەوتینە ڕێ بەرەو کەرکوك. لە ڕێگە بەو بەیانیە دنیا زۆر ساردبوو منیش کراس و پانتۆڵێکم لەبەردا بووزۆرم سەرمابوو، وادیاربوو نەخۆش بم چونکە خۆم بۆ ڕاگیر نەئەکراو گێژبوو بووم. برادەرەکەشم بەمەی زانی چەند کەرەتێك وەستاو پشومان دا، بەدرێژایی ڕێگە هیچ کۆسپێکمان نەهاتە بەردەم و بەلای هەر بازگەیەکدا تێپەڕ ئەبوین سلاوێکمان بۆ ئەکراو ڕێگەی ڕۆیشتنمان پێئەدرا بێئەوەی رامان بوەستێنن. وادیاربوو هەر هەموویان برادەرەکەیان ئەناسی بەتایبەتی ئوتومبیلەکە هی کۆمپانیای نەوت بوو. تا گەیشتینە کەرکوك لەبەردەم ماڵك دا لە کۆڵانێکی تەسك دا وەستاو دابەزین و چوینە ژوورەوە پیرێژنێکی دیانی سەرسپی بەرەوپیرمان هات و چەند قسەیەکی لەگەڵ برادەرەکەمدا کرد بە زمانی خۆیان کە هیچی لێتێنەگەیشتم. بەرەو ژورێکی ناردین، پاش چەند چرکەیەك هەرخۆم مامەوە لە ژورەکەدا برادەرەکەم خۆی و ئوتومبیلەکەی ڕۆیشتن و پیرێژنیش چووە دەرەوە و لەبەردەم دەرگا لێی دانیشت، منیش قڕوقەپ دانیشتم بێئەوەی یەکێك هەبێت دووقسەی لەگەڵ بکەم. ئەوەندەم زانی سەرم کەوتەژان و دڵم تێکەڵ ئەهات و لەشم سارد بۆوەو سەرما تەنگی پێهەڵچنیم هەرچەندە دنیا ساردیش نەبوو، سکم کەوتە قرمەقرم و پێچ پیاهاتن خۆم پێنەگیرا، نەگەیشتمە دەرێ کەوتمە ڕشانەوە بەجۆرێك ژورەکەو هەموو جلەکانم پیس کرد، ئەتوت لەناو هەڵکێشراوە دەنگیشم بەکەس دا نەئەگەیشت، پیرێژن چووبووە بەردەرگاو رازی قسەی دادابوو، وادیاربوو هەرلەوێش نەمابێ چونکە گوێم لێبوو دەرگای دا بەیەکداو دایخست. کاتێ هاتەوە منی بەوجۆرە بینی کەوتە هاوارهاوارو بۆڵە بۆڵ کە هیچی لێ حاڵی نەبووم بە تورکی و مەسیحی ئەیدا بەیەکداو رووی دەمی لەمن بوو، هەندێ جار گوێم لە وشەی عەرەق ئەبوو، هەرچۆنێ بێ

نەختێ بەخۆمدا هاتمو خۆم سڕیو چووم دەمو چاوم شتو ئاوێکم خواردەوە، بەڵام بۆنو بەرامەو پیسایی ژوورەکە لەوەدا نەبوو نەت ئەوێرا خۆت بەژووردا بکەیت، منیش توانای پاك کردنەوەیم نەبوو، هیچ شارەزای ماڵەکەش نەبووم. لەم گێرەو کێشەیەدا برادەرەکەم هاتەوەو واقی وڕماو هات بەلامداو زانی نەخۆشمو لێم قەوماوە، نەختێ دڵ نەوایی کردمو منیش بەشەرمێکەوە سوپاسم کردو هاوارهاواری پیرێژنم بۆ گێڕایەوە بەپەلە بیجامەو کراسو جلی خۆی بۆ هێنامو هەرخۆی جلە پیسەکانی بردە گەرماوەکەیانو بۆی شتم دوایی چوو بەلای دایکیەوە بە شێنەییو لەسەرخۆ لەگەڵیا ئەدوا وادیار بوو هەموو شتێکی تێگەیاندبێ کە من سەرخۆش نیمو لەرێگە سەرمام بوەو نەخۆش کەوتووم، کابرایەکی سیاسی هەڵاتوە لەرژێم هاتۆتە ئێرە داڵدەی ئەدەین بۆ کاتێکی کەمو ئەچێت بەلای ئیشی خۆیەوە. دوایی پیرەی دایکی بە پەشیمانیەکی زۆرەوە هاتەلامەوەو سەری ماچ کردمو پێی ووتم بەهەڵە لێت تێگەیشتم داوای لێبوردنت لێئەکەم. کەوتە خزمەت کردنمو پێشەکی شەربەتێکی نایابی لیمۆی بۆ هێنام بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەم باش بوو، بۆ نیوەرۆش خۆی هیلاك کردو باشترین خواردنی بۆ ئامادەکردینو وتی ئەبێ خواردنی سوك بخۆیت ئەویش ماسی برژاو بوو. هەر هەموو جلەکانی بۆ وشك کردمەوەو لەئوتوی داو بۆی ئامادەکردم. کوڕەکەی فێری شتێکی کردبوو بەڵام پاكو تەمیزی ماڵەکەیو پاراشتنی سەرو ژیانی کوڕەکەی لەپێش هەموو شتێکەوە دائەنا، ئەو رۆژە تا ئێوارە لایان مامەوەو بەشەو هاتن بە شوێنما بۆ ماڵێکی کە، ئەو چەند مانگەی لە کەرکوك بووم هەفتەی کەڕەتێك بێئەوەی پەیوەندیم هەبێت بەو ماڵەوە سەردانم ئەکردنو ئەم ووت کاکەی سەرخۆش هاتوە بەسەرتان بکاتەوە، پێیان خۆش بوو کاتێکی کەمم لەگەڵیاندا ئەبردەسەر.

## ماڵی کاك فەرەج

هەواری تازەم لە گەڕەکی شاترلو بوو لە ماڵی کاك فەرەج ابراهیم کە خەڵکی سلێمانیو گەڕەکی مەڵکەندی بوو پێشوازی گەرم کرام لەلایەن کاك فەرەجو خێزانەکەیەوە (رحمەخانی شێخ محەمەدی کەڵەکنی)، کاك فەرەج لەخۆشەویستیا بە گلاراو بانگی ئەکرد. خۆی لە کۆمپانیای نەوت ئیشی ئەکرد، ئەوسا دوو منداڵی هەبوو (فریادو ئازاد)، بەراستی جێگای شانازیو پێزانین بوو کە حزب هاوڕێی وای هەبێتو ماڵەکەی لەوکاتەدا بکاتە مەڵبەندی ئیش هەڵسوڕانو حەوانەوەی برادەرانو هەموو توانای بۆ ئەوان بخاتەکارو خۆی ماندو بکات. کاك فەرەج هەر بەناوی (توانا)وە منی ئەناسیو بانگی ئەکردمو گەر ئیشێکی گرنگو نهێنیمان نەبوایە کاك فەرەج لەگەڵمدا دائەنیشتو ئاگای لەهەموو شتێکمان بوو، چونکە برادەرێکی چاكو ئەمین بوو. لەگەڵ ئەوەش دا تەنها ژورێکیان هەبوو لەگەڵ هەیوانێکی بچوك دا، ئەبوایە هەموومان بەیەکەوە بووینایە، هەرچەندە شەویش هەرهەموو لەو ژورەدا ئەنوستینو نانمان ئەخوارد، بە رۆژیش بۆ ئەوەی خەڵکی گەڕەك بە شتێکی ئاسایی سەیرم کەن بەجوتە ئەچوینە دەرەوەو ناو خەڵکیو چایخانەو گەڕەك یا ئەچووین بۆ کۆمپانیای نەوت لەوێ زوربەی کاتمان ئەبردەسەر. رۆژێك میوانێکمان لە سلێمانیەوە هات یەکسەر لوتی بوو بە لوتمەوە نەمتوانی خۆمی لێلادەم، هاواریکرد کاك قادر چۆنیو دەستی کردە ملمو ماچی کردمو کەوتە گفتوگۆ لەگەڵمداو باسی سلێمانیو ماڵەوەمان. کاك فەرەج واقیوڕماو دەمی داچەقاندو دەستی کرد بە پێکەنینە تایبەتیو بەناوبانگەکەی خۆیو وتی بەخوا باش بوو ناسیمانیو ئاشکرا بووی لێمان، ئەمە ئەوەندەی کە رێزو متمانەیان بەرامبەرم پەیداکرد. هەردەم بەو دەستو پەنجە بلیمەتیەی خۆی زۆرجار خواردنی تایبەتی بۆ سازئەکردین کە باشترین وەستا بوو لە دروست کردنی کفتەو کوبەی ساوەرو بریانیو گیپەداو شارەزایی تەواوی هەبوو لە هەموو خواردنێکا، سەرەڕای قسەخۆشەکانیو پێکەنینەکەی کە بوبووە

نازناوی تایبەتی بۆی، کاك فەرەج دوای شۆڕشی ١٤ی تەموز تا کۆتایی ژیانی سەرپەرشتی چێشتخانەی تایبەتی ماڵی هەموو پارێزگاکانی ئەکرد کە ئەهاتە سلێمانیو دەست بەرداریان نەئەکرد، چەند جارێکیش خواردنی باشی بۆ منو ماڵەوەمان دروست کرد، بێجگە لەوەی لەکاتی خانەنشین کردن دا چێشتخانەیەکی بچوکی لەشەقامی کاوە کردەوەو زوربەی برادەرانمان لەوێ نانی ئەخواردو کفتەی تایبەتی دروست ئەکرد، هەمیشە خێزانەکەی (ئامینەخان) لەگەڵ بەخێوکردنی ماڵو منداڵو ئەرکی منیشی کەوتبوە ئەستۆ، بێجگە لە تەتەری کە بۆی ئەکردین، شتەکانی منی بەتایبەتی ئاپاراستو لایەنگرێکی بێهاوتاشم بوو لە بەرگریکردنم دا دژی ئەو هەڵوێستە نامەبدەئیانەی بەرامبەرم وەرئەگیرا لەلایەن هاوڕێ (حکمان فارس)ەوە کە جێگری لێپرسراوی یەکەمی حزب بوو لە هەرێمو زوو زوو سەردانی ئێمەی ئەکرد، ئەم هاوڕێیە لەگەڵ ئەوەی تێکۆشەرێکی باشو ئازاو نەترسو خاوەن مێژویەکی دورودرێژ بوو لە بنەماڵەیەکی نیشتمان پەروەربوو، خۆیو براکانی بەندیخانەو گرتوخانەکانی سەرتاپای عێراق هەردەم جێگایان بوو، خۆشی گەیشتبووە پلەیەکی بەرزی حزبی، بەڵام کابرایەکی نەخۆشو معقد بوو، رادەی تێگەیشتنو رۆشنبیری بەجۆرێك نزم بوو کە لە ئاستی لێپرسراویەکەیدا نەبوو؟ هیچی دەربارەی کورد نەئەزانی (هەرچەند بەباوك کورد بوو) یا خۆی لەم راستیە گێل ئەکردو لەبیری خۆی ئەبردەوە. گەر باسێکی کوردی گوێ لێبوایە وەك فیشەکە شێتە ئەچوو بە ئاسماندا بەتایبەتی کە منی ئەبینی ئەندامی لیژنەی باڵای یەکێتی قوتابیانی کوردو لێپرساوی کەرکوکمو هەرهەموو ئیشەکانمان باسو خواستی کوردو رێکخراوەکانیەتی، بەیانی کوردی دەرئەکەینو نامەی تایبەتیمان لە مەرکەزەوە بۆ دێت لەلایەن کاك کەمال کەریم بەگ کە لێپرسراوی یەکێتی قوتابیان بوو. هەر ناوەکەی حکمانی ئەخستە گومانەوە. بەدەستی بوایەو بیتوانیایە هەموو رۆژێ ئەچووە سەری بۆ بغدادو هەڵی ئەکوتایە سەری،

هەرچی نامەیەکم بۆ بهاتایە ئەوەندەت ئەزانی هاواری لێ‌هەڵئەسا و ئەچوو بەئاسمان دا بەزۆری زۆردارەکی هەڵی‌ئەبچڕی‌و ئەیدامێ گوایە ئەیبات بۆی بخوێننەوە چونکە خۆی کوردی نەئەزانی. وادیار بوو برادەری وەکو خۆی هەبوو بۆی بخوێنێتەوەو ئەم هەڵوێستانەش یەکی خستین. ئەبوایە ئاگای لەهەموو شتێ بوایە لەگەورەو بچوك، تەنها هەوڵی ئەوەشی ئەدا لەکۆبونەوەکانماندا ئامادەبێت‌و بە عەرەبی قسەمان پێ‌بکات‌و بزانێ چی ئەڵێین، هەمووجارێ لەسەر ئەم شتانە لێمان ئەبووە هەرا، تا جارێکیش دەستمان دایە یەخەی یەکتر کاك فەرەج هاتە بەینمانەوە. ئەم هاوڕێ‌یە هەرهەموومانی لەخۆی ڕەنجاندبوو بەهیچ جۆرێك نەمان ئەویست بیبینین، کەلای خۆی ئەبوایە بۆ هەموو کارێك لەگەڵماندا بوایە. کاك فەرەج‌و خێزانەکەی هەمیشە لایەنگری منیان ئەکردو بەربەستی هێرشی ناڕەوای ئەویان ئەکرد، هەردەم ئەیانوت شەرمە دوای ئەم هەموو قوربانیە لەگەڵتا بجوڵێنەوەو هەڵس‌و کەوتت بەم ڕەنگە لەگەڵ بکەن، پێویستە چارێکی ئەم کێشەیە بکرێت. ئەوەبوو لەگەڵ ئەوەی هەموو ڕۆژێك شتێکی کەمم بۆ کاکە (کاکەی فەلاح) باس ئەکرد، بەڵام لەسەر قسەی ئەوان‌و بەئامادەبونی هەموویان بەدورودرێژی هەموو شتم بۆ کاکە گێڕایەوەو ئەوانیش پشتگیریان کردم، کاکەی فەلاح هاوڕێ‌یەکی تابڵێیت لەسەرخۆو ڕۆشنبیر بوو، هەردەم بەوردی لەهەموو شتی ئەکۆڵیەوەو چارەسەریشی بۆ ئەدۆزیەوە لەروی حزبی‌و ڕێك‌و پێکیەوە. لەگەڵ ئەوەشدا شاعیرو ئەدیب‌و زمانەوانێکی باش‌و هەڵگری نامەی پیرۆزی وشەی کوردی بوو کە ئەمانە هەمووی وای لێ‌کردبوو پارسەنگی بەلای ئێمەدا بشکێتەوەو پشتگیری لەمن بکات‌و بێت بەدەنگمەوە، بۆیە بەچرپە پێ‌ی ڕاگەیاندم کە ماڵێکی باشی بۆ ئامادەکردوم‌و لەوێ ئەحەسێمەوەو ئەتوانم پەل بهاوم‌و ئیشەکانم ڕێك‌و پێك بخەم‌و خۆشی لەو ماڵە لەگەڵم ئەبێت، بەمەرجێ ئاگاداری نهێنی ماڵەکە بکرێت‌و بپارێزرێ، چونکە هەندێ ئامێری چاپ‌و کتێبخانەی حزبی تێدایە، نابێت هیچ هاوڕێ‌یەك بێت بۆ لامان لەوێ،

بەڵکو من خۆم ئەتوانم بچم بۆ لایان و بمێنمەوە بەپێی گونجانی ئیش و کارەکانم، ئەوە لای من هەنگاوێکی باش بوو مەجالێکی باشی بۆ ڕەخسانم و ئەکەوتمەوە ئیش لەو هاوڕێیەش دور ئەکەوتمەوە کە وای ئەزانی لەدەرەوەی حزب ئەو یەکێتی‌یەم هێناوەو دژایەتی حزبی پێ ئەکەم.د

## هەواری تازەم

ڕۆژی دوایی خۆم و هاوڕێ کاکە بە جووتە بەرەو ماڵی تازەمان بوینەوە کە لە گەڕەکی (موصەلا) نزیك بازاڕەکەی جووت قاوەخانە بوو، پاش دوعاخوازی لە کاك فەرەج و خێزانەکەی کە زۆریان پێناخۆش بوو لێیان جیاببمەوە، بۆیە بەڵێنم دانێ هەمووجارێ سەردانیان بکەم. ماڵە تازەکەمان ماڵێکی بچوکی یەك دوو ژووری بوو، یەکێکیان جێگەی چاپ و ڕۆنیۆ و کتێب خانەو چەند کورسیەك و مێزێکی بچوك بوو، ژورەکەی کەش جێگای دانیشتن و نان خواردن و نوستنی من و خێزانەکە بوو، دواتر زانیم خێزانی هاوڕێ (کەریم احمد)ن کە پێك هاتبوون لە (حمدیە خان)و (سەلیم)ی کوڕی و منداڵە بچوکەکەیان و (وصفیە)ی خوشکی حمدیە کە تەمەنی دوانزە سیانزەساڵی ئەبوو، منداڵە بچوکەکەیان تەمەنی چەند مانگێك ئەبوو بە ناوی (ژیان)ەوە، منداڵێکی لاواز، نەخۆش، ژەم بوردەی شیرخواردن، ڕادەی بەخێوکردنی زۆر خراپ، ڕۆژ بە ڕۆژ تا ئەهات تەندروستی بەرەو خراپی ئەڕۆیشت و لاوازتر ئەبوو، وای لێ‌ئەهات ئەو دەرمانانەی پزیشکێکی برادەرمان بۆی هێنابوو هیچ کەڵکێکی لێوەرنەئەگرت. شەوێ لە شەوان کە تەنها من و سەلیم لە ماڵ بووین، منداڵەکە لەسەر ڕانی من ڕاکشابوو و ورد ئاوم ئەکرد بەدەمیوە وا دیار بوو گیانی ئەدا بێ دایك و باوك چاوی بەم لا و بەولادا ئەگێڕا بێ‌دەنگ لەسەر ڕانم چاوەڕێی مردن بوو. کە دایکی و وصفیە بەسەر کارەساتەکەدا هاتنەوە بڕیارمان دا بیگەیەنینە نەخۆشخانە، بەڵام بێ‌سوود بوو گیانی لەدەست دابوو، بوە هاوار هاوارو لەخۆدان، ماڵەکەی ئەودیومان گەیشتنە سەرمان و هەندێ

شتیان لەگەڵ وصفیە جێبەجێ‌کردو تا بەیانی بەوچەشنەماینەوە. بەیانی زوو هاوڕێ کاکە فەلاح هاتەوە بۆ لامان و کارەساتەکەی دی زۆر دڵتەنگ بوو چوە دەرەوەو چەند برادەرێکی لەگەڵ خۆی‌دا هێنا، بەڵام تا ئەو هاتەوە دراوسێکان ئاویان گەرم کردو منداڵەکەیان شت و کفنیان کردو ئامادەکرا بۆ گۆڕستان. من و هاوڕێ کاکەو چەند برادەرەکەو چەند پیاوێکی گەڕەك تەرمەکەمان لەماڵ بردە دەرێ و بردمان بەخاکمان سپاردو گەڕاینەوە بێ‌ئەوەی وەکو مردوی خەڵکی خزم و کەس‌وکارو برادەران لێی گردبنەوە. هەندێ ژن و پیاو هاتن بۆ سەرخۆشی لێمان، ئەمەش ئێمەی خستە هەڵویستێکی سەیرەوەو توشی هەندێ کێشەی کردین، من خۆم کردە برای حمدیەخان و وصفیەش خوشکمان، ئەی باوکی لەکوێیە؟ وتمان لە هەولێر ئیش دەکات و کاکەش برامانەو چەند رۆژێکە هاتووە بۆ سەردانمان، ئەمەمان نەختێ بۆچووە سەر، بەڵام هیچ پارەو پولێکمان لەدەست دا نەبوو شتێك ئامادەکەین بۆ میوانەکان و وەکو ماڵێ خەڵکی پێشوازیان بکەین، تا ژنێکی ئەودیومان هات نەختێ برنجمان هەبوو لەگەڵ سڵقدا یاپراخێکی بۆ ئامادەکردین. بۆ رۆژی دوایی کاکە پارەی بۆ هێناین و لەیەکەم رۆژ باشتر بووین، لەلایەکی کەوە ئەبوایە ئاگاداری ئەوەبین کە ئامێراو نوسراوەکان نەبینن، ئەم کێشەیەشمان بەباشی تێپەڕاندو توشی هیچ گیروگرفتێکی ئەوتۆ نەبووین، هەر لەدوای ئەم کارەساتەش لەگەڕەکدا نەختێ روومان کرایەوەو دۆستمان پەیداکرد، بەڵام زۆر بەوردی لەگەڵیاندا ئەجولاینەوە. کاکە شەو لای ئێمە نەمایەوەو هەموو بەیانیەك زوو ئەهاتە لامان بۆ ئیش هەڵسوڕاندن و رۆژانەشی بۆ ئەهێناین، دایکی سەلیم ئەچوو پێداویستی ئەو رۆژەی ئەکڕی کە زۆرجار لەو پارەیەی بۆی دائەناین هیچی نەئەمایەوە، چونکە تەنها رۆژی ٣٠٠ فلس موچەمان بوو، بێجگە لە کرێ‌خانوو کە خۆی ئەیدا، زۆرجار سەردانی ماڵی کاك فەرەجم ئەکردو بەسەرم ئەکردنەوە، جاروباریش دەنگ و باسی سلێمانیمان لەوێ پێ‌ئەگەیشت.

ڕۆژێ لەو گەڕەکە لەیەکێ لە سەردانەکانم دا رووم بوو بە ڕووی برادەرێکی کۆنی خۆمەوە کە من بەهیچ جۆرێك نەمئەناسیەوەو خۆم لێ لادا، بەڵام ئەو ڕێگەی پێنەدامو لێم هاتەپێشەوەو وتی ئەوە چەند جارێکە بەلامدا دێیت‌و تێئەپەڕێت ئەمویست قسەت لەگەڵدا بکەم بوارم نەئەبوو، دیارە نامناسیتەوە، ئێمە لەسلێمانی پێکەوە قوتابی بوین ناوم (تاریق عبدالرحمن)ە، جا بیرم کەوتەوەو دەستم کردە ملی‌و کەوتمە وتووێژ لەگەڵی بەچەشنێ کە بۆ سەردان هاتومەتە کەرکوك‌و ئەگەڕێمەوە، بەڵام وادیار بوو شتێکی لەبارەمەوە ئەزانی‌و لە کەرکوك زۆری دیبوم ئەیویست بەزەقی لەگەڵمدا بدوێ، من بوارم نەئەدا چونکە نەمئەزانی ئێستە چی‌یەو چی ئەکات.

ئەم برادەرەم کاتی خۆی لەکەرکوکەوە هاتبووە سلێمانی‌و پێنج شەش ساڵێك ئەبوو یەکترمان نەدیبوو باوکی لە سلێمانی فەرمانبەرێکی گەورەی دەسترۆیشتووی ئەو سەردەمە بوو خۆشی قوتابی بوو لەگەڵمان دۆستمان بوو، کوڕێکی زیرەك‌و ڕووخۆش‌و بەئەمەك بوو ساڵێك لامان مانەوەو گەڕانەوە بۆ کەرکوك. وا لێرەش بەم چەشنە یەکترمان بینیەوە، هەچەند داوای لێکردم سەردانیان بکەم‌و یارمەتیم بدا، بەڵام من نەمئەویست تێکەڵاوی ببم لەبەر شوێن‌و کاری حزبیم. ئیتر لەوجارە زیاتر نەمدیەوە، وابزانم ئەگەر لەوێ جێگیربومایە پەیوەندیم لەگەڵ پەیدا ئەکردو کەڵکمان لێوەرئەگرت.

دایکی سەلیم زانی خەڵکی سلێمانیم باسی کاك عوسمان خۆشناوی کردو نەختێ پیاهەڵداو درکانی کە برایەتی، منیش پێم ڕاگەیاند عوسمان هاوڕێ‌و خۆشەویستی منەو بەیەکەوە کاتێکی زۆر ئیشی حزبیمان کردوە، پیاوێکی باش‌و ڕۆشنبیرو شاعیرو تێکۆشەرە، هەر لەمەوە ڕێزو خۆشەویستی خوشك برایەتی ئەوەندەی کە پەرەی سەندو بوینە ماڵێکی ڕێك‌و پێکی حزب.

## هەل و مەرجی تازە

دوای پرسەی ژیان بەچەند رۆژێك نەختێ ماڵەوەمان ژیانی گۆڕاو چاك بوو، هاتوچۆ کەم بۆوەو ئێمەش هاتینەوە سەرخۆمان، بێجگە لە بەڕێوەبردنی ئیش‌و کاری ماڵەوەمان کە خوشکە حەمدیە پیێی هەڵ ئەستا هێچ کارێکمان نەبوو، رۆژ تا ئێوارە کەس نەئەهات بۆ لامان. ئەمە کاتێکی باشی بۆ رەخساندم کە دەست بکەم بە خوێندنەوەی ئەو شتانەی لەبەردەستدا بوون، پاش نیوەڕۆانیش بچمە دەرەوە کە زۆربەی برادەرانی ئەو کاتە ئەبینران بە هۆی ئیش‌وکاری قوتابخانەیانەوە. من دەرامەتم باش بوو ماڵەوەمان هەندێ پارەیان بۆ ناردبووم کاکە ئاگاداری کردم‌و پێ ڕاگەیاندم نابێت بایی پولێك شت بۆ ماڵی حزب بکڕی. بەڵکو چیت بۆ هاتووە خۆت کەڵکی لێ‌وەرگرە. ئەمە بووە هۆی ئەوەی زۆربەی برادەرەکانم خەرجی چایخانەو هەندێ خواردنی ئێوارانیشیان لەلایەن منەوە دابین بکرێت، ئەم بڕیارەی کاکەش نەیتوانی رێگەی ئەوەم لێ‌بگرێ زوربەی ئێواران کەمێ میوەو نان لەگەڵ خۆمدا بەرمەوە ماڵێ بێ‌ئاگاداری ئەو.

هەر لەو ماوەیەدا توانیم لیژنەی یەکێتی قوتابیان پێك بهێنم لەو چەند برادەرەی هەمان بوو کە هەموو رۆژێك یەکترمان ئەبینی لە گۆڕستانەکەی نزیك خۆمان رێگەی سلێمانی‌و جاروباریش لە ماڵی ناسیاوێکی فۆئاد قوتب کۆئەبوینەوە. ئەو برادەرانەش هەریەکەیان شانەیەکی بچوکیان بۆ خۆیان دروست کردبوو بۆ حزب‌و یەکێتی قوتابیان، هەر لەو کاتەدا حزب بڕیاریدا دەبێت هەموو توانایەك تەرخان بکرێت بۆ چوونە ناو کرێکارانی کۆمپانیای نەوتەوە. کە بەلایەنی کەمەوە یەك دوو هێڵی رێك‌وپێکی لێ دروست بکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش چەند هاوڕێیەکیان دەست نیشان کردو کەوتنە ئیش کردن لەم بوارەدا توانرا چەند هەنگاوێکی بچوك بنرێت‌و یەك دوو شانە دروست بکرێت‌و دەست بکەن بە ئیش من چەند هاوڕێیەکی دیانم لە کۆمپانیای نەوت هەبوو وێڕای پەیوەندی رێك‌وپێکی حزبی پێمەوە ئەبوایە یکترمان بدیایەو

پەیوەندیەکی باشی برادەرایەتیشم لەگەڵیاندا پەیدا کردبوو. ڕۆژە نا ڕۆژێ سەرم لێئەدان و نانی نیوەڕۆ یا ئێوارانیشم زۆرجار لای ئەوان ئەخواردو ئەچووینە یانەکانی کۆمپانیا و لەوێ برادەرانی زۆرمان ئەبینی و جاروباریش ئەهاتینە ناو کەرکوک و لەگەڵ خوشک و براکانیان دا هەوەکو ئەوان ڕەفتارم ئەکردو خۆم نیشان ئەداو زوربەی خەڵکی ئەو ناوچەیە بە یەکێ لەوانی ئەزانیم. ئەمە بوە هەلێکی باش بۆم کە خۆم لە زۆر شت بپارێزم و دورکەومەوە لەچاودێری پۆلیس.

ماڵەکەمان هەروەکو وتم هیچ هاوڕێیەک هاتوچۆی نەئەکردین بێجگە لە هاوڕێ حکمان فارس کە هەندێ کات ئەهات بۆ ئیشی چاپ و ئامێرەوکان و زوربەی ئەو کاتانەش ئەهات کە من لەوێ نەئەبووم بەتایبەتی دوای نیوەڕوان ئەو بەینە ژیانمان زۆر ئاسایی بوو هیچ گیروگرفتێ بەرەو ڕوومان نەئەبۆوە، تەنها ڕۆژێک نەبێت کە خوشکە وصفیە بۆ شت کڕین چووبووە دەرێ، لەبازاڕەوە دوو لاوی تەمەنی خۆی نەختێ گەورەتر دوای ئەکەون و دوورو نزیک لەگەڵیدا دێن، ئەمیش ئەزانێ و خۆی لێیان لائەداو ماڵەکە تێئەپەڕێنێ و ئەگەڕێتەوە بازاڕو دێتەوە بەرو ماڵ. ئەمە هێجگار لاوەکان ئەخاتە شکەوە، کە هەندێ جاریش ئاوڕیان لێئەداتەوە بەهیچ جۆرێک وازی لێناهێنن تا ناچار ئەبێت خۆی بکات بەماڵداو من و خوشکە حەمدیە لەماڵ بووین بە هەناسە بڕکێ هاتە ژورێ و کێشەکەی تێگەیاندین. ئەو کاتە من هەر نیازی چوونەدەرەوەم هەبوو کە ئەمەش ڕویدا پەلەم کردو دەرپەڕیمە دەرێ و دوو لاوەکەم بانگ کردو تورەبووم وتم بۆچی دوای خوشکم کەوتون، یەک دوو پیاوی گەڕەکیش هاتن بە هانامەوە و کەوتنە پشتگیری کردنم. کوڕەکان زۆر بە شێنەیی وەرامیان داینەوە بەهەڵە دوای کەوتوین و هەڵەی خۆشی تیایە، کە زوو زوو ئاوڕی لێئەداینەوە و هانی داوین دوای کەوین. داوای لێبوردنیان کردو کێشەکەمان بەم جۆرە تێپەڕان، بەڵام من هاتمە ژورەوە و سەرزەنشتی وصفیەم کرد بەم چەشنە کەڕەتێکی نەچێتە دەرەوە بەجلی ئاڵ و واڵاوەو

سەیری ئەملاوئەولاش نەکات. گەر توانرا لەگەڵ ئافرەتەکەی دراوسێمان دا بچێت بۆ بازاڕ، ئەوەشمان تێگەیاند ئەو دوو لاوە مەترسی جاسوسیان لێناکرێ بەتایبەتی ئەو تەمەنە تەمەنی پۆلیس و فەرمانبەر نی یە.

پاش چەند رۆژێك تێپەڕبوون بەسەر ئەو کێشەیەدا ئەوەندەمان زانی شەو لەناکاو بەچەشنێکی سەیرو بێ رەچاوکردنی وتەی نهێنی، بەدەست و پەلەپەل کەوتنە لێدانی دەرگاو پاڵپێوەنانی، ئەمە ئێمەی زۆر شڵەژان نەختێ دواکەوتین لەدەرگا کردنەوەو من رام کردە سەربان تا گەر شتێ رووبدات بەسەربانەکاندا بۆی دەرچم وەکو لەوەوبەر لەسەری رێك کەوتبوین، دوایی وصفیەش چوو دەرگای کردەوە لاوێکی کەرکوکی کە بە کوردیەکی شەق وشڕ قسەی ئەکرد، حکمانی هێنایە ژوورەوە، حکمانی چی؟ هەمو لەشی خەڵتانی خوێنەو سەرتاپای لەشی لە ئاووقوڕاو هەڵکێشراوەو یەك دوو فیشەك قاچ و رانی پێکاوەو خوێن لێی ئەڕوات و ئەو ناوەی کردە خوێن تا بەردەرگا، هاواری کرد فریام کەون. بەپەلە بردمانە ژوورێ و جلەکانیمان لەبەر داکەندو بەلۆکەو سارغی تۆزێ خوێنەکەیمان بۆ گیرسانەوە تا هاوڕێیەکمان هات تەداوی کرد، پاش نەختێ هاتەوە سەرخۆی و حەسایەوە، ئێمەش حەوش و بەردەرگامان بەچەشنێ سڕی هیچ ئاساری خوێنمان پێوە نەهێشت. تا بەیانی ئەم هاوڕێیە بەم چەشنە مایەوەو ئێمەش بەدیاریەوە. بەتایبەتی من کە زۆر لەگەڵیدا خەریك بووم و دڵخۆشیم ئەدایەوە وەکو هاوڕێیەکی خۆشەویستم ئاگاداریم ئەکرد. بۆ بەیانی کاکەو هاوڕێیەك هاتن و بردیان بۆ لایەکی کە، دوایی بۆمان روون بۆوە کە ئەم هاوڕێیە ئەیەوێت لە پردی خاسە بپەڕێتەوە، پۆلیسێکی ئاسایش ئەبینێ دەنگی لێ ئەکات ئەم بۆی ناوەستێ و رائەکات ئەویش تەقەی لێئەکات و ئەی پێکێ بەڵام ناچێ بەدوایداو لێی دوور ئەکەوێتەوە، چونکە ئەمیش بەچەند فیشەکێ تەقە لەو دەکات، بەهۆی ئەم رووداوەوە ئێمە هیچ ترسێکمان لە دەرکەوتنی ماڵەکە نەبوو، بۆیە هەروەکو خۆمان ماینەوەو تەنها هاتوچۆمان کەم کردەوە، بەڵام هەندێ گۆڕانکاری بەسەرماندا هات و کەوتینە

ژیانێکی باشترەوە، تا کاکەش بە چەشنێکی باشتر ژیانی ئەبردەسەرو زوو زووە ئەهاتە لامان، زۆرجاریش ناخۆشیو نیگەرانی خۆمان دەرئەبڕی بەرامبەر چارەنوسی ئەو هاورێیەمانو خەممان بۆ ئەخوارد هەچەندە زۆر کەرەت دڵمان لێی ئەرەنجا.

ئەو سەردەمە ئیشو کارەکانمان بەجۆرێك رێكوپێك خستبوو لەگەڵ روداوەکاندا زۆر بەشێنەییو لەسەرخۆ ئەجولاینەوە، ئەمانویست هەنگاوەکانمان زیاتر چەسپاو ئاشکراتر بێت، ئەو ترسو خۆشاردنەوەیە لای خەڵکی نەهێڵین، بەتایبەتی کە کاتی خۆئامادەکردن بوو بۆ مهرەجانی قوتابیانو لاوان لە پایتەختی پۆڵۆنیا (وارشۆ)، ئێمەش لە کەرکوك لیژنەیەکمان بۆ ئەو مەبەستە پێك هێنا کە سەرپەرشتی سلێمانیو هەولێریشی ئەکرد، لەگەڵ چەند لیژنەیەکی لاوەکی لە کەرکوك لە برادەرانی رۆشنبیرو بێلایەنو چەند کەسایەتیەکی ناودار کە توانیان تا رادەیەك هەنگاوی سەرکەوتوو بنێن بۆ ئەم مەبەستە، لەهەولێریش هەروا، بەلام لە سلێمانی ئیشمان بەباشی ئەرۆیشت بەرێوەو ئەوەندە تەگەرەی نەئەهاتە بەرو توانرا کۆمەڵێك دیاری باش بگەیەنرێتە لامان کە بریتی بوو لە چەند تەزبیحێکی قەزوانی ئەبلەقی نایابو دەستێ رانكو چۆغەی خورمایی چاكو چەند دەستێ جلی کوردی ژنانو منالانو یەك دوو جووت پانی بەرزی ژنانو جوتێ کلاشی هەورامیو هەندێ خواردنی کوردی لەدەنکە کولەکەو گوێزو باسوقو حەڵوای گەزۆو هەندێ شتی کە، لەکەرکوكو هەولێریشەوە برێك کەلو پەلمان بەدەست گەیشت، بەلام بەداخەوە ئەمانە هیچیان نەتوانرا بگەیەنرێتە بەغدا لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتیو رێكوپێکی ناوخۆو ئاڵۆزی رێگاو کەمتەرخەمی هاورێیانیش کە بەربەستی ئەو کارەیان ئەکرد بێ لێپرسینەوەو خۆلێپرسراوی مێژویی کە ئێمەیان لەهیچ شتێ ئاگادار نەکردەوەو دیوارێکی ئەستوریان لەبەردەمماندا دروست کردو کاتی دیاری کراویان لێشاردینەوەو لە بەغداو هەموو شتێ بەبۆچونی خۆیانو سەربەخۆ

جێبەجێکراو وەفدە گشتیەکە هەر لەوێوە بەڕێ کەوت و ئەمانەی ئێمەیان وەلاخست و لێیان نەپرسینەوە، بەڵام وابزانم کاك نائب عبدالله و حسین عارف چووبوونە لایان و لە عێراقیش چووبونە دەرێ و هەروا گەڕابونەوە بێ ئەوەی بگەنە جێگەی میهرەجان. دیاریەکان تا ماوەیەك لای ئێمە مایەوە، خواردنەکەمان بەرەبەر خواردو تەواومان کرد، جل و کەل وپەلەکانیش کاکە لەگەڵ خۆی بردی بۆ لایەکی کە، تەزبیحەکانیش هەر هەمووی بوە ماڵی من و دەستم بەسەریدا گرت و بە باشترین مافی رەوای خۆمم ئەزانی چونکە هەرمن بوم حەزی زۆرم لە تەزبیجی قەزوانی ئەبلەق بوو، هەر لە منداڵیەوە خولیای کۆکردنەوەیانم هەبوو، بووبوە هیوایەت و پیشەم. جا بەراستی ئەمانە شتێکی نایاب و نادر بوون و تا چەند ساڵێك زۆربەیانم لامابۆوە. جوانترینیانم لە ساڵی ١٩٥٦ لە بەدرە بەخشی بە هاوڕێی خۆشەویستم عبدالرحمن قصاب کە یەکێك بوو لە تێکۆشەرەکانی موصل لەگەڵماندا.

هەموو ئێوارانێ ئەچوومە دەرێ لەماڵ و ئەکەوتمە گەڕان و بینینی برادەرانی قوتابی و هاوڕێیانی حزب. جێگەی دانیشتنمان چایخانەی احمد ئاغا یان ئەتلەس بوو هەمووان لەوێ یەکترمان ئەبینی بێجگە لەم برادەرانە چەند برادەرێکی سەربازیش بووبوونە دۆستم و زوربەی کات لەگەڵم دا بوون، هەر هەموش لایەنگر یان دۆستی حزب بوون، یەك دوانێکیان خەڵکی سلێمانی بوون لە کەرکوك ئینزیبات بوون منیان زۆر خۆش ئەویست و هەردەم پێکەوە بووین بەتایبەتی کە ئەیانزانی سەربازی هەڵاتوم، زیاتر بۆ ئەوەی پارێزگاریم بکەن لە گرتن و راونان، ئیشەکانم زۆری بەهۆی ئەوانەوە رائەپەڕاند، لەوانە نائب عریف حمە صالح مچەحاجی و عریف ابراهیم و برادەرێکی کەرکوکی، هەمووجارێ لەگەڵمدا ئەیانکردە پێکەنین و گاڵتە گەر نانیان بۆ نەکرم و پارەی چایان بۆ نەدەن ئەمکەنە دەستەگوڵی خۆیان بۆ ئینزیباتخانە، هەندێجار داخوازیەکانیان ئەهاتەدی و لەسەر حسابی من ئەو رۆژەیان ئەبردەسەر، زۆرجاریش بەرو روویان ئەبومەوەو بێبەش ئەبون و ئەبوە پێکەنین و وازیان

لێئەهێنام، ڕۆژانی دوورودرێژمان ئەم چەشنە ئەبردەسەر، بێجگە لە ئیشی ڕێکوپێكو یاری تاوڵەو دۆمینەو پیاسەی زۆر لەدەوروبەری کەرکوك. هەموو سەری مانگێك هەرکامیان بگەڕایەتەوە سلێمانی سەری ماڵی ئێمەی ئەداو بەکۆمەڵێ جل‌وبەرگو خواردنەوە لەگەڵ هەندێ پارەو ئەیانوت باوکت پێی ڕاگەیاندوین ئەم پارەیە هی هەموتانەو بژێوی ژیانتانی پێ‌بەرنەسەر، بۆیە هەموو کات خۆیان بەشەریکە بەشم دائەنا، هەرچەند منیش کەمتەرخەمیم لێنەئەکردن. جارێك باوکم نیازی ئەبێت لەگەڵیاندا بێتە کەرکوك بۆ بینینم، بەڵام ئەوان بە باشیان نەزانی‌بوو، بۆ پاراستنی من‌و دورکەوتنەوەی باوکم لەتەنگو چەڵەمە، هەرچەند لەو باوەڕەدا بووم هاتنی باوکم شتێکی ئاسایی بوو ئەمانتوانی لە ئوتێلێ یا ماڵی برادەرێ دامان نایەو من بە نهێنی ئەچوم بۆ سەردانی، بەڵام تازە بڕیارەکەیان دابوو منیشیان لە بینینی باوکم دورخستەوە.

چایخانەیەکی گەورە هەبوو لەخوار شەقامی قۆریەوە نزیك گاوربـاخی‌و جێگەیەکی خۆش‌و باش بوو بۆ حەوانەوەو کات بردنەسەر، هەموو جۆرە یاریەکی فۆلکلۆری تیادا سازئەکراو شەو لە سەربانەکەی جێگا ڕائەخرا ئەبووە شەربەت‌و چا خواردنەوەو یاری کردنی کڵاوکڵاوێن‌و فنجان فنجانی‌و سەماو گۆرانی وتن‌و زۆر یاری کە کە تا شەوێکی درەنگ بەردەوام ئەبوو، منیش بێ‌ئاگاداری برادەران بەنهێنی ئەچوومە ئەوێ‌و کاتێکی باشم ئەبردەسەر، زۆر برادەری باشم لەوێ پەیداکردو پێم ڕاگەیاندن فەرمانبەرم لە دائیرەی کارەباو کەس ناناسم تازە هاتومەتە کەرکوك، بۆیە زۆر دڵنەوایی‌یان ئەکردم‌و لەگەڵمدا ڕێك بوون. بەمەرجێ بەهیچ جۆرێ توخنی باسی سیاسەت نەئەکەوتم لەگەڵیاندا، وابزانم تا لەکەرکوك بوم برادەرەکانم نەیان ئەزانی شەو ئەچمە ئەو چایخانەیەو خۆشم نەمئەزانی بۆچی ئەبێ لێیان بشارمەوە چونکە هیچ کارێکی نهێنی منی تیادا نەبوو، یا کارێکی خراپ نەبوو، بەڵام هەر لە منداڵیمەوە فێری ئەوە بووبووم کە هەردەم کاتێکی دیاری کراوی کەم دابنێم بۆ حەوانەوەی خۆم‌و بەسەر بردنی ئەو کاتە بەپێی ڕەغبەتی کەسایەتی خۆم‌و

دوور لەو کەشەی تیادا ئەژیم و گرتنی هاوڕێیەتی لەگەڵ زوربەی خەڵکی جۆربەجۆرو خاوەن پیشەو بیروباوەڕی سیستەمی ژیانی تایبەتیان کە زۆر دوور بووم لێیانەوە وەکو هاوڕێیەتی برایانی پارتی و ئەوانەی دژ بە حزب و جوڵانەوەکەمان بوون، دانیشتنی هەمیشەیی لەگەڵ ئەو برایانەی خەریکی خواردنەوە بوون کە باسی سیاسەت لایان شتێکی سەیروسەمەرە بوو، ئەمانە ژیانی تایبەتی خۆم بوون هەردەم توشی کێشەی ئەکردم لەگەڵ برادەران دا.

زۆرجار دەنگ و باسی شعیبەم بۆ ئەهات کە برادەرانی زۆریان بۆ بردوەو ئێستا گوزەرانیان باشەو کۆنەکان زوربەیان دەرچوون. بەڵام سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو نەبوو پشتگیری ئەو هەواڵانە بکات، ئێمەش ئەوەندە گرنگیمان پێ نەئەداو لەگەڵ ئیش و کاری ئەوێدا راهاتبووم و بگرە خۆش بوو بەم چەشنە بمێنمەوە، لەبەر بەرژەوەندی حزب و یەکێتی، هەندێ جاریش هەر لەماڵەوە ئەم چەشنە هەواڵانەم پێ ئەگەیشت و لاگوێم ئەخست و گوێم نەئەدایە، تا رۆژێك برادەرێکی باوەڕپێکراومان پێی راگەیاندین هەر سەربازێك بەدەلی داوە یا ئەیدا یەکسەر دەرئەچێت، خۆی ئەم بڕیارەی دیوەو یەك دوو برادەری کەرکوکی گەڕاونەتەوە، پەیوەندیمان لەگەڵیان کردو وتیان لێبوردنی گشتی دەرچووەو هەر سەربازێك بیەوێ دەرئەچێت گەر ئیشەکانی بۆ تەواوبکرێت، ئەوسا هەر هاولاتیەك بکرایە بە سەرباز بۆ سێ مانگ سەربازی ئەکردو پەنجا دیناری ئەداو دەرئەچوو، ئەوەی دەرامەتی نەبوایە ئەبوایە ١٨ مانگ سەربازی بکردایە، ئەوەی قوتابی بوایە سەربازی نەئەکرد، یا باوکی و یەکێ لە خێزانەکەی بەخێو بکردایە سەربازی نەئەکرد تا ئەوان لە ژیاندا بوونایەو بەهیچ جۆرێك دوو برا بەیەکەوە نەئەکران بە سەرباز، ئەمانەو زۆر شتی کە کە یاسا چەسپاندبووی، لەگەڵ ئەوەشدا زوربەی سەربازەکان کوڕە هەژارو چەوساوەکان بوون. بێجگە لەوەش (تطوع) هەبوو کە ئەو هاولاتیە خۆی ئەبووە سەربازو هەندێ پارەی زیاتری وەرئەگرت و جێگەو رێگەی لەوانی کە باشتر بوو، ئەفسەرانیش کوڕە دەوڵەمەندو دەست رۆیوەکان بوون کە کۆلیژی

سەربازیان تەواو ئەکرد. بێجگە لە بەشێکی زۆر کەمی کوڕە هەژارەکان نەبێت کە تێکەڵاوی ئەم توێژە ئەبوون، میری لەو سەردەمەدا بەدەلی کردە (١٠٠) دینار بۆ بەرژەوەندی خۆیو ڕێگەگرتن لە خەڵکی کە لە سەربازی بەو نیوە پارەیە دەرنەچن، بەستنی حلفی بەغدا بۆ ئەم مەسەلەیە لەو کاتەدا دەوری هەبوو.
شەو لەگەڵ کاکە لەماڵەوە کەوتمە باسی لێبوردنو دەرچوونم تا بزانم رایان چی‌یەو بڕیاری چی ئەدەنو من ئامادەم پەیڕەوی بڕیاری ئەوان بکەم، کە دەریش چم بە ئاشکرا ئیشەکانم باشتر ئەڕوا بەڕێوە، بەڵام مەرج نی‌یە لە کەرکوك لای ئەوان بمێنمەوە، ئەمە جێگەی وتووێژو لێکۆڵینەوە بوو، پێشەکی نەیان توانی یان نەیان ئەزانی چۆن ئەبێت کاتی دەرچوونمو هەلو مەرجی ئەو سەردەمە، بەڵام تەنها گەڕانەوەم بۆ سەربازی کاکە لای پەسەندبوو ووتی خۆت ئەزانی ئێمە هیچ پارەیەکمان لا نی‌یەو هیچمان بۆ هەڵناسوڕێ بیدەین بە بەدەل ئەبێت خۆت شتێ هەڵسوڕێنی، هەرچەند خۆم نیازی ئەوەم هەبوو ئەبێ ماڵەوە ئاگادارکەم لەو روەوە، کە تەنها خەرجی ڕێگام ئەویست چونکە کاتی خۆی من (١٠٠) دینارەکەم درابوو بەبەدەل، جا دەربارەی پارەی من یا حزب وابزانم کاکەش ئەوەی باش ئەزانی، ئێمە لە مێژووی تێکۆشانماندا ئەوەندەی نەختێ ئەرکمان نەخستۆتە سەر حزب، بەڵکو هەموو شتێکمان هەر لە گیرفانی خۆمان بووەو بەو چەشنە تێکۆشاوین، ماڵو حاڵو پارەو خانوبەرەمان لە پێناوی ئەو میللەتەدا بەخشیوە، بێ‌ئەوەی بیر لەوە بکەینەوە رۆژێ لەرۆژان کەڵك لەو ئیشەمان وەربگرینو بەرژەوەندی خۆمان بخەینە پێش بەرژەوەندی میللەتەوە، هەر ئەمەش بوو جێگەی ڕێزو خۆشەویستی هەموو برادەرانو میللەتەکەمان بووین.

ئەو شەوەمان بە خۆشی لەماڵەوە بردە سەر، بۆ بەیانی چوومە لای برادەرانو کاك -حمەصالح-م نارد بۆ سلێمانی بۆ لای باوکمو هەواڵی منی پێ‌ڕاگەیاندبوو، دەربارەی لێبوردنو بەدەل وەرگرتنیش وتووێژێکی دوورودرێژی لەگەڵ کردبوو، باوکم هەروەکو پیشەی جارانی لە خۆبەخت

کردن و پشتگیری ئێمەداو درێغی نەکردن لە قوربانی دان لە ڕێگەی پیرۆزی جولانەوەکەمانداو پشت گیری لە ڕۆڵەکانی میللەت، پێی ڕاگەیاندبوون بە ماڵ و گیان هاوکاری هەموو لایەك ئەکاو پشتگیریان ئەبێت، ئیتر چۆن بۆ کوڕی خۆی کەمتەرخەمی ئەکات و چی ئەڵێن ئامادەم، بۆیە پێیڕاگەیاندبوون ئەزانم دەمێکە بەدەڵی ١٠٠ دینارم بۆ داوە ئەوەش وەصلەکەیەتی بۆی بەرن، با بڕواتەوەو رزگاری ببێ و بگەڕێتەوە ناومان، گەر ئەڵێن خۆم دێم ئەیبەم بۆ بصرە ئەوەش پارە بۆ ڕێگای، بەڵام برادەرەکەم پێی ڕاگەیاندبوو کە برادەرێکی خۆمان هەیە وەکو پاسەوان لەسەر حسابی تجنید تا بەغدای ئەبات و ئاگای لێی ئەبێت.

برادەرەکەم کە گەڕایەوە هەموو ئەم شتانەی بۆ باس کردین، بە خۆشی حۆشی و دورودرێژی ئەیخوازی هەموو باوکێك وابێ کە جێگەی شانازی هەموان بێت و بڕای بڕای لەبیر نەچێتەوە، پێشەکی خۆمان نانێکی باشمان خواردو لە گەڕانەوەمدا بۆ ماڵەوە بەشی ئەوانیشم بردەوەو کردمانە بۆنەیەکی خۆش، کاکەش ئەو شەوە هاتەوە بۆ لامان و تا کاتێکی زۆر لەگەڵماندا مایەوەو هەموو شتێکمان باس کردو بۆ دواجار لەو سەردەمەدا یەکترمان ماچ کردو لێك جیا بوینەوە، ئێمەش شەو تا درەنگ کاتمان بردەسەر، بەیانی زوو دوای ماڵئاوایی لە خوشکە حەمدیەو منداڵەکان ماڵەوەم بەجێهێشت و بەرەو ماڵی کاك حەمەصالح بەڕێکەوتم لەوێش برادەرێك چاوەڕێی ئەکردم و یەکترمان بینی و دووفۆڵی بەرەو ئینزیباتخانە بووینەوە.

## گەڕانەوەم بۆ سەربازی

لەگەڵ برادەرەکەم دا گەیشتینە ئینزیباتخانەو یەکسەر چووینە بەردەمی ئەفسەری لێپرسراو کە وادیاربوو ناسیاوی نزیکی برادەرەکەم بێت و کوڕێکی باش بێت، چونکە زۆر بە جوانی بەپیرمانەوە هات و پێشوازی لێکردین و ڕێزێکی تایبەتی بۆ دانایین، برادەرەکەمان پێی ڕاگەیاند ئەمە ئەو برادەرەیە

کە باسمان کرد، بە ڕوویەکی خۆشەوە وەصلی بەدەڵو پێناسەکەی لێوەرگرتمو سەربازێکی بانگ کرد بچێت بیکات بە کتاب بۆ شعیبە کە بە نادم گەڕاوەتەوەو لێبوردنی گشتی ئەیگرێتەوەو مافی دەرچوونم هەیە لە سەربازی، کاتێکی کەمی خایاند کتابەکەیان دایە دەستمانو ئەوێمان بەجێهێشت، بەجووتە چوینە لای برادەرەکانمان لە چایخانەی احمدئاغا کە پێشەکی لەوێ دامان نابوونو چاوەڕێیان ئەکردین، یەکەمجاریشمان بوو بە سەرەبستی دانیشینو وتووێژ بکەینو کاتێکی خۆش بەیەکەوە بەرینەسەر. دوای ئەوان لە چایخانەیەکی نزیک ماڵی کاک فوئاد قوتب لەگەڵ هەندێ قوتابیانی لیژنەی کەرکوك دا دانیشتنێکی دووردرێژمان کرد کە باس لەسەر ئیشی لەمەودواو پەیوەندی نوێیان کراو هیوای سەرکەوتنم بۆ خواستن لە ئیشەکانیان داو داوای بەردەوامیم لێکردن لە تێکۆشانداو دوعاخوازیم لێکردن. بۆ ئێوارە لەگەڵ برادەرە پاسەوانەکەمدا بەرەو ئێستگەی شەمەندەفەری بەغدا بەرێ کەوتینو جێگەی خۆمان گرت لە تەنیشت چەند کەسێکەوە کە هیچیانمان نەئەناسیو بێدەنگ هەردوکمان لەگەڵ یەکدا ئەدواینو کاتمان ئەبردەسەر، هەرزوو هیلاك بوینو بۆ کاتێکی کەم چاومان لێك نا، نیوەشەو لە شیڕەشیڕی پیرێژنێ کە بە تورکی هاواری ئەکرد بەخەبەرهاتین، پرسیمان ئەو هەراوهوریایە چییە؟ ووتیان ئەم پیرێژنە پارەیان لێدزیوەو داوای ئەکاتەوەو شەڕ بە هاوسێکانی ئەفرۆشێ، ئەمانە بێدەنگ بوون لە لایەکی کەوە بووە هەرا لەسەر جێگا داگیرکردن لەلایەن چەند کەسێکەوە کە هەریەکەی سەبەتەیە میوەی پێبوو لە شارەبان سەرکەوتن بۆ ناو شەمەندەفەرەکە بێجگە لە هاواری چای حەسەنێ عێراقی کە هەردەم خەڵکەکەی بەئاگا ئەهێنایەوە، ئەو کاتە ڕێگەی کەرکوك – بەغدا زیاتر بەشەمەندەفەر بوو، لەبەر ئەوە هاتوچۆکەران زۆر زۆر بوون، لەگەڵ ئەوەی لە ڕێگا تا ئەگەیشتە جێ خەڵکی ئەمبەرو ئەوبەری ڕێگە بە کۆمەڵ لەهەموو وەستانێکدا ئەهاتنە سەرەوەو ئەبووە هەلا، یەکێك سەرئەکەوت یەکێك

دائەبەزی، شەڕ ئەبوو دزی ئەکرا لەسەر جێگە دەست ئەخرایە بینی یەکتر، زۆرجار لەکاتی ڕۆیشتن دا خەڵکی ئەپەڕینە خوارێ کە خۆیان هەڵئەواسی کەسیش بەفریایان نەئەکەوت، زۆر شتی سەیرو سەمەرە بەرچاو ئەکەوت، بێجگە لەوەی لە زۆرلاوە کۆڕی گۆرانیو سەماو یاری ئەبەسترا، جامە ماستو چەرەس فرۆشو هاواری پاکەتو جگەرە ئەو ناوەی هەراسان ئەکرد، گەڕانی مراقبی تکت بو سواربوون کە بە شوێن ئەوانەدا ئەگەڕان کە بەبێ پارە سوار بوو بوونو زۆر شتی کە ناوفارغۆنەکانی ئەکردە ئاژاوەیەکی سەرسوڕهێنەر، ئەمەی باسم کرد بۆ فارغۆنی دەرەجە سێ بوو بۆی بڕابۆوە کە جێگەی هەژارو کاسب کارو قوتابیو سەربازو بێدەرامەتەکان بوو، فارغۆنی یەكو دووش هەبوو کە ژوری تایبەتو جێگەی نوستنو حەوانەوەیەکی چاك بوو کە دانیشتوان گوێیان لەهیچ نەئەبوو، کەسێکیان نەئەبینی تا دائەبەزین، مەگەر بۆ گەڕانێ یان چاوبڕکێیەك لەدەرەوە بوونایە، ئەم کارەش هەموو کاتێك خەڵكێك هەبوون کردبویانە پیشەیان.

بەم چەشنە ئەو شەوەمان بردەسەر، کاتێ بەیانی زوو گەیشتینە بەغداو بەو ناوچەیەدا تێپەڕبووین کە ماڵە حزبیەکەی لێبوو، تێم ڕوانیو لەدڵێ خۆم دا وتم وا ئەمجارەش ئەو شوێنە پیرۆزو دێرینەم بینیەوەو چاوم پێی هەڵهات، تا ئەو شوێنەمان تێپەڕاندو گەیشتینە مەڵبەندی سەرەکیو شەمەندەفەر وەستاو هەموو دابەزین، نۆرە هاتە سەر ئەوەی بگەینە ئوتێلێ تیا بحەوێینەوە، کە دیسان ئوتێلی (شمال الكبير)م هەڵبژاردو ڕوومان تێکردو سەرکەوتینە سەرەوەو جێگەمان بۆ ئامادەکرا، بەڵام من ئەوەندە نەمامەوەو پاسەوانەکەم بەجێهێشتو بەتەنها چووم برادەرانم ببینم، بەڵام کەسی وا دەست نەکەوت برادەرێك نەبێت، کاتێکی زۆرم لەگەڵیدا بردەسەرو پێم ڕاگەیاند کە هاتومو خۆم داوە بەدەستەوەو ئەگەڕێمەوە بۆ شعیبەو بۆ کاتێکی کەم وەدەرئەچم سەرکردایەتی حزبیش لە کەرکوك ئەم کارەیان پەسەند کردووە، ئەمیش زۆری پێخۆش بوو دەست خۆشی لێکردمو داوای

سەركەوتنی بۆ كردم، هەر لەو دانیشتنەدا بەدوورودرێژی باسی ڕێك‌وپێكی كەركوكم بۆ كردو ئیشەكانی خۆمانم بۆ هەڵسەنگاندو داوای ئەوەم لێكرد بیگەیەنێ بە حزب لەگەڵ سڵاوو ڕێزمان دا، هەر ئەو كاتە لابەلا نەختێ لە كێشەی خۆمان‌و -حكمان فارس-م تێگەیاند، بەڵام ئەو برادەرە بەهیچ جۆرێك نەئەچووە ژێری وەكو پشت گیری ئەو بكات‌و نەیەوێت لەو كێشەیە بدوێت‌و بازی بەسەردا بدات، ئەمە منی خستە بۆچوونێكەوە كە وادیارە زوربەی برادەران وا لەم كێشەیە بگەن‌و نەشتوانن چارەسەری بكەن‌و چارەی برادەرانی كوردیان نەوێت. هەرچۆنێك بێت باس كردنی ئەو شتانە كارێكی باش بوو كەمێك برادەرانی ئەخستە بیركردنەوەیكی نوێوە گەر چارەشیان پێ‌نەكرایە.

ئێوارەیەكی درەنگ گەڕامەوە ئوتێل‌و برادەرە پاسەوانەكەم چاوەڕێ‌ی ئەكردم، بەیەكەوە ئەو شەوەمان بردەسەرو بەیانی خۆمان ئامادەكرد بەرەو دائیرەی تەسفیرات بووینەوە، لەوێ من‌و كتابەكەمی دایە دەست ئەوان‌و بەجێ‌ی هێشتم بەڵام چۆن بەجێ‌هێشتنێ، یەكەم جار بردمیانە لای ئەفسەرێ هەربە چوونە ژورەوەم دەستی كرد بە قسەی پڕوپوچ‌و هێرش بردنەسەرم، وەكو هەر ئەفسەرێكی كە كەوتە شیكردنەوەی توندوتیژی یاسای سەربازی‌و سزاكانی هەڵاتن. هەرچەندە ئەمویست پێ‌ی ڕاگەیەنم كە من قوتابیم‌و كاتی خۆی بێ‌یاسا كراوم بە سەربازو ئێستا بەدەل چیم‌و ئەمەوێ دەرچم‌و هیچم لەسەر نی‌یەو كاتی لێبوردنەو بەپێ‌ی خۆم هاتومەتەوە، ئەو هەر لەسەر قسەی خۆی بەردەوام بوو، هیچ شتێ بەمێشكیدا نەئەچوو، هەڕەشەی ئەوەی لێ‌ئەكردم كە لای ئەوان ئەمێنمەوە تا ئەڕزێم. ڕەوانەكردنم نی‌یە، هەردەم ئەیوتەوە كە ئەم هەڵاتوانە ئێمەیان باش هیلاك كردووە، جارجاریش بە تەوسەوە ئەیوت تۆ كوڕی باشی میوانی خۆمان بەو نەختێ بحەسێرەوە، زۆر سەیربوو هەروەكو چەند ساڵێك بێ بمناسی‌و بیەوێ ئەو كاتەی بەدەستیەوەیەتی تۆڵەم لێ‌بكاتەوە، یا وادیاربوو ئەمەیان بۆیە لەو جێگەیە دانابوو بۆ هەموو كەسێ خراپ بێت‌و ئازاری سەربازە بەندیەكان بدات، هەرچەندە خۆشی ڕادەی

ڕەوشتی هەرئەوەندە بوو، بێجگە لە بیرو باوەڕی کۆنەپەرستی و دژایەتی کردنی هەموو نەریتێکی نیشتمانی، پاش گوێگرتن و وەستان لەبەردەم ئەم ئەفسەرە قیرسچمەیە بە پاڵ بردمیانە ژورێکی بچوکی تاریکەوە کە چەند سەربازێکی گیراوی تیابوو، پیس و پۆخڵ، قژو ریش هاتوو، لەسەر زەوی وەکو ئاژەڵ راکشابوون، قاچ لەسەر قاچ بەیەکەوە نوساو، بێ ئەوەی بواری جوڵانەوەشیان هەبێت لەبەر تەسکی ژورەکە، هەریەکەی پۆستاڵەکەی یا کراسەکەی کردبوە سەرین و پاڵی لێدابۆوە، بۆگەنی ئارەق و پیسی خەڵکی گێژ ئەکرد. بۆ نەگبەتی زوربەیان جگەرەکێش بوون و جگەرەیان بەجگەرە دائەگیرسان، ئەم جێگەیە ئەبوایە یەك دوو شەو زیاتر کەسیان نەهێشتایەوە چونکە شوێنی رەوانە کردن بوو، بەڵام لەبەر بەرژەوەندی خۆیان و خەرج کردنی رۆژانەی دیلەکان کاتێکی زۆر ئەیانهێشتنەوە تا بەرەبەرە زۆرتر ئەبوون بە بیانوی ئەوەی گوایە توانای رەوانەکردنیان نی یە، زوربەی جاریش چەند کەسێکیان بە پارە بەرئەداو دەریان ئەکردنە دەرێ، ئەمانە تەنها لە شەقامەکان یان هەندێ شوێنی کە گیرابوون گوایە لە سەربازی هەڵاتوون، جا هاتنە ژورەوەی من کە ئەفەندیەکی پاك و خاوێنی سەروریش تاشراو بووم و جل و بەرگێکی باشم لەبەردابوو لەپڕ کەوتمە ئەو کوڕەوە، سەیریان لێئەهات کە بەم جۆرە سەربازێك ببینن، وایان ئەزانی بۆ سەعاتێ گیراوم و سەرم و ئەقەبڵێنم و هەرئێستاش دەرئەچم، بۆیە کاتێکی زۆر بەم رەنگە مامەوە، تا یەکێکیان هاتە لامەوەو کەوتە پرسیارکردن لێم و کەوتینە گفتوگۆیەکی دوقۆڵی بەزوویی تێمگەیشت، کێشەی ئێمەی بیستبوو کە لە شعبیە معسکری زۆرەملێمان بۆ کراوەتەوە، کەوتە دڵنەوایم و لای خۆیەوە جێگەیەکی بچوکی تەنها بۆ دانیشتن دامێ و هەندێ خزمەتی کردم. یەك دوو شەو مامەوەو زۆر ناخۆشیم دی و بێتاقەت بووم، هەرچەندە پارەی باخەڵم نەختێ یارمەتی ئەدام و هەندێ شتی بۆ ئاسان ئەکردم. لەگەڵ برادەرەکەمدا کەوتمە باسی رەوانەکردنم کە دواکەوتنم بەوجۆرە هیچ شتێ نابەخشێ تەنها سزادان نەبێت، برادەرەکەم

وتی ئەمانە هیچ لەو بابەتانە ناکۆڵنەوەو نەیانکردۆتە پیشەیان تەنها ئەوە نەبێت هەموو کارێکیان بۆ پارەیە، بۆ پارە هەموو کارێك جێبەجێ ئەکەن، ئەم دواکەوتنەش بۆ ئەوەیە ئیشەکەت بەپارە بۆ بکەن و رەوانەت بکەن و لەم جێگە پیسە رزگارت بێت، ئەگەر وانەبێت ئەتهێڵنەوە بۆ کاتی تەسفیرات کە هەفتەی جارێکەو لەوانەیە یەکسەر بۆ بصرەش نەبێت، چونکە تا ئێستا نەماندیوە سەربازێك بۆ بصرە رەوانە بکەن، بیرم کردەوە ئیشەکەم گەندەڵەو هەر ئەبێ لێرە دانیشم یاخود دوای چەند رۆژێك رەوانەی عمارە یا کوتم بکەن هەر ناگەمە لای خۆمان، لەبەر ئەوە بە برادەرەکەم ووت من پارەم پێیە بزانە هەوڵێکم بۆ بدە کارەکەم بۆ سازبکرێت، پاسەوانەکەش لەسەر حسابی خۆم بەرم، ئەو یەك دوو شەوە هەرچەندە ئەو برادەرە بێبەرامبەر خزمەتی ئەکردم و خۆشی ئەویستم، بەڵام منیش زۆر یارمەتیم ئەداو بەکەڵکی ئەهاتم لەبەر ئەوە زۆر بەتەنگمەوە ئەهات، بۆیە بڕیاری ئەوەی دا ئەم کێشەیەم لەکۆڵ بکاتەوە، هەرزوو چووە بەردەرگای ژوورەکەو عەریفێکی بانگ کردو نەختێ لەگەڵیدا دواو وتی عەریف -نەجم-م راسپارد بچێ بۆ لای ئەفسەرەکەو شتێکی بخاتە دەمو ئیشەکەت جێبەجێ بێت، شتێکیش ئەدەین بە خۆی، من بێچەندوچوون دەست خۆشیم لێکردو وتم چەند ئەڵێت ئامادەم. ئەوەندەی نەبرد عەریف نەجم هاتەوەو برادەرەکەی بانگ کردو سەری خۆمان قەبڵان پاش سەعاتێك هاوارکرا کێیە ئەچێت بۆ بصرە با بێت ببیینم، بەهەڵەداوان چومە بەردەرگاکە تەماشام کرد پیاوێکی کورتەبنەی قەڵەوی رووت و قووت بە دەرپێیەکی خامی کوڵەوە وەستا بەرەو رووم و بەدەنگێکی بەرز ووتی تۆی ئەچیت بۆ بصرە؟ ووتم بەڵێ، ووتی خۆت ئامادەکە من لەگەڵتام بە مأموری. ئامادەیی خۆمم بۆ دەرخست و ووتم بەڵێ باشە، هەرچەند لێکم دایەوە من لەگەڵ ئەم کابرایە تا بصرە چۆن دەرئەبەم، هەر بەقسەکردن و سەرجوڵاندن و چرچ و لۆچی دەموچاویدا کەوتمە گومانەوە لێی کە کابرایەکی خراپ و دەغەزاربێت، خۆ من پزیشکی نەفسانیش نەبووم تا ئەوە بسەلمێنم، بەڵام هەر

لەخۆمەوە کەوتمە ئەو گومانە، هەرچەندە دڵی خۆم بەوە خۆش کرد هەرچۆنێك بێ خۆم لەگەڵیدا ئەسازێنم من چیم ئەوێ لێی تەنها تۆزێ ئاگای لێم بێت، هەمووی چەند سەعاتێکەو ئەگەینە بصرە، پاش سەعاتێك بانگیان کردمو بردمیانە بەردەم ئەفسەرێك کە ئەوەی پێشوو نەبوو، پێی ڕاگەیاندم لەسەر حسابی خۆت ئەڕۆیت بۆ بصرە لەگەڵ پاسەوانێك دا، سەری ڕەزامەندیم بۆ جوڵاندەوە کە دیاربوو ئەو ئیشەکەی بۆ سازکردین بەرامبەر چەند دینارێك هەرچەندە پیاوێکی هێمنو لەسەرخۆ بوو هەندێ قسەی بۆ کردم کە هەمووی بە شێنەیی و بێهەڵچوون ئەدا بە گوێم دا کە کەڵك لە خوێندنو قوتابخانە وەرگرینو دابینی ژیانی خۆمان بکەینو بە قسەی ئەمو ئەو نەکەین، ئەیویست بڵێت سیاسەت مەکەن، بۆ چەند چرکەیەك چی پێبوو هەمووی ووتو سەربازەکەی بانگ کردو بەرەو رووی کردمەوەو لەگەڵیا چرپەیەکی بەگوێدا داو هاتینە دەرێ، هەروەکو بۆی چووبووم ئەو فرنەگولەیە کەوتە پاڵپێوەنانمو هاوار بەسەرما کە بێمە ئەملاوەو بوەستمو نەجوڵێم، کەلەپچەیەکی ئەمریکی تازەی کردە دەستو دامیەپێش خۆی، ئەم کەلەپچە تازانە وەك ئەوانەی تر نەبوو تا بجوڵایتایە یا دەستت لێبدایە تەسك تر ئەبۆوەو ئەچەسپیە مەچەکتو ئازاری ئەدایت، کەوتمە پێشیو ناچار وردەوردە لە پێشیەوە ئەڕۆیشتمو جارناجارێ ئاورێکی ناڕەزایم لێئەدایەوە، بیرم ئەکردەوە چۆن بیجوڵێنمو بکەومە گفتوگۆ لەگەڵیدا، پێم ووت با نانێك بخۆینو ئەوسا ئەکەوینە رێگە، وەرامی نەدایەوەو لێم دووبارە کردەوە، بەمۆتێکەوە ووتی کاتی نان خواردن نییە ئەبێ بڕۆین، جاراستی ئەکرد من هەردوو دەستم بەکەلەبچەوە نانی چی بخۆمو چۆن پێم ئەخورێ، هەرچەند ئەو ئەمەی مەبەست نەبوو یا ئەبێ ئەو بیکات بەدەممەوە، بێگومان من برسیم نەبوو تەنها ئەمویست بیجوڵێنمو بیخەمە قسەو دەرگایەکی لێبکەمەوە، ئەمجار پێم ووت بەڵکو ئوتومبیلێك ڕاگری سواری بینو بمانگەیەنێتە ئیستگەی شەمەندەفەر، ئەمەیانی بەدڵ بوو، یەکسەر ووتی ڕاست ئەکەی یەکسەر

ئوتومبیلێکی راگرتو سواربووین، لەبەرچاوی ئەو هەرچۆنێ بوو کۆمەڵێ پارەم دەرهێناو پارەم دا بە شۆفێرەکە، ئەو بزەی چاوی ئەهاتو لێم ورد ئەبۆوە، کاتێك گەیشتینە جێگە منی لە ژورێك لای سەربازێك دانا و پارەی لێوەرگرتمو چوو دوو بلیتی بڕیو سواری شەمەندەفەری کردم لە قوژبنێکی فارغۆنێکا دوو جێگەی گرتو یەکسەر منی بە کورسیەکەوە بەکەلەبچەکەوە بەستەوەو خۆی لێ‌داو رۆیشت بۆ گەڕان بەناو خەڵکەکەدا، ئەوەندەی نەخایاند گەڕایەوە لام، منیش بەشێنەیی بەخێرهاتنەوەم کردو کەوتمە قسەکردن لەگەڵیداو لێدانەوەی قەوانە کۆنەکە کەمن قوتابیمو سەربازیم تەواوکردوەو دەرئەچمو هیچم لەسەر نی‌یە، باشە تۆ مانگانەت چەندەو چۆن ئەژیت، چەند منداڵت هەیە، پێم ووت من پارەی باشم پێیەو چی ئەوێت ئامادەمو ئەتوانم یارمەتی بدەم، لەگەڵ زۆر قسەی خۆشی کەو پیاهەڵدانی ئەو زەلامە پیسو پۆخڵەو بێمێشکە هەر تۆزێ ئەجولاو ئەو هەموو شتە لەگەڵیدا کەڵکی نەبوو، هەروەکو حیکایەتی مێشی بۆ بکەی وابوو، من رستمو ئەو گوێی لێ‌نەبوو، تا چەند سەعاتێك بەو چەشنە مامەوەو کاتێکی کەمی مابوو شەمەندەفەرەکە بکەوێتەگەڕ خۆش بەختانە چەند هاوڕێیەکی خۆم هاتنە ناو شەمەندەفەرەکەوە، ئەگەڕانەوە بۆ شعیبە وەکو بابا عەلی بەرزنجیو صلاح علیو دوو برادەری هەولێرو کەرکوكو برادەرێکی بەغدادی، یەکسەر هاتنە لای ئێمەوەو جێگەیان گرتو دەستیان کردە ماچ کردنمو دەست لەملانم، چونکە دەمێك بوو یەکترمان نەدیبوو، کەوتنە باسو خواستی سەربازیو تەواوکردنیو لێبوردنی گشتیو بەدەل وەرگرتن. هەندێ رۆژنامەو گۆڤارو خواردنیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو لەگەڵ شتێ لەچەرەسو میوە، کە لە دابەش کردنو خواردنی پاسەوانەکەم سەری سوڕئەما، ئەویشمان وەکو خۆمان سەیر ئەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا هەردەم بەعەرەبی لەگەڵیدا ئەدوانو خزمەتیان ئەکرد، ئەمەش بۆ خۆشەویستی ئەو نەبوو، بەڵکو بۆ رێگە پاك کردنەوە بوو بۆ رووڵێنانی تا یارمەتی من بدات تا وای لێهات نەختێ شل بێتو هاوڕێکانم بیر

لەوە بکاتەوە کاتی ئەوە هاتووە داوای کردنەوەی کەلەبچەکەی لێبکەن، ئەمە بێجگە لە هەڵوێستی ئەو برادەرە عەرەبەمان کە یەکێك بوو لەهاوڕێ خۆشەویستەکانی شعیبەو کوڕێکی خۆش و ڕۆح سوك و هەندێ بزێو بوو ناوی -قاسم عوسمان- بوو پێمان ئەووت (البوحداری)و متصرفی ئەوکاتەی بەغداد خاڵی بوو. یەکیك بوو لەدۆستەکانی نوری سەعیدو وەزیرەکان، خۆشی هاوڕێیەکی تیکۆشەرو رۆشنبیرو ئازاو نەبەرد بوو جێگەی متمانەی حزب بوو لە شعیبە. بە مۆڵەت هاتبوو ئەگەڕایەوە کەوتە خۆپێناسین بە پاسەوانەکەو هەڵدانی ناوو نیشانی خزمو کەس وکاریو خەلکی ناوچەکەیان، تا وای لەکابرا کرد هەر چیەکی داوا لێبکات لە قسەی دەرنەچێت. سەرەرای ئەوەش بەڵێنیدا نامەیەکی بداتێ بۆ خاڵیو ئاگای لێ بێت چی پێویست بێ بۆی جێبەجێ کاتو بەلایەنی کەمەوە بیکەنە دووخەتو جێگەیەکی باشی بۆدابین بکەن. ئەمەیان لەهەموو بەڵێنو بۆچوونەکانی پێشو زیاتر پاسەوانەکەی جوڵانو خستیە هەڵوێستێکی سەرو رەچاو نەکراوەوە بوە ماستی مەیو، سەری بۆ هەموو داواکاریەکان ئەلەقان وای لێهات بتوانرێ کەڵکی لێوەربگیرێ، هەر بۆیە بەزوویی رووی لێنرا کەلەپچەکەم بکاتەوەو خۆی بچێت بە لایەکی کەدا، بەم جۆرە هاتە ژێر بارو لیمان دوورکەوتەوەو چەند دینارێکیشمان خستە گیرفانیەوە، بەم چەشنە ئێمەش کەوتینە هەوای خۆمانو هەریەکە کەوتینە گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆیو گەڕانەوەی بۆ معسکر، تا لەدەنگی هۆڕنی شەمەندەفەرەکە بەئاگاهاتین کە گەیشتۆتە بصرەو ئاگاداری سواربوان ئەکات خۆیان ئامادەکەن بۆ دابەزین، چەند کەڕەتێك بەچەشنێ ئەیبۆڕان کەس نەبوو گوێی لێ نەبێو نەکەوێتە خۆی، ئەمەی لەهەموو وەستانێك دا دووبارە ئەکردەوە، بەلام لە وەستانی کۆتاییدا زۆری ئەخایاند، ئێمەش کەوتینە خۆو هەریەکە بەلایەك دا رۆیشتین، ئەوان بەرەو معسکرو منیش بەرەو بازاڕ، ئەمویست چەند سەعاتێ لە بصرە بمێنمەوەو کەڵك لەو هاتنە ببینمو هەندێ کار بەپێی توانا جێبەجێ بکەمو لەسەرخۆ بگەڕێمەوە معسکر نەوەك لەوێ

ڕێگەی ئەوەم نەدەن دابەزم، چونکە ئەوە پیشەیان بوو، هەندێ برادەریان وا لێکردبوو، بەڵکو دوای دەرچوونیشیان ڕێگەی سەردانی برادەرانیان لێ قەدەغە کردبوون، بۆ هەرکوێ بچوومایە پاسەوانەکەم دوام ئەکەوت، زۆر باش بوو هیچ لەگەڵمدا نەئەکەوتە کێشە وە بەپێچەوانەی ڕۆژانی ڕابوردویەوە، ئەچوومە هەرشوێنێك دوور لێم ئەوەستا نەیئەزانی خەریکی چیم، تەنها ئەوەی مەبەست بوو بحەوێتەوەو سكو ورگی تێربێت، لە بازاڕدا چێشتخانەیەك هەبوو بەناوی (زینل)ەوە هەموو جارێك لەوێ نانمان ئەخواردو دائەنیشتین، ئێمەیان خۆش ئەویست و ڕێزیان لێ ئەگرتین. خاوەن و ئیش کەرەکانی سەربەخۆمان بوون و جێگە متمانەمان بوون، هەردەم خواردنی باشیان بۆ دائەنایین زیاتر لەخەڵکی تر، منیش بۆ نان خواردن رووم‌کردە ئەو چێشتخانەیەو هەر هەموو هاتن بە پیرمانەوە بە وەستاو شاگردەوە کەوتنە ئەملاو ئەولا ماچ کردنم و هەواڵ پرسینی برادەران، خواردنێکی چاکیان بۆ دانایین لەگەڵ چەند میوەیەك، کە ئەوە لە بصرە باو بوو لەگەڵ خواردن میوە دانێن، پاش هەستانیش پارەیان لێوەرنەگرتین چونکە دەمێك بوو نەچووبووینە لایان. دوایی بۆ چا خواردن و هەواڵ پرسینی برادەران رومانکردە چایخانەکەی ئەوبەری زەینەل کە خاوەنەکەی ناوی فالح بوو، ئەویش هەر دۆستێکی نزیکی خۆمان بوو ئاگای لەهەموو شتێکمان و جێگەی یەکتر بینینمان و دانانی کەل‌وپەل و هەموو پێویستیەکانمان بوو، بەوپەڕی دڵسۆزیەوە شتەکانی بۆ ئەپاراستین، لەوێشەوە بەڕێ ئەکەوتین بەرەو معسکر، بەکۆمەڵ سواری ئوتومبیل ئەبووین، ئەویش بەهەمان شێوەی زینەل کەوتە خزمەتمان و لەگەڵ چاخواردنەوەدا کەوتینە گفت‌وگۆ کردن و گێڕانەوەی دەنگ و باس بۆ یەکتر، لەوکاتەدا پێم ووت با ئەم برایە لێرە بێت من سەرێك لەماڵی خزمێکم ئەدەم، بەبێ چەندوچون تێگەیشت و هاتەدەست و وتی ئەمیش هەر برامانەو لەسەر چاوانە، پاسەوانەکەی خستە هەڵوێستێکی ئەوتۆوە یەکسەر ڕێگەی دام بڕۆم، هیچی نەوت و تەگەرەی نەخستە ڕێم، ئەوێم بەجێهێشت و بەرەو رووی ماڵی

(فرج بطرس) بوومەوە، باوك‌و دایك‌و خوشك‌و براكانی پێشوازیان لێ‌کردم‌و بوومە میوانێکی ئازیزیان، ئەوەندەی پێ‌نەچوو ناردیان بەشوێن فرج دا لە دووکان ئیشی ئەکرد، هاتەوەو دەستمان کردە ماچ کردن‌و دەست لەملی یەکترو زۆری پێ‌خۆش بوو منی دوای ئەو لێك دابڕانە دوورو درێژە بینیەوە، ئەم هاوڕێ‌یە دیان بوو تا بڵێ‌ی کوڕێکی ئازاو لێهاتوو شیوعیەکی دڵسۆزو گوێ ڕایەڵ‌و ئیش کەرێکی بێ‌هاوتا بوو، ئەرکی زوربەی هاوڕێ‌یانی لەسەر شان بوو لە معسکرو دەرەوەش دا. هەرچی ئیشی ئاوو کارەباو فیتەری معسکر هەبوایە ئەم هەڵی ئەسوڕان، لەبەر ئەوە خۆشەویستی ئەفسەرەکانیش بوو، ماڵەکەی ماڵی حزب‌و جێگەی حەوانەوەو کۆبونەوەمان بوو، پێش ڕاپێچ کردن بۆ سەربازی قوتابی دواناوەندی شەو ئەبێ‌و بە ڕۆژ فیتەر، خۆشەویستی هاوڕێ‌یان‌و ناوچەکەیان بوو، بەمەرجێ لای ئێمەش بەم ڕەنگە سەیری ئەکرا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زیقاوڵەیەکی سەیر بوو بەهیچ جۆرێ تاقەتی لە قسەکردن‌و مناقەشە نەئەچوو لەهەموو شتێکی گەورەو بچووك هەڵی‌ئەدایەو قسەی ئەکردو وازی نەئەهێنا، هەندێ جاریش ئەبووە جێگەی نارەزایی هاوڕێ‌یان‌و سەرزەنشت کردنی، زۆرجار ئەم کارانەی بەرەو رووی من ئەبۆوەو ئەهاتم بەسەریاو نەختێ چاك ئەبوو.

لەگەڵ هاوڕێ فەرەج دا چووینە دەرەوە بۆبینینی هاوڕێ‌یان کە لە گەڕەکێکی دوور لە ماڵێکی حزبدا بوون، هاوڕێ حناو هاوڕێ عبدالوهاب طاهر مان بینی‌و لەگەڵیاندا دانیشتین بەدوور ودرێژی قسەمان لەسەر هەموو شت کرد، ڕێك‌وپێکی پەیوەندی لەگەڵ برادەرانی معسکەردا کە نەختێ توشی سستی بوو بو بەهۆی نەبوونی لیژنەیەکی تایبەتی‌یەوە. کە هەموو ئیشەکانیان بەشێوەیەکی تاکی‌و لابەلا ئەچوو بەڕێوەو یەك دوو برادەریان ئەبینی‌و کارێکی بچوکیان جێ‌بەجێ ئەکرد کە جێگەی هیچی بۆ نەئەگرتن، من بەڵێنم دا بەپێ‌ی توانا گەر کات یارمەتی‌دام شتێکیان بۆ دروست بکەم لەگەڕانەوەمدا بۆ معسکر، بەڵام ئەوەیان ئەزانی کە ژمارەی سەربازەکان کەم

بۆتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانەی هاتون تازەن ئەبێ نەختێ وردکاری تیادا بکرێ لە بەستنی پەیوەندی لەگەڵیان دا. پاش یەك دوو سەعات گەڕامەوە چایخانەکە لای پاسەوانەکەم، چۆنم بەجێ هێشتبوو هەروا لای فالح دانیشتبوو وادیار بوو بەچاخواردنەوەو قسەکردنەوە خەریکی کردبوو منی هەر لەبیر نەمابوو، بەبینینم نەختێ گەشایەوەو بەپێکەنینێکی پڕمەعناوە بەدەنگێکی نزم هاواری کرد ئەوە لەکوێیت زۆر دواکەوتوین ئەبوایە ئێستا لە معسکر بووینایە. منیش لەسەرخۆو بەهێمنی پێم ووت هێشتا کاتمان زۆر لەبەردەمدایە بۆ ئێوارە ئەڕۆینەوە، هاوڕێ فەرەج هەموو شتێکی معسکری پێ ڕاگەیاندم کە چۆن دوای ئێمە بۆ ڕۆژی جەژن معسکر یەك کەسی تیا نەمایەوە ئەوەی مۆڵەتی وەرگرت ڕۆیشتەوەو نەهاتەوەو هەندێکیش ڕای کرد، پاش چەند ڕۆژێك هەرقاوشەی چەند سەربازێکی بۆ هاتەوە کە هەمووی ٢٠ سەرباز ئەبوون، ژمارەی ئەفسەرەکان و سەربازەکانی ئەوان زیاتر ئەبوون، تاهاتنی یەك دو وەجبەی تازە ژمارەی سەربازەکانی خۆمان بەرەو زۆر بوون ئەرۆیشت، جا من ئەم شتانەو زۆر شتی کەم بەم چەشنە نەئەزانی، برادەرانی ڕێکەش ئەمانەیان بەم شێوەیە بۆ باس نەئەکرد بۆم، یاخود نەیان ئەزانی چونکە ئەوانیش تازە ئەگەڕانەوە.

لەبصرە چەندماڵێکی برادەرانمان هەبوون کە هەردەم سەردانمان ئەکردن و لەوێ نانمان ئەخواردو ئەحەواینەوە، زوربەی کارەکانمان لەو ماڵانە رائەپەڕان، وەکو ماڵی غازی معارج و صالح احمدو حافظ رەسەن و غازی معراج و ابوشهاب لە ابوخصیب، بەڵام لەبەر کەمی کات سەردانی هیچ کامیانم پێ نەئەکرا کە بەدیداریان شادبم، زۆر حەزم ئەکرد بیان بینم، بۆیە ئەم سەردانەم دانا بۆ دوای دەرچوونم.

ئێوارەیەکی درەنگ پاش گەڕانێکی کەم بەناو بازاڕی بصرەداو کڕینی هەندێ خواردن و پێویستی بۆ معسکر. خۆم و پاسەوانەکەم بەڕێ کەوتین بەرەو شعیبە، من وام ئەزانی بەگەیشتنم ئەخرێمە بەندیخانەو لێکۆڵینەوەیەکی باشم

لەگەڵدا ئەکرێت و ئەمدەنە دادگا و تا چەند رۆژێك ئەمهێڵنەوە و ئازارم ئەدەن و حەقی بەردەوام لێئەکەنەوە. بەپێچەوانەی برادەرەکانی کەمەوە کە هەندێکیان زۆر بە زوویی ئیشەکەیان بۆ سازکرابوو، هەرچەندە ئازاری باشی هەندێکیشیان دابوون و زۆر لەدەرچوون دواکەوتبوون و بەهەرجۆرێك بیانویان پێگرتبوون کە گوایە متخلفن یا دادگایی ئەکراون ئەبێ بچن بۆ دیوانیە، کە دادگای گشتی سەربازی لەوێ بوو، کاتی خۆی من و حسین مەلا حکیم و عەبدولی سۆران و جەلالی برامیان بەهێزێکی زۆرەوە بە دەست بەستراوی بردینیان بۆ بەردەمی ئەو دادگایە کە گوایە متخلفن و بەپارەیەکی زۆر حوکم دران، هەرزوو پارەیان داو وەصڵیان وەرگت، هەر لەگەڵ ئەو بڕو بیانوانەدا داوای شتە ون بوەکانیان لێکردبوون کە ئەبێت بیهێننەوە و رێگەی ئەوەشیان لێگرتبوون بچنە بازاڕ بیکڕن و بۆیان بگێڕنەوە، ئەمەیان ئە هەوەسی خۆیان دروست ئەکردو ئەیان سەپاند بەسەریان دا، بۆ هەرکەسێك بیان ویستایە ئازاری بدەن، جا منیش لەبەر ئەوەی ئەفسەرەکان ئەیانزانی چیم و کێم و کونیەکەم لایان بوو لە سلێمانیەوە هەموو شتێکیان بە پوختی بۆ نوسیبون هەرچەندە لەوێ برادەران ئەیانپاراستم و جموجۆڵی ئەوێم کەم بوو بەڵام ئەیانزانی زۆرشت لەژێر سەری مندایە بۆیە کێشەیەکی گەورەم بۆ خۆم دانابوو کە توشم بێت لەگەڵیانا. ئەمانەم هەموو خستبوە بیرو هۆشی خۆمەوە و ئامادەیی باشم بۆ خۆم وەرگرتبوو، بەڵام کە بۆ شەو گەیشتمە معسکر هەموو شتێ بە پێچەوانەی بۆچونەکانی منەوە بوو، کە زۆر بەهێمنی چوینە بەردەم جمعەی کاتب هەرخۆی لەوێ بوو کتابەکەی وەرگرت و بەشێنەیی پاسەوانەکەمی دەست پێوەنا و ئەو رۆی، کاتێکی باش لای خۆی مامەوە نەیئەزانی چیم لێبکات، باشتر ئەوەبوو رەوانەی ناو قاوشم کات لای برادەران تا رۆژ ئەبێتەوە، ئەو معسکرە گەورەیە لە قاوشێ زیاتر کەسی تیادانەبوو ئەویش ٢٠-٣٠ سەربازی لە خۆی گرتبوو بە پێچەوانەی ئەوەشەوە رۆژانی پێشوو پتر لە ٤٠٠ - ٥٠٠ سەربازی لێبوو. شەو لە قاوش لای برادەران مامەوە. زوربەیان ناسیاوی خۆم بوون و کۆن لەگەڵمدا بوون، یا تازە هاتبوون.

ئەمانەش هەر لەدەرەوە پەیوەندیم لەگەڵیان هەبوو خزمەتێکی باشیان کردمو جێگەی تایبەتیان بۆ دانام چونکە خۆم هیچم پێنەبوو، هەر بەو شەوە تا درەنگ بەیەکەوە دانیشتین لەزۆر شت گەیشتمو زۆر شتیان بۆ باس کردم. کە ئەمانە راستە هێشتا نەیانتوانیوە پەیوەندی لەگەڵ دەرەوەدا ببەستن. لای خۆشیان رێكوپێکیەکی ئەوتۆنی‌یە شایانی باس کردن بێت. زیاتر لەبەر ئەوەی هەموو خۆیان بەهاتووی کاتی ئەزانی دەرئەچن. کە خۆی لەخۆی‌دا زیاتر نەبوونی کارێکی پێشکەوتوی حزب بوو لەوێ بەو سەردەمەدا کە بتوانێ بەو ئیشە هەستێو ئەو کارە بخاتە سەرشانی خۆی، هەرچەندە وەکو زانیم دوایی هاورێیانی باشی پێشکەوتوی حزبی لەخۆی گرتبوو کە لە هەموو کونجێکی عێراقەوە برادەرانیان ئەنارد بۆ شعیبە گەر قوتابیش نەبوایە، ئەمە بوبوە بڕیارێکی سەرەوەی رژێمی عیراق. ئەو بەیانیە هاورێ قاسم عوسمان ئیشەکەی شتێکی لێ جێبەجێ کرابوو چاوەرێی رۆژی دوایی ئەکرد، هیچ گیروگرفتێکیان بۆ دروست نەکرد، کارەکەی تەواوبوو. بەڵام بڕیاری دا چاوەرێی من بکات. ئیشەکەی منیش جمعە هەموو ئەوراقەکانی بۆ ئامادە کردم، پاش ئەم تویێو ئەو تویێ کردنی هەر ئەوەی مابوو بیبەینە بەردەم ئەفسەری لێپرسراو. خۆم بەدەستی خۆم بردمە لای بۆ ئەوەی دوانەکەوێ، ئەفسەرێکی نوێ بوو من نەمئەناسی یەك دوو مانگێك بوو هاتبووە ئەوێ وەکو ئەیان ووت پیاوێکی بێدەنگی لەسەر خۆ بوو لەگەڵ برادەران دا باش بووە کە بەراستی سەربازێکی تەواو بووە، ئەوەندەی نەختێ لە یاسا لای نەئەدا، بەشێنەیی هەموو ئیشەکانی منیشی راپەراند، بەڵام پێش تەواو بوونی پێی راگەیاندم کە جلەکانمو پۆستاڵەکەمو قەرەوێڵەو پەتو هەندێ شتی تر ئەبێت پارە دابنێم لەباتی یان بچمە بەندیخانەوە لەباتی پارەکە منیش گیرفانم پڕبوو ووتم باشە شتەکانم بۆ بشکێنەوە بەپارە، لەوێش سەری خۆم قەبڵانو وەصڵی پارەکەیان خستە فایلەکەوە، هەموو شت تەواو بوو بەڵام ئامر سریە لەوێ نەبوو، دوای یەك دوو رۆژ گەڕایەوە بێئەویش نەئەبوو دەرچیت، ئەبێ ئەو دەفتەرەکەی بۆ ئیمزا بکات بڕیاری رۆیشتنی بدات، ئەو کاتە ئامر سریە داود

سمعان بوو باشی ئەناسیم وەکو باسم کرد پیاوێکی چاكو لەسەرخۆ بوو تۆزێ خزمایەتی لەگەڵ هەندێ ماڵی دیانەکانی سلێمانیدا هەبوو لەوەوە ئێمەی زیاتر ئەویستو ڕێزی لێ ئەگرتین. بەناچاری ئەو شەوانە مامەوە لای برادەرانو ئاهەنگێکی بچوکیان گێڕا کە بەهیچ جۆرێ شانی لەشانی ئاهەنگەکانی پێشوو نەئەدا. کاتێ داود سمعان هاتەوە لەگەڵ جمعەو هەموو ئەوراقەکاندا خۆم چومە لایو بەڕێزەوە بەخێرهاتنی کردمو دەستی کردە پێکەنینو چاكو چۆنیەکی گەرم لەگەڵم داو هەواڵ پرسینی برادەرانو دۆستانی خۆیو دەفتەرەکەی بۆ ئیمزاکردمو دوعاخوازیمان کرد لەیەکتر. ئەو دوو شەوەی مامەوە وەکو میوانێك جلی سەربازیم نەبوو بەیانیان بەکەیفی خۆم هەڵئەسام لەخەو، وەرزشو تدریبم نەبوو، هەرچەندە دابەزینم لێقەدەغە نەکرابوو، بەڵام خۆم هەوڵی ئەوەم نەئەدا چونکە هەموو کارێکم بۆ کاتی دەرچوونم دانابوو. هەر ئەو ڕۆژەی دەفتەرەکەم وەرگرتەوە خۆمو هەموو برادەرانی ئەوێم بینیو ماڵ ئاوایم لێ کردن، برادەرانی سلێمانی هەر هەموویان نامەیان بۆ کەسو کاریان دامیو بەدەمیش هەندێ شتیان پێڕاگەیاندم لەسەردانی ماڵە'کانیان دا پێیان بگەیەنم، ئێمە چوار برادەر بووین ئەو ڕۆژە ئیشەکانمان تەواو بوو بەیەکەوە بەرەو بصره هاتین، لەوانە قاسم عثمان بوو کە لەسەرم وەستابوو ئەیویست بەرەو بەغدا بەیەکەوە بڕۆین، بەدابەزینمان برادەرانی کەمان لێجیابونەوە بۆ سماوەو عمارە بەڕێ کەوتن، منو قاسم یش بەرەو ئوتێلو بڕیار بوو ئەو شەوە بمێنینەوە، دوای نان خواردن پێشەکی سەری ماڵی حافظ رەسەن مان دا بۆ کاتێکی کەم لەگەڵ دایكو باوكو خوشکەکانیدا دانیشتین کە بەراستی نمونەی ڕێزو خۆشەویستی ئێمە بوونو ڕۆژانی پێشومان ئەهاتەوە بیر کە بەهەموو توانایانەوە یارمەتیان ئەدایـنو وەکو کوڕی خۆیان سەیریان ئەکردین، هاوڕێ حافظ لەوێ نەبوو وەکو وتیان قاچەکانی ئازاری هەبووە چوە بۆ نەخۆش خانە کە چەند گولەیەك پێکابووی کاتی خۆپیشاندانی قوتابیانی بصره، لەسەربازیدا چارنەکراو کاتێکی زۆر بەو ئازارەوە مایەوە، ئەو ڕۆژە نەماندی بەداخەوە زۆر چاوەڕێمان نەکرد کە

لەوساوە نەمان دیوە، وتیان هاورێکانی خۆی لەقەرەداغ گولەبارانیان کرد گوایە خیانەتی لێکردوون، هەر بەو کاتە کەمە دیسان سەری مالی -فرج بطرس-م دایەوە لەگەڵ مالی هەردوو غازی، شەوو رۆژێك لە بصرە ماینەوەو بۆ شەو سواری شەمەندەفەر بووین بەرەو بەغداو ئەو شەوەمان هەرچۆنێ بوو بردەسەرو بەیانی زوو گەیشتینە بەغدا، قاسم نەیهێشت بچم بەهیچ لایەکداو چووینە مالی ئەوان. دایکی کە یەکێك بوو لە شاژنەکانی ئەو کاتە خاوەن هەڵوێستێکی باش و لێهاتوو بوو هەموو هاورێکانی قاسمی وەکو کوری خۆی ئەویست کەوتە خزمەت کردنمان و ئامادەکردنی خواردنی نیوەرۆو باشترین خواردنی بۆ دروست کردین و خۆشی لەگەڵماندا دانیشت و کەوتە گفت وگۆ کردن و باس و خواستی دنیا، هەر ئەو کاتە هەواڵی ئەو پاسەوانە نەگریسەمان پرسی کە لەگەڵماندا بوو بۆ بصرەو نامەمان دایە بۆ خاڵی قاسم ئیشی بۆ جێبەجێ بکات، ووتی هیچم نەدیوەو نەهاتووە، ئەمەمان پێخۆش بوو کە ئەوانمان نەخستۆتە زەحمەتەوە. بۆ ئێوارە لە چونە دەرەوەمان دا زۆر لە برادەرانی شعیبەمان دی وەکو ضیاء عگیلی و کریم مجید و خزعل الوسی و عبد علی هادی و جواد کرم و هەندێکی کە، کە هەریەکەی لەجێگەیەك و بەبێ گەران بەدوایان دا، بەلام بۆ بینینی ئەدوارد کە یەکێك بوو لە دیانەکانی سلێمانی و برادەری خۆشمان بوو چووینە جێگەی ئیشەکەی لە بتاوین کە داود سمعان بۆی هەڵدابووین، بینیمان و ناوەکەی ئەومان پێگەیاندو نەختێ باسی شعیبەمان بۆ کردو ستایشی خزمەتەکەیمان کرد، زۆری پێخۆش بوو هیچ ئەملاو ئەولام نەکردو هەولی بینینی هاورێیانی ترم نەدا، چونکە هیچ کارێکم پێیان نەبوو بە پێویستیشم نەئەزانی! زیاتر لەبەر ئەوەش بوو نەختێ سەربەستی خۆم وەرگرم. ئەوەبوو بۆ شەو نەچومە مالی قاسم و خۆم لێجیاکردەوە، دوای دوعاخوازی لێی ئەو شەوە بەمەرامی خۆم لەبەغدا گەرام و زۆر جێگەی گشتیم بەسەر کردەوەو تا درەنگ گەرامەوە ئوتێل و بۆ بەیانی زوو بەرەو سلێمانی بەرێ کەوتم و گەرامەوە مالەوە. بۆ پاشس رۆژێك دەفتەرەکەم برد بۆ تجنید، ئەفسەری لێپرسراو کە ئەوسا محمد علی اربیلی بوو تازە

هاتبوە سلێمانی پیاوێکی خراپ نەبوو ئیشی بەردەستی زوو رایی ئەکرد، هەر خۆم دەفتەرەکەم بردە بەردەمی و بۆی ئیمزاکردم. ئیتر بێ‌ئەوەی هیچ شتێکم پێ‌بڵێ یا داوای شتێکم لێ بکات چونکە من وام دانابوو بە نوسراوێکەوە رەوانەی ئەمنم بکات تا بزانێ هاتومەتەوە، لەکاتی هاتنە دەرەوەمدا لە شەقامی کانێسکان کە تجنید لەوێ بوو هەناسەیەکی دوورو درێژم هەڵکێشاو ئەوسا ئەمتوانی بڵێم لەسەربازی رزگارم بووە کە رۆژی ١٩٥٥/٩/٢٩ بوو.

ئەو سەردەمە ماڵمان لە گەڕەگی شێخان بوو لای مزگەوتی بن تەبەق بەکرێ تیادانیشتبووین خانوەکەی خۆمان لەسەر شەقام لەلایەن رژێمەوە داگیرکرابوو کردبویان بە پۆلیس خانە، من بەهاتنەوەم وەکو بڕیارم دابوو کاتێکی باش بحەوێمەوەو لەماڵ نەیەمە دەرێ بۆ ئیشی پێویست نەبێ ئەویش زۆر بە نهێنی، هەرچەندە خزمو کەس‌و کارو دۆست‌و ناسیاوو برادەران ئەهاتن بۆ لام‌و بەسەریان ئەکردمەوە بەمەرجێ چەند رۆژێ بڕیارم دا بچمە دەرەوە، بەلام زۆر بە شێنەیی‌و لەسەرخۆ کە دیسان نەکەومەوە بۆسەی پۆلیس، برادەرانیش بەمە قایل بوون‌و زۆر ئاگاداریان ئەکردم، کە جارێ ئیشم نەدرێتێ‌و بەنهێنی لەگەڵم بجوڵێنەوە، هەرچەندە ئەو کاتە سلێمانی نەختێ هێمن‌و بێ‌دەنگ بوو، ئەوەندە گوشار لەسەر جوڵانەوەی نیشتمانی نەبوو. پاش مۆڵەتێکی باش سەرلەنوێ کەوتمەوە کۆڕی تێکۆشان‌و لەگەڵ برادەراندا یەکمان گرتەوەو ئیشی نوێیان بۆ دابین کردم کە جێگەی شەرعی خۆم بوو لە لیژنەی ناوچەدا سەرلەنوێ بومەوە بە ئەندام، بەلام پاش مانگێك ئەمن زانی گەڕاومەتەوە بانگی کردم‌و هەندێ گوشاریان خستە سەرم‌و پێیان راگەیاندم کە ئەبێت کەفیلێك خاوەن پارە بێت یا خانوبەرە بێتە کەفیلم‌و جم‌وجۆڵی سیاسیم نەبێت‌و دوورکەومەوە لەئیشی حزبایەتی، هەر بۆیە مامە مستەفام هاتو بووە کەفیلم‌و نەیهێشت بم گرن.

**سوپاس بۆ منداڵەکانم...**

**کە ئەرکی بە چاپ گەیاندنی بەرگی یەکەمی**

**بیرەوەرییەکانمیان خستە ئەستۆی خۆیان.**

**قادر میرزا کریم**